
ڕاڤەی
عقيدة الرازيين
أصل السنة واعتقاد الدين
لەگەڵیدا
عقيدة أبي حاتم الرازي
لە بیروباوەڕی سەلەفدا
ڕاڤەکردنی
مەبەست کاژاوی
کتێبخانەی ڕێکار

# ڕاڤەی

# عَقِيدَةُ الرَّازِيَيْن

## أَصْلُ السُّنَّةِ وَاعْتِقَادُ الدِّين



**كتێبخانەی ڕێكار**

**ناونیشان : هەولێر - فلكەی شێخ محمود -**
**باڵەخانەی سەید بهاء الدین - نهۆمی خوارەوە**

**ژ.م ٠٧٥٠ ٤٧٥ ٥٧٦٧**

## ناسنامەی كتێب

ناوی پەرتووك : ڕاڤەی "عَقِيْدَةُ الرَّازِيَّيْنْ"

ڕاڤەكردنی : مەبەست كاژاوی

هەڵەچنین: عەبدوڵڵا عەلی موحەممەد

نەخشەسازی بەرگ: إخلاص دیزاین

نەخشەسازی ناوەڕۆك: جمعە صدیق كاكە

تیراژ : ١٠٠٠ دانە.

سایز : ١٧*٢٤

لاپەڕە : ٣٥٧ لاپەڕە

نۆرە و ساڵی چاپ : یەكەم، ١٤٤٥ كۆچی- ٢٠٢٣ میلادی.

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان**
**ژمارە « ٩٠١ »ـی ساڵی «٢٠٢٣»ی پێ دراوە.**



# ڕاڤەی

# عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ

## أَصْلُ السُّنَّةِ وَاعْتِقَادُ الدِّينِ

لەگەڵیدا

## "عَقِيْدَةُ أبي حاتِم الرَّازي"

لە بیروباوەڕی سەلەفدا

ڕاڤەکردنی

مەبەست کاژاوی

# (عَقِيْدَةُ الرَّازِيَّيْنِ: أَصلُ السُّنَّةِ، وَاعتِقَادُ الدِّين)

قَالَ: أَبُو مُحَمَّدٍ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي حَاتِمٍ:

سَأَلْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ عَنْ مَذَاهِبِ أَهْلِ السُّنَّةِ فِي أُصُولِ الدِّينِ؟ وَمَا أَدْرَكَا عَلَيْهِ الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ؛ وَمَا يَعْتَقِدَانِ مِنْ ذَلِكَ؟

فَقَالَا:

أَدْرَكْنَا الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ: حِجَازًا، وَعِرَاقًا، ومصرَ، وَشَامًا، وَيَمَنًا، فَكَانَ مِنْ مَذْهَبِهِمْ:

١- الْإِيمَانُ: قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.

٢- وَالْقُرْآنُ: كَلَامُ اللهِ غَيْرُ مَخْلُوقٍ بِجَمِيعِ جِهَاتِهِ.

٣- وَالْقَدَرُ خَيْرُهُ وَشَرُّهُ: مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

٤- وَخَيْرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا [عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ]: أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، ثُمَّ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، ثُمَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ. وَهُمُ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ الْمَهْدِيُّونَ ﷺ.

٥- وَأَنَّ الْعَشَرَةَ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَشَهِدَ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ: عَلَى مَا شَهِدَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَوْلُهُ الْحَقُّ.

٦- وَالتَّرَحُّمُ عَلَى جَمِيعِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وعلى آلهِ، وَالْكَفُّ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَهُمْ.

٧- وَأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ؛ كَمَا وَصَفَ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ، وَعَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِلَا كَيْفٍ. أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا؛ {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ} [الشورى: ١١].

٨- وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُرَى فِي الْآخِرَةِ، يَرَاهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ بِأَبْصَارِهِمْ. وَيَسْمَعُونَ كَلَامَهُ؛ كَيْفَ شَاءَ، وَكَمَا شَاءَ.

٩- وَالْجَنَّةُ [حَقٌّ]، وَالنَّارُ حَقٌّ؛ وَهُمَا مَخْلُوقَانِ، لَا يَفْنَيَانِ أَبَدًا. وَالْجَنَّةُ ثَوَابٌ لِأَوْلِيَائِهِ، وَالنَّارُ عِقَابٌ لِأَهْلِ مَعْصِيَتِهِ، إِلَّا مَنْ رَحِمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ.

١٠- وَالصِّرَاطُ حَقٌّ.

١١- وَالْمِيزَانُ حَقٌّ، لَهُ كِفَّتَانِ، تُوزَنُ فِيهِ أَعْمَالُ الْعِبَادِ حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا حَقٌّ.

١٢- وَالْحَوْضُ الْمُكْرَمُ بِهِ نَبِيُّنَا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَقٌّ.

١٣- وَالشَّفَاعَةُ حَقٌّ.

١٤- وَأَنَّ نَاسَاً مِنْ أَهْلِ التَّوحِيدِ يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ بِالشَّفَاعَةِ حَقٌّ.

١٥- وَعَذَابُ القَبْرِ حَقٌّ.

١٦- وَمُنكَرٌ وَنَكِيرٌ حَقٌّ.

١٧- وَالكِرَامُ الكَاتِبُونَ حَقٌّ.

١٨- وَالْبَعْثُ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ حَقٌّ.

١٩- وَأَهْلُ الْكَبَائِرِ فِي مَشِيئَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

٢٠- وَلَا نُكَفِّرُ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِذُنُوبِهِمْ، وَنَكِلُ أَسْرَارَهُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

٢١- وَنُقِيمُ فَرْضَ الْجِهَادِ وَالْحَجِّ مَعَ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، فِي كُلِّ دَهْرٍ وَزَمَانٍ.

٢٢- وَلَا نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى الْأَئِمَّةِ، وَلَا الْقِتَالَ فِي الْفِتْنَةِ، وَنَسْمَعُ وَنُطِيعُ لِمَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمْرَنَا، وَلَا نَنْزِعُ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ.

٢٣- وَنَتَّبِعُ السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ، وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلَافَ وَالْفُرْقَةَ.

٢٤- وَأَنَّ الْجِهَادَ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، مَعَ أُولِي الْأَمْرِ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ؛ لَا يُبْطِلُهُ شَيْءٌ.

٢٥- وَالْحَجُّ كَذَلِكَ.

٢٦- وَدَفْعُ الصَّدَقَاتِ مِنَ السَّوَائِمِ إِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ.

٢٧- وَالنَّاسُ مُؤَمَّنُونَ فِي أَحْكَامِهِمْ وَمَوَارِيثِهِمْ، وَلَا نَدْرِي مَا هُمْ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

أ- فَمَنْ قَالَ: (إِنَّهُ مُؤْمِنٌ حَقًّا)؛ فَهُوَ مُبْتَدِعٌ.

ب- وَمَنْ قَالَ: (هُوَ مُؤْمِنٌ عِنْدَ اللَّهِ)؛ فَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ.

ت- وَمَنْ قَالَ: (هُوَ مُؤْمِنٌ بِاللَّهِ حَقًّا)؛ فَهُوَ مُصِيبٌ.

٢٨- وَالْمُرْجِئَةُ مُبْتَدِعَةٌ ضُلَّالٌ.

٢٩- وَالْقَدَرِيَّةُ مُبْتَدِعَةٌ ضُلَّالٌ.

٣٠- فَمَنْ أَنْكَرَ مِنْهُمْ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَعْلَمُ مَا لَمْ يَكُنْ قَبْلَ أَنْ يَكُونَ؛ فَهُوَ كَافِرٌ.

٣١- وَأَنَّ الْجَهْمِيَّةَ كُفَّارٌ.

٣٢- وَأَنَّ الرَّافِضَةَ رَفَضُوا الْإِسْلَامَ.

٣٣- وَالْخَوَارِجَ مُرَّاقٌ.

٣٤- وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ الْقُرْآنَ مَخْلُوقٌ، فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ.

٣٥- وَمَنْ شَكَّ فِي كُفْرِهِ مِمَّنْ يَفْهَمُ؛ فَهُوَ كَافِرٌ.

٣٦- وَمَنْ شَكَّ فِي كَلَامِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَوَقَفَ شَاكًّا فِيهِ، يَقُولُ: لَا أَدْرِي مَخْلُوقٌ أَوْ غَيْرُ مَخْلُوقٍ؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.

٣٧- وَمَنْ وَقَفَ فِي الْقُرْآنِ جَاهِلًا، عُلِّمَ وَبُدِّعَ وَلَمْ يُكَفَّرْ.

٣٨- وَمَنْ قَالَ: (لَفْظِي بِالْقُرْآنِ مَخْلُوقٌ)؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ، أَوِ قَالَ: (الْقُرْآنُ بِلَفْظِي مَخْلُوقٌ)؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ:

٣٩- وَعَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ: الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ.

٤٠- وَعَلَامَةُ الزَّنَادِقَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ: (حَشْوِيَّة)؛ يُرِيدُونَ إِبْطَالَ الْآثَارِ.

٤١- وَعَلَامَةُ الْجَهْمِيَّةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ: (مُشَبِّهَة).

٤٢- وَعَلَامَةُ الْقَدَرِيَّةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ الْأَثَرِ: (مُجبِرَة).

٤٣- وَعَلَامَةُ الْمُرْجِئَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ: (مُخَالِفَةً وَنُقْصَانِيَّة).

٤٤- وَعَلَامَةُ الرَّافِضَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ: (نَاصِبَة).

وَلَا يَلْحَقُ أَهْلَ السُّنَّةِ إِلَّا اسْمٌ وَاحِدٌ، وَيَسْتَحِيلُ أَنْ تَجْمَعَهُمْ هَذِهِ الْأَسْمَاءُ.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَمِعْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ:

٤٥- يَأْمُرَانِ بِهِجْرَانِ أَهْلِ الزَّيْغِ وَالْبِدَعِ، يُغَلِّظَانِ فِي ذَلِكَ أَشَدَّ التَّغْلِيظِ.

٤٦- وَيُنْكِرَانِ وَضْعَ الْكُتُبِ بِرَأْيٍ فِي غَيْرِ آثَارٍ.

٤٧- وَيَنْهَيَانِ عَنْ مُجَالَسَةِ أَهْلِ الْكَلَامِ.

٤٨- وَالنَّظَرِ فِي كُتُبِ الْمُتَكَلِّمِينَ، وَيَقُولَانِ: لَا يُفْلِحُ صَاحِبُ كَلَامٍ أَبَدًا.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَبِهِ أَقُولُ أَنَا.

وَقَالَ أَبُو عَلِيِّ بْنُ حُبَيْشٍ الْمُقْرِئُ: وَبِهِ أَقُولُ.

قَالَ شَيْخُنَا ابْنُ الْمُظَفَّرِ: وَبِهِ أَقُولُ.

وَقَالَ شَيْخُنَا يَعْنِي الْمُصَنِّفَ: وَبِهِ أَقُولُ.

وَقَالَ الطُّرَيْثِيثِيُّ: وَبِهِ أَقُولُ.

وَقَالَ شَيْخُنَا السَّلَفِيُّ: وَبِهِ نَقُولُ.



# پێشەکی

بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمِ، الحَمدُلله رَبِّ العَالَمِينَ، وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى أَشرَفِ الأَنبِياءِ وَالمُرسَلِينَ، نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحبِهِ أَجمَعِين.

اللَّهُمَّ أَرِنَا الحَقَّ حَقّاً وَارزُقنَا إِتِّبَاعَهُ، وَأَرِنَا البَاطِلَ بَاطِلاً وَارزُقنَا إِجتِنَابَهُ.

خۆشەویستەکانم! ئاشکرایە کە لەم سەردەمی پڕ لە غورپبەتی ئیسلام و سوننەتەدا، لەگەڵ شەپۆلی گێژاوەکانی جۆرەها فیکر و ڕێچکە و ڕێگەی لاڕێ بوو لەم ئیسلامەدا، لەم سەردەمەی کە دەبینین بەتاڵەکان لە بیروباوەڕدا، بەسەر حەقدا زاڵ بوون، لە پێناو تێگەشتن و پێگەشتن لە بیروباوەڕی سەلەف، -پاکترینی ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ- دەمانەوێت تێبگەین و پێبگەین، ئەم مەنهەجە هەم مەنهەجییەتمان بێ و هەم مەرجەعییەتمان، با بگەڕێینەوە بۆ ئەو بیروباوەڕ و دینداری و عەقیدەیەی، کە ئەووەڵینی پاکی ئوممەتی لەسەر بوون.

ئاشکرایە کە گرنگێتی گەڕانەوە بۆ عەقیدەی سەلەف لە دینی ئێمەدا داواکراوە، کە دەڵێین: سەلەف، واتە ئەو دین وبیروباوەڕە حەقەی، کە هاوەڵانی لەسەر بوون ﷺ، وە تابیعین و ئەتباعی تابیعینیشی لەسەر بوون -رَحِمَهُمُ الله-.

ﷲ دەربارەی واجبێتی شوێنکەوتنمان بۆ ئەو سەلەفی ساڵحە دەفەرمووێت:

١- (وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا)[١]. واتە: ئەوانەی کە بێگوێیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و، لە ڕاستە شەقامەکە لادەدەن، دوای ئەوەی ڕوونکردنەوەی حەقیان پێگەیشتووە و دەزانن حەق کامەیە، وە شوێن جگە لە ڕێگەی ئیمانداران دەکەون، ڕووی وەردەگێڕین بۆ ئەو ڕێبازەی کە هەڵیبژاردووە و، دەیخەینە دۆزەخەوە، ئای چ پاشەڕۆژێکی خراپە!

جا لێرەدا (سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ) وەک ئەوەی لە سەلەفەوە تەفسیرکراوە، بریتییە لە: ڕێگەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ؛ چونکە یەکەمین کەسانێک بوون کە خیتابیان لەگەڵ کراوە.

٢- وە پەروەردگار دەربارەیان دەفەرمووێت: (لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ). واتە: بەدڵنیاییەوە، ﷲ تعالى منەتی نا بەسەر باوەڕدارانەوە کە: (إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ)[٢]. واتە: کاتێک کە لەناویاندا پێغەمبەر و نێردراوێکی لەخۆیان ڕەوانەکرد، کە بەڵگەکانی

(١) النساء: ١١٥.
(٢) آل عمران: ١٦٤.

دەخوێنێتەوە بەسەریاندا و، پاکو خاوێنیان دەکاتەوە، وە قورئان و فەرموودەیان فێردەکات، ئەگەرچی ئەوان لەپێشدا لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادابوون.

٣- وە ﷲ دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە ئیمانداران ناویان دەهێنێ و دەفەرموێت: (لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ)[٣]. واتە: سوێند بەخوا! بەڕاستی لەخۆتان پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە، کە ناڕەحەتی و ناخۆشیی ئێوە، بەلایەوە قورس و گرانە، زۆر سوورە لەسەر باوەڕهێنانتان، وە بۆ بڕواداران دڵسۆز و میهرەبانە. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەرامبەر بە هاوەڵان (رَءُوفٌ رَّحِيمٌ) بوو.

٤- وە دەفەرموێت: (وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ)[٤]. واتە: وە باڵی بەزەیی و نەرمونیانیت ڕاخە بۆ ئەو باوەڕدارانەی کە شوێنت کەوتوون.

هەموو ئەو (مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ)انەی کە هاتووە، بێگومان مەبەست پێی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بۆیە ﷲ تعالی لە ئایەتەکەدا هەڕەشە لەوانە دەکات، کە شوێن ڕێگەی جگە لە هاوەڵان دەکەون، بێگومان بەپلەی یەک

---

(٣) التوبة: ١٢٨.

(٤) الشعراء: ٢١٥.

ڕێگەی دۆزەخیان گرتۆتەبەر، وە ڕێگەی گومڕاییشیان گرتۆتەبەر، ئەم ئایەتە شافیعی و جگە لەویش دەیکەنە بەڵگە بۆ ئیجماعی هاوەڵان و شوێنکەوتنیان ﷺ.

٥- وە دەفەرمووێت: (فَإِنْ ءَامَنُوا بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ)[٥]. واتە: ئینجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو شێوەیەی کە ئێوەی هاوەڵان بڕواتان پێهێناوە، ئەوا بێگومان ڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوە، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد و بەو شێوەیە باوەڕیان نەهێنا؛ ئەوا ئەوان لە دووبەرەکیدان، وە ﷲ ئاگاداری تۆ دەکات لەوان، وە هەر ﷲ بیسەری زانایە.

ئەم خیتابە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕاشکاوە بۆ هاوڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە دەبینین ﷲ تعالی دینداریتی کورتکردۆتەوە لەو دینداریتی و عەقیدە و بیروباوەڕەدا، کە هاوەڵان لەسەری بوون ﷺ، وە هەر ئەو دیندارێتییەی ئەهلی سوننەتە، کە موسڵمانان جەمع دەکات و دەیانکات بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت، وە بە پێچەوانەوە گەر پشت هەڵبکەن؛ ئەوکات گرووپ و فیرقەی جیا جیا دروست دەبێت، بۆیە دەبینین چ لە ناو سەلەف چ لە دوای سەلەفیش، لەو فیرقە و گرووپە لاڕێیانە کە دروست بوون، لایاندا لە عەقیدە و مەنهەجی بیروباوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٥) البقرة: ١٣٧.

وە دەفەرموویت: (وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ)[٦]. واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچەران و یاریدەدەران و ئەوانەشی زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە، لە تابیعییەکان و شوێنیان کەوتوون، ﷲ تعالی لێیان ڕازییە، ئەوانیش لە ﷲ ڕازین، وە ﷲ تعالی بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دێن و دەچن، بەهەمیشەیی و بێ بڕانەوە تێیدا دەمێننەوە، ئائەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.

کەواتە: شوێنکەوتنی ئەوان واجیب و فەزڵیشە، لەسەر هەموو ئەوانەی دەیانەوێت شوێن دینێکی پاک و پوخت و دوور لە گومڕایی بکەون.

٧- وە ﷲ لە ئایەتێکی تردا لە وەسفی هاوەڵاندا دەفەرموویت: (وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ)[٧]. واتە: شوێن ڕێگای کەسێك بکەوە، کە بە دڵسۆزییەوە گەڕاوەتەوە بۆلای من.

هەموو هاوڵان ﷺ (مُنِيبٌ)وگەڕاوە بوون بۆ لای ڕێگەی ﷲ تعالی، بۆیە واجیبە لەسەرمان بگەڕێینەوە بۆ عەقیدە و بیروباوڕی ئەوان و، شوێن پێیان بکەوین.

---

(٦) التوبة: ١٠٠.

(٧) لقمان: ١٥.

٨- وه دەفەرمووێت: (قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَـٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ)[٨]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: هەموو سوپاس و ستایشێک بۆ ﷲ، وە سەلام و درووود لەسەر ئەو بەندانەی ﷲ کە هەڵیبژاردوون.

ئیمامی (إبن عباس) دەبارەی (ٱصْطَفَىٰٓ) دەڵێ: **"هُم أَصحَابُ مُحَمَّدٍ"**. واتە: ئەوانە هاوڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ.

وە پرسیار لە وەلیدی کوڕی موسلیم کرا دەربارەی ئەم ئایەتە، وترا: **"مَن هَؤُلَاءِ؟"** واتە: ئەوانە کێن؟ لە سوفیانی سەورییەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: **"هُم أَصحَابُ رَسُولِ الله"**. واتە: ئەوانە هاوڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ.

٩- وه دەفەرمووێت: (ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا)[٩]. واتە: لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بەکەسانێ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن، ئەمە بێگومان هاوڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون.

١٠-وه دەفەرمووێت: (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا أَطِيعُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ)[١٠]. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵی ﷲ و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بن ﷺ، وە پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستەکانی خۆتان بن.

---

(٨) النمل: ٥٩.
(٩) فاطر: ٣٢.
(١٠) النساء: ٥٩.

موجاهید -گەورە ڕاڤەکاری قورئان و تابیعی بەڕێز- دەڵێ: (وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ) هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ، کە ئەوان خاوەن فیقهـ و عەقڵ بوون لە دینی ﷲ دا. کەواتە: ﷲ فەرمانمان پێ ئەکات کە گوێڕایەڵی ﷲ و پێغەمبەرەکەی بکەین و، شوێنکەوتەی هاوەڵانی پێغەمبەرەکەی بین ﷺ.

زەححاک دەڵێ: "وَهُم أَصحَابُ رَسُولِ اللهِ، هُمُ الدُّعَاةُ الرُّوَاةُ". واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ، وە ئەوانن کە بانگخواز و گێڕەرەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوان ﷺ.

لە سەلەفەوە هاتووە کە (وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ) هاوەڵانن، وە ئەبوو بەکر و عومەرن.. تاد.

کەواتە: هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی: واجیبە بگەڕێینەوە بۆ ئەو عەقیدە پاکەی کە هاوەڵانی لەسەربوون ﷺ.

١١-وە دەفەرموێت: (قُلْ هَـٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ)[١١]. واتە: بڵێ ئەمە ڕێگای منە، کە بانگی خەڵکی دەکەم بۆ لای ﷲ لەسەر بەڵگەی ڕوون، وە من و ئەوانەش شوێنم کەوتوون، وە پەروەردگاریش پاك وبێگەردە، وە من هیچ کات لە هاوبەشدانەران نیم.

---

([١١]) یوسف: ١٠٨.

کەواتە: (هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ) يعني: **"هَذِهِ أَمرِي وَسُنَّتِي وَمِنهَاجِي"**. وەکو (طبري و إبن أبي حاتم) باسیانکردووە و ڕیوایەتیانکردووە.

١٢-وە دەفەرمووێت: (ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُولَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ)[١٢]. واتە: ئەوانەی کە نامەمان پێداون و بەڕاستی دەوری دەکەنەوە، ئەوانە بڕوا دەهێنن بە ڕێنموونی اللَّه، کە ئیسلامەکەیەتی، وە ئەوانەی کافرن پێی، هەرئەوانە زەرەرمەندن.

ئیبنو مەندە لە [الإيمان]دا دەڵێ: "لێرەدا اللَّه باس لە سیفەتی هاوەڵان دەکات، وە باسی پێگەی ئەوان دەکات لە شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ. (يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ) يعني: **"يَتَّبِعُونَهُ حَقَّ اتِّبَاعِهِ"**. واتە: تەواو تەواو شوێن قورئان کەوتن، حەقیان بە قورئان دەدا، حەڵاڵیان بە حەڵاڵ دەزانی، حەڕامیان بە حەڕام دەزانی، وە بێگومان ئەوان: **"لَا يُحَرِّفُونَهُ عَن مَوَاضِعِهِ"**. واتە: ئایەتەکانیان تەحریف نەدەکرد و واتایان نەدەگۆڕی".

ئایەتەکان زۆرن لە وەسفی هاوەڵان و سەلەف و، واجبێتی ئەوەی ئێمە شوێنیان بکەوین.

---

(١٢) البقرة: ١٢١.

١٣-وه دەفەرموویت: (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَكُونُوا مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ)[١٣]. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان بپارێزن لە تۆڵەی اللهﷻ، وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندابن و لەڕیزی ئەواندابن.

ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: "كُونُوا مَعَ مُحَمَّدٍ ﷺ وَأَصحَابِهِ". واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی پێغەمبەری خوابن ﷺ.

ئایەتەکان زۆرن، گەر بێتوو هەموو ئایەتەکان بهێنین دەربارەی واجبێتی شوێنکەوتنی هاوەڵان و سەلەفی ساڵح، ئەوە درێژە دەکێشێ و زۆری دەوێت.

وەهەروەها کۆمەڵێک فەرموودەشمان هەیە، لەو فەرموودانەی پێغەمبەری خواﷺ کە هاتووە، لەوانە:

١- وەسفی ئەو سێ جیلە دەکات بە خێرترینی ئوممەتەکەی و، دەفەرموویت: "إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ"[١٤]. واتە: باشترینتان ئەم جیلەن، پاشان جیلی دواتر، پاشان جیلی دواتر، پاشان جیلی دواتر.

کەواتە: واجیبە بۆ دینداریتیمان، بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی هاوەڵان و پێشینانی باشمانی لەسەربووە.

---

(١٣) التوبة: ١١٩.

(١٤) سەحیحی موسلیم: ٢٥٣٥.

٢- وە لە فەرموودەی (گرووپی ڕزگاربوودا) دەفەرموێت: "وَإِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ تَفَرَّقَتْ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، كُلُّهُمْ فِي النَّارِ، إِلَّا مِلَّةً وَاحِدَةً، قَالُوا: وَمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي"[١٥]. واتە: بەنی ئیسرائیل دابەش بوون بۆ حەفتا و دوو گرووپ، وە ئوممەتەکەی من دابەش دەبێ بۆ حەفتا و سێ گرووپ، هەموویان لە ئاگردان ئیللا یەک گرووپ نەبێ، هاوەڵان وتیان: کێن ئەوانە! ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسانەن کە لەسەر ئەو مەنهەج و بیروباوەڕەن، کە من و هاوەڵانمی لەسەرن.

فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە جوانی و ڕوونی پێمان دەفەرمووێ و ئامۆژگاریمان دەکات، بە گەڕانەوە بۆ دینداری و مەنهەج و بیروباوەڕی هاوەڵانی بەڕێز و سەلەفی ساڵح.

بێگومان ئیمامی مالیک بنەمایەکی جوانی داناوە لەسەر ئەوەی چ کاتێک ئوممەت ساڵح و سەرکەوتوون، بەوەی دەڵێ: "لَن يَصلُحَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةَ، إِلَّا بِمَا صَلَحَ أَوَّلَهَا". واتە: کۆتایی ئەم ئوممەتە ساڵح نابێ و باش نابێ، تەنها بەوە نەبێ، کە پێشینی ئەم ئوممەتەی لەسەربووە.

گەڕانەوە بۆ شوێنپێی سەلەفی ساڵح، کە دەڵێین شوێنپێ، بێگومان مەبەستمان هی ئەو جیلە پاکەیە، کە ﷲ تعالی وەسف و سەنای کردوون، وە پێغەمبەری خواش ﷺ وەسف وسەنای کردوون، وە پاشان وتە و قسەکانیانە، وە

---

(١٥) جامعی تورمذی: ٢٦٤١.

پاشان کردەوە و دینداریيانە، چونکە ئەوان بە بێگومان قورئانیان لە ژیانیاندا جێبەجێکرد.

بۆیە ئێمەش دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو دینداریيە، بەتایبەتیش عەقیدەکە، کە ئەسڵ وبناغەی دینەکەمانە، کە هەموو کردەوەکانمان لەسەر عەقیدە ڕاوەستاوە، بە پشتوانی ﷲ دەمانەوێت بچینە خزمەتی کتێبەکانی سەلەف، ئەو کتێبانەی کە سەلەفی سالّح کۆدەنگییان تێدا کۆکردۆتەوە.

پرسیار دەکرێ: باشە بۆ ئەم پەرتووکانە هەڵبژێردراوە؟

بێگومان یەکەم پەرتووکێك کە ئەمانەوێ ڕاڤەی بکەین، پەرتووکی [عقیدة الرازيين]ە، ئەم کتێبە تەنها عەقیدەی ئەم دوو پیاوە بەڕێزە نییە، یان عەقیدی بوخاری یان حومەیدی یان ئەحمەد، ئەمانە تەنها عەقیدەی خۆیان نییە، بەڵکو کۆکەرەوەی عەقیدەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ. ئەو پەرتووکانەش:

١- عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ:

**پەرتووکی: (عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ) هی (أَبِو زُرْعَةَ الرَّازِيِّ و أَبِو حَاتِمٍ الرَّازِيِّ)یە، کە (أَبِو زُرْعَةَ: عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْكَرِيمِ)ە، وە (أَبِي حَاتِمٍ: مُحَمَّدِ بْنِ إِدْرِيسَ بْنِ الْمُنْذِرِ)ە.**

ئیمامی (إبن أَبِي حَاتِم) کە (أَبو مُحَمَّد)ە و، ناوی (عَبدُالرَّحمَن)ە، پرسیار لە باوکی و(أَبو زُرْعَةَ) دەکات، دەربارەی عەقیدە ئەهلی سونەت و جەماعەت،

وەک لەسەرەتای مەتنەکەوە باسی دەکات، دەڵێ: **"سَأَلْتُ أَبِي وَ أَبَا زُرْعَةَ عَنْ مَذَاهِبِ أَهْلِ السُّنَّةِ فِي أُصُولِ الدِّينِ، وَمَا أَدْرَكَا عَلَيْهِ الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ، وَمَا يَعْتَقِدَانِ مِنْ ذَلِكَ"**. واتە: پرسیارم لە (باوکم و ئەبو زورعە)کرد، دەربارەی مەزهەبی ئەهلی سوننەت لە بنەماکانی دیندا، وە ئەوەی زانایان پێی گەشتوون لە تەواوی ناوچەکان، وە ئەوەی بیروباوەڕیان بووە، ئەوانیش: **"فَقَالَا: أَدْرَكْنَا الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ؛ حِجَازًا، وَعِرَاقًا، وَشَامًا، وَيَمَنًا، فَكَانَ مِنْ مَذْاهَبِهِمُ"**. واتە: وتیان گەشتووین بە زانایان لە هەموو وڵاتەکان، لەوانە: حیجاز و عێراق و میسر و شام و یەمەن، پاشان: **"فَكَانَ مِنْ مَذْاهَبِهِمُ"** ئینجا لێرەوە باسی بیروباوەڕ و عەقیدەکەی سەلەف دەکەن.

## ٢- إِعتِقَادُ أَبِي حَاتِمٍ الرَّازِيِّ:

ئەم کتێبانەی کە دیاریيان دەکەین، کۆدەنگی زانایانە، بۆیە دەتوانین بڵێین: ئیجماعاتی عەقیدەی سەلەفە، واتە: کۆدەنگییەکانی بیروباوەڕی سەلەفە، لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا، لە هاوەڵان و تابیعی و تابیعی تابیعین.

## ٣- عَقِيدَةُ البُخَارِيِّ:

پەرتووکی (عقيدة البخاري) گەر بچینە سەر پێشەکییەکەی، دەبینین دەڵێ: **"أَدْرَكْتُهُمْ وَهُم مُتَوَافِرُونَ مَعَ مُنذُ أَكثَرَ مِن سِتٍّ وَأَربَعِينَ سَنَةً"**. دەڵێ: ٤٦ ساڵ بە شارەکان و وڵاتەکاندا گەڕاوم، دەڵێ: ناژمێردرێ ئەوەندە چوومەتە کووفە و بەغداد، وە چوومەتە خۆراسان بۆ لای زانایانی ئەهلی عیلم و فەرموودەناسان، لە شام و میسر و مەککە و مەدینە و بەسرە و کووفە و بەغداد،

هەموویان لەسەر ئەم عەقیدەیە بوون: "فَمَا رَأَيتُ وَاحِدَاً مِنهُم يَختَلِفُ فِي هذِهِ الأَشيَاءِ". واتە: کەسیانم نەبینی، کە ڕای جیاوازبێ، لەم شتانەی لەم عەقیدەیەدا باسمکردووە.

٤- عَقِيدَةُ الحُمَيدِيِّ:

ئەمیش کۆدەنگییەکانی بیروباوەڕی سەلەفی بۆمان گواستۆتەوە، کە دەڵێ: (السُّنَّةُ عِندَنَا)، واتە: (العَقِيدَةُ عِندَنَا).

٥- عَقِيدَةُ قُتَيبَةُ بنُ سَعِيدٍ:

ئیمامی قوتەیبە یەکێکە لە زانایە گەورەکان و، (شیخ الإسلام)بووە، فەرموودەناس بووە، کە مەتنەکە باس دەکات، دەڵێ: "ئەمە بیروباوەڕی فەرموودەناسانە و، هیچ ئیختیلافێکمان تێیدا نەبینیوە". کاتێك باسی بیروباوەڕی هاوەڵان و دوای ئەوانیش دەکات.

٦- عَقِيدَةُ الإِمَامِ أَحمَدَ بنَ حَنبَلٍ:

کە بە (أُصُولُ السُّنَّةِ) ناسراوە، دەڵێ: (أُصُولُ السُّنَّةِ عِندَنَا)، (عِندَنَا)، واتە: (عِندَ أَهلُ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ).

بۆیە لەم سەردەمەدا بۆ ئێمە گرنگە، کە دەبینین گێژاوی فیکرەکان، بە تایبەتی ئەشعەرییەت و جەهمییەت و ئەهلی ئیرجاء و فیکری خەواریج و، تەواوی ئەو فیرقە و گرووپانەی، کە لە دوای هاوەڵانەوە دروست بوون، شەپۆلەکانیان گێژاو

دەدەن، ڕاوی کەسانێکی زۆر دەکەن، لەوانەی پاڵدراون بۆ ئیسلام، وە زۆرێک لە بیروباوەڕە بەتاڵەکەی خۆیان بڵاو دەکەنەوە، بۆیە گرنگە بۆ موسڵمان، کاتێک قورئان دەخوێنێتەوە، ئەوەندە گرنگی بدات، بەوەی ئاگای لەوەبێ کە ﷲ فەرمانی پێ کردووین، بگەڕێینەوە بۆ دینداریێتی هاوەڵان و دوای ئەوان لە سەلەفی ساڵح، تاکو پارێزراوبین لە گومان و شوبهەکان.

ئێمەش بە پشتیوانی ﷲ، دەست دەکەین بە ڕاڤەی ئەم مەتنانە و، لە مەتنی (عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ)ەوە دەست پێدەکەین، چونکە ئەم مەتنانە، وەک وتمان ئیجماعاتە، جا هەرکەسێک پێچەوانەی بوەستێتەوە، لە دوو حاڵەت بەدەر نییە:

١- هەندێک بابەتی تێدایە، کە هەرکەس پێچەوانەی بوەستێتەوە، لە ئیسلام دەردەچێ و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنێ.

٢- هەندێک بابەتیشی تێدایە، کە هەرکەس پێچەوانەی بوەستێتەوە، لە بازنەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەچێتە دەرەوە و، دەبێ بە موبتەدیع.

ئەم چەند وتەیەی سەرەوە وەک ڕێخۆشکارێک بوو بۆ ڕاڤەی ئەم مەتنە بەنرخانە، بە پشتیوانی (رب العالمين) دەچینە خزمەتی یەکەم پەرتووک لەو پەرتووکانەی، کە کۆدەنگی تەواوی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لەسەرە و، هیچ خیلافێک نییە دەربارەی ناوەڕۆکی کتێبەکە، ئەویش بریتییە لە: (عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ).

ئیمامی (إبن أبي حاتم) کە ناوی (أبو محمد عبدالرحمن إبن أبي حاتم الرازي)یە، کوڕی ئیدریسی حەنزەلیی ڕازییە، لە ساڵی ٣٢٧ی کۆچی وەفاتیکردووە.

ئەم زانا بەڕێزە پرسیار لە باوکی و ئەبو زورعەی ڕازیی دەکات، بێگومان باوکی، کە ئەبو حاتەمی ڕازییە، ناوی موحەممەدی کوڕی ئیدریسی ڕازییە، لە زانا گەورەکانی ئیسلامە، ئیمام و پێشەوا بووە لە عەقیدە و جەرح و تەعدیل، وە هاوەڵی ئیمامی ئەحمەد بووە، وە ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی مامۆستا و هاوەڵی بووە، ئەم زانا بەڕێزە لە ساڵی ٢٧٧ی کۆچیی وەفات دەکات.

ئیمامی (ئەبو زورعە)ش، کە ناوی (عبيدالله ابن عبدالكريم)ی ڕازییە، ئیمامی ئەهلی سوننە بووە لە خۆڕاسان، ئیمام بووە لە عەقیدە و فەرموودە و عیلەلی فەرموودە و جەرح و تەعدیل، ئەم پیاوە بەڕێزەش لە ٢٦٤ی کۆچیی وەفاتیکردووە.

ئەم پیاوە بەڕێزانە ئیمام و پێشەوای گەورەی ئیسلام بوون، وترا بە (إبن أبي شيبة) ئەوەی بینیوتە لە ئەهلی حەدیس، لە زانا گەورەکانی ئەم ئیسلامە، کێ زاناترینیانە؟ وتی: کەسم نەبینیوە زاناتر بێ لە ئەبو زورعەی ڕازی.

ئیمام ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی ئەڵێ: **"كُلُّ حَدِيث لَا يَعرِفُهُ أَبُو زُرعَةَ الرَّازِيِّ لَيسَ لَهُ أَصلٌ"**. واتە: هەر فەرموودەیەک ئەبو زورعەی ڕازی نەیزانیبێ، هیچ ئەسڵێکی نییە.

جا بۆیه ئەم پیاوە بەڕێزە (إبن أبي حاتم) پرسیار دەکات و، دەڵێ:

# سەرەتای مەتنەکە و شەرحکردنی

سَأَلْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ عَنْ مَذَاهِبِ أَهْلِ السُّنَّةِ فِي أُصُولِ الدِّينِ[١]، وَمَا أَدْرَكَا عَلَيْهِ الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ ، وَمَا يَعْتَقِدَانِ مِنْ ذَلِكَ؟[٢] فَقَالَا:[٣]

---

(١) سَأَلْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ عَنْ مَذَاهِبِ أَهْلِ السُّنَّةِ فِي أُصُولِ الدِّينِ. واتە: پرسیارم لە باوکم و ئەبو زوڕعە کرد، دەربارەی عەقیدەی ئەهلی سوننە لە بنەماکانی دیندا.

ئەوەمان لەبیرنەچێ، ئەم پیاوانە بە زۆرێک لە زانا گەورەکان گەشتوون، أبو حاتم بە ٣٠٠٠ لە گەورە زانایانی ئەم ئیسلامە گەشتووە، ئەم دووانە:

١- لە مەککە، گەشتوون بە موحەممەدی کوڕی سەلام و، زانستییان لێ وەرگرتووە.

٢- لە بەغداد، زانستییان لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، یەحیای کوڕی مەعین و، عەففانی کوڕی موسلیم وەرگرتووە.

٣- له كووفه، زانستییان له ئەبو نوعەیم و، أبو بكر ابن أبي شيبة و، مالیکی کوڕی ئیسماعیل وەرگرتووە.

٤- له بەسرە، زانستییان له عبداللەی کوڕی مەسلەمەی قەعنەبی و، فەللاس و، تەیالیسی وەرگرتووە.

٥- له شامیش، زانستییان له موحەممەدی کوڕی عوسمانی تەنوخی وەرگرتووە.

٦- له میسریش، زانستییان له هاوەڵەکانی شافیعی و ڕەبیع و یونس وەرگرتووە.

وه جگه لەوانەیش، وەک وتمان ئەبو حاتەم خۆی گەشتووە بە ٣٠٠٠ ئیمام.

(٢) وما أدركا عليه العلماء في جميع الأمصار وما يعتقدان من ذلك؟

واته: ئەوەی پێی گەشتوون له زانایان له تەواوی وڵاتان، لەوەی که لەسەری بوون له دینداریتیدا و، عەقیدەیان چۆن بووە؟

(١) فَقَالَا. واته: هەردووکیان وتیان.

أَدْرَكْنَا الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ حِجَازًا وَعِرَاقًا وَشَامًا وَيَمَنًا فَكَانَ مِنْ مَذْهَبِهِمْ:[٢]

---

(١) **أَدْرَكْنَا الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ حِجَازًا وَعِرَاقًا وَشَامًا وَيَمَنًا فَكَانَ مِنْ مَذْهَبِهِمْ.** واته: گەشتووین بە زانایان لە تەواوی وڵاتەکان: حیجاز کە مەککە و مەدینەیە، عێراق، میسڕ، شام، یەمەن، لە دینداریێتی و ڕێبازی ئەوان بریتییە لە: تەواوی ئەو عەقیدەیەی لەم کتێبەدا هەیە، کە دەچینە خزمەتی.

بێگومان، کە دەڵێ: **(أُصُولِ الدِّينِ)** یان **(السُّنَّة)** یان **(العَقِيدَة)** یان **(الشَّرِيعَة)** یان **(التَّوحِيد)**، هەموو ئەمانە زاراوەن بۆ بنەما و بنچینەی دینداریێتی، کە تەواوی پەرستن و دینداریێتیمان لەسەری وەستاوە. وە بۆ فێربوون و تێگەیشتن و پێگەیشتنن لەسەر باشترین بیروباوەڕ، پێوستە بگەڕێینەوە بۆ بیروباوەڕ و عەقیدەی سەلەف و سەرەتاکانی ئوممەت، لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان، ئەو سێ جیلەی ئەوندە پاکبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی باشەی بۆ داوون، گەڕانەوە بۆ دینداریێتی ئەوان، بێگومان پارێزگارییە لە دینمان، پارێزگارییە لەوەی لە گومڕایی و سەرلێشێواوی و ناتەبایی و دژیەکی لە عەقیدە پارێزراوبین. وە بێگومان ئەوەی زۆرێک لە خەلەف و سەردەمییەکانی گرتۆتەوە، لە گومڕایی و گێژاوی فیکرەکان، لە ڕاستیدا هەمووی بە هۆکاری نەگەڕانەوە بۆ پەیڕەویکردن و بە

مەرجەعییەتکردنی سەلەفە، وە تاکە ڕێگای یەکبوونەوەی ئوممەت و چاکبوونیان، کە بریتییە لە دینداریتییان، گەڕانەوەیە بۆ بیروباوەڕی پاکی ئەوان، مەحاڵە بەبێ ئەمە، ئوممەت بتوانێت هەستێتەوە و، ئاڵای شکۆ و عیززەت بگرێتە دەست.

هەموو ئەو بیردۆز و بیرۆکە و فیکرانەی لە گرووپ و فیرقەکان دروست دەکرێت و، هەوڵ دەدەن بگەن بە ترۆپی شکۆ و، ئاڵای ئیسلام بگرنەوە دەست، پێی ناگەن؛ هۆکارەکەی بە بێگومان، نەگەڕانەوەیە بۆ سەلەف و سەرەتاکانی ئەم ئوممەتە، وەکو ئیمامی مالیک دەڵێت: "**لَن يُصلِحَ آخِرَ هَذِهِ الأُمَّة إلَّا مَا صَلَحَ أَوَّلَهَا**". واتە: دواهینی ئەم ئوممەتە ئیسڵاح وچاک نابێت، تەنها بە دەستگرتن بە چاکسازیی و عەقیدە و بیروباوەڕەی پێشینەکانیان نەبێت.

دەبێ ئەوەش بزانین، سەلەف ناوێک نییە بۆ نازناو، بەڵکو مەنهەج و پڕۆگرامێکە بۆ کارپێکردن، خۆدانەپاڵ ئەم ناوە، بەبێ گەڕانەوەیەکی ڕاستەقینە بۆ شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی ئەوان، جگە لە بانگەشەیەکی بەتاڵ، هیچی دیکە نییە، بۆیە بۆ مەرجەعییەت و مەنهەجییەتی عەقیدەی سەلەف، پێوستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو پەرتووکانەی سەلەف، کە نوسیوویانن، بەتایبەتی ئەو کتێبانەی کە کۆدەنگی سەلەفی لەسەرە، لەوانە عەقیدەی دوو ڕازییەکە، کە پێویستە خوێندکاری زانستی شەرعیی ئەم مەتنە لەبەر بکات و، بیکات بە بناغەی بنیاتنانی بیروباوەڕێکی پاک، ئەو بیروباوەڕەی سەلەف و سەرەتاکانی ئوممەتی لەسەر بوون، جا بەمشێوەیە دەست پێ دەکەن:

## ١- الْإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.(١)

---

(١) **الْإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ**. واتە: ئیمان وتەیە و کردارە.

یەکێک لەو بابەتانەی ئەهلی حەقی پێ جیادەکرێتەوە، لە ئەهلی بەتاڵ و ئەهلی بیدەع، بریتییە لە بابەتی ئیمان و موسەمما و پێکهاتەی ئیمان، لێرەدا گەر سەیری پێناسەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بکەیت لە بابەتی ئیماندا:

١- هەیانە وتوویەتی: **"الإيمَانُ: قُولٌ، وَعَمَلٌ"**. وەکوو لێرەدا هاتووە، وەجگە لە ئەبو حاتەم و ئەبو زورعە، هەریەک لە عوبەیدی کوڕی عومەیر و، لەیسی و، سوفیانی کوڕی عویەینە و، سوفیانی سەوری و، ئیبنو جورەیج و، ئەوزاعی و، هیشامی کوڕی حەسسان و، مالیک و، یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتان و، شافیعی و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، حومەیدی و.. تاد، جگە لەوانیش بەم شێوەیە پێناسەی ئیمانیانکردووە.

٢- هەندێکی دیکە بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە: **"الإيمَانُ: قَولٌ، وَعَمَلٌ، وَنِيَّةٌ"**. وەکوو: حەسەنی بەسری و، سەعیدی کوڕی جوبەیر و، سوفیانی سەوری جارێکی دیکە، وە داوودی کوڕی هیند و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، شافیعی و، هەندێک لە هاوەڵان و، تابیعینیش، وەک شافیعی لە [الأم]دا هێناویەتی کە بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە.

٣- هەندێکی دیکە بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە: "**الإيمَانُ: قَولٌ، وَعَمَلٌ، وَإعتِقَادٌ**" یان: "**الإيمَانُ: قَولٌ، وَعَمَلٌ، وإعتِقَادٌ**". وەکوو: شافیعی، کە ڕەبیعی قوتابیی لێیەوە ڕیوایەتیکردووە، وە هەندێکی دیکەش لە زانایان.

٤- هەندێکی دیکە بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە: "**الإيمَانُ: مَعرفَةٌ، وَإقرَارٌ، وَالعَمَل**". وەکوو: مالیک و، شەریک و، ئەبو بەکری کوڕی عەییاش و، جگە لەوانیش بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە.

٥- هەندێکی دیکە بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە: "**الإيمَانُ: إعتِقَادٌ بِالجَنَانِ، وَقَولٌ بِاللّسَانِ، وَعَمَلٌ بِالجَوَارِحِ وَالأَركَانِ**". وەکوو: ئەبو سەور و، موزەنی و، ئاجوڕڕی و، جگە لەوانیش، بەم شێوەیە پێناسەیانکردووە.

هەموو ئەو دەستەواژانە یەک واتایان هەیە و هاوواتای یەکن، کە دەتوانین بە پوختی بڵێین بریتییە لە سێ بنەما: (بیروباوەڕ، وتە، کردەوە)، ئەم سیانە بنەمان، بەبێ یەکێکیان ئیمان بوونی نییە، وەکو چۆن نوێژی ئێوارە سێ ڕکاتە، گەر بکرێت بە دوو ڕکات، ئیتر نوێژی ئێوارە نییە، بە هەمان شێوەش گەر پایەیەک لەو سێ پایەیە لابردرێت، ئیتر ئیمان بوونی نامێنێ، تا بەهۆیەوە موسڵمان لە جگە موسڵمان جیاببێتەوە.

## قَوْلٌ وَعَمَلٌ

ئەبێ بزانین:

١ - **قَوْلٌ.** واتە: وتە، دوو جۆرە:

یەکەم: **(قَولُ البَاطِن)**، بریتییە لە **(قَولُ القَلبِ)**، واتە: وتەی دڵ، کە ئەمیش بریتییە لە: **(المَعرِفَةُ وَتَّصدِیقُ القَلبِ)**، واتە: ناسین و بەڕاستدانانی دڵ، بە هەموو ئەو شتانەی کە دەبێ مەعریفەتمان پێیان هەبێ، بەزانینی و بەڕاستی دابنێین، وەکوو: **(الإخلَاص، وَالتَّوکُل، وَالحُبّ، وَالبُغض، وَالإستِعَانَة .. إلَخ)**.

دووەم: **(قولُ الظَّاهِر)**، بریتییە لە **(قَولُ اللِّسَان)**، واتە: وتەی زمان، کە ئەمیش بەرزترین پلەی بریتییە لە: دەربڕینی دوو شایەتییەکە، کە ئەم جۆرەی تێدایە **(لَا یَصِحُ الإیمانُ إلَا بِهِ)**، واتە: ئیمان دانامەزرێت تاکو نەیەتەجێ، وەکوو دوو شایەتییەکە و تەوحیدی بەشی وتە، وە تێشیدایە کە لە موستەحەبباتە و ئیمانی پێ کامڵ دەبێ و، ئیمانی پێ زیاد دەکات، وەکو ویردەکان بەگشتی.

٢- **عَمَلٌ**. واتە: کردار، دوو جۆرە:

یەکەم: **(عَمَلُ البَاطِن)**، بریتییە لە **(عَملُ القَلبِ)** واتە: کردەوەی دڵ، کە ئەمیش بریتییە لە: **(الإخلَاص، وَتَجَرُّدُ القَلبِ للهِ تَعَالَى، وَالخَشِيَّة، وَالخَوف، وَالمَحَبَّة.. إلَخ)**.

دووەم: **(عَمَلُ الظَّاهِر)**، بریتییە لە **(عَملُ الجَوَارِحِ وَالأَركَان)**، واتە: کردەوەی لاشە و ئەندامەکان.

پاشان لە حاڵی دووەمەوە، ڕاجیاوازی دەکەوێتە نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەتی حەق و، ئەهلی گومڕایی، ئەویش بریتییە لە **(عَملُ الجَوَارِحِ)**، واتە: کردەوەی لاشە، مەبەستمان لەمە ئەو کردەوانەیە، کە بە نەبوونیان ئیمان بوونی نییە، ئەوەش ئەو کردارەیە، کە تایبەتمەندی ئوممەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، یاخود دروستتر بڵێین: جیاکەرەوەی نێوان شەریعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و شەریعەتەکانی ترە، وەکوو: نوێژ و، ڕۆژوو و، زەکات و، حەج، نەک بە ڕەهایی بوترێ: کردەوەکان هەمووی، چونکە زۆرێک لە کردوەکان، لە دین و شەریعەتەکانی دیکەشدا فەرمان پێکراو بوون، وەکوو: چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک، بەخشین، پیاوەتی، سەردانی خزم وکەسوکار.

دینی حەق ئەو دینەیە کە لەگەڵ تەوحیددا ·کاروکردەوەی لەگەڵ بێت، وەکوو:

١- ﷲ تعالی دەفەرموویت: (وَمَآ أُمِرُوٓا إِلَّا لِيَعۡبُدُوا ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُوا ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ)[١٦]. واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانیان پێنەدرابوو، تەنها بەوەی کە بە دڵسۆزی و ملکەچییەوە پەرستشی ﷲ بکەن، وەخۆیان لە هەموو بیروباوەڕێکی خواروخێچ بەدوور بگرن، وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەمەیە ئایینی ڕاست.

٢- وە دەربارەی کۆمەڵی ڕزگاربوو لە دۆزەخ دەفەرموویت: (وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡا بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡا بِٱلصَّبۡرِ ۝٣)[١٧]. واتە: سوێند بە کات ۝١ بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە ۝٢ تەنها ئەوانە نەبێ، کە بڕوایان هێنابێ و، کردەوە چاکەکانیان کردبێ و، ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئایینی ڕاست و، ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە ئارامگرتن ۝٣.

بۆیە دەبینین لای هەندێ لە سەلەف، وازهێنان لە هەریەک لە پایەکانی ئیسلام، بە کوفری کافربوونیان زانیوە، وەک لە ئوسوڵی سوننەی ئیمام

---

(١٦) البينة: ٥.

(١٧) العصر: ١ تا ٣.

حومەیدی و جگە لەوانیش هاتووە، کە وازهێنان لە ڕووکنێک لە ڕووکنەکانی ئیسلام، لەوانەی جیاکەرەوەی نێوان شەریعەتی ئیسلام و شەریعەتەکانی ترە، بە کوفری کافربوونیان زانیوە، لای زۆرێک لە سەلەف، وازهێنان لە نوێژ و زەکات، دەرچوون بووە لە دین و، تەکفیری ئەوانەیان کردووە، کە نوێژ ناکەن و زەکاتی ماڵەکانیان دەرناکەن، بەڵام لای تەواوی هاوەڵان، وازهێنان لە نوێژ، دەرچوون بووە لە ئیسلام و تەکفیری نوێژنەکەریان کردووە.

کەواتە: کەسێک واز لە کردارە بنچینەییەکانی دین بهێنێ، لە ئیسلام دەردەچێت، بە پێچەوانەی موڕجیئەکان، بێگومان کە دەڵێین موڕجیئەکان، موڕجیئەکانی سەرەتا دەڵێین، کە ئەوان تەنها بە ئیسلام و ئیمان ئیسلامەتییان بۆ خاوەنەکەی جێگیر دەکرد و ئیمانی تەواویان پێ دەدا، پێیان وابوو کە کردارەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، ئیمان زیاد و تەواو دەکەن و، پایەیەک نیین لە ئیمان.

بەڵام بە پێچەوانەوە، لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت، کردار بەشی دانەبڕاوی ئیمانە، تەبعەن ئەو کردارانەی کە **(إِختَصَّت بِهَا شَرِيعَةُ مُحَمَّدٍ ﷺ)**، واتە: ئەو کاروکردەوانەی کە تایبەتمەندی ئوممەتی پێغەمبەری خوان ﷺ.

بێگومان موڕجیئەکان لە کۆندا و، ئەو گرووپانەشی شوێنکەوتەی ئەوانن لە دوایینەکان و سەردەمییەکان، بۆ پشتڕاستکردنەوەی عەقیدەی خۆیان، بە هێنانەوەی هەندێک بەڵگە، کە لای ئەوان بۆتە بەڵگە و، خۆی شوبهە و گومانە، عەقیدەکەی خۆیان دادەمەزرێنن، کە تێیدا بەڵگە بە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێننەوە، بەتایبەت ئەو فەرموودانەی، کە لە فەزڵی (لا إله

إلا الله)دا هاتووه، پێیان وایه هەرکەسێک ئەمه بڵێت، ئیتر بەهەشتییه، گەر هیچ کردەوەیەکیشی نەبێت، بێگومان ئەمانه لەو مەنهەجه تێنەگەشتوون که پێغەمبەری خوای لەسەر بووه ﷺ و، سەلەفی ساڵح شوێنی کەوتوون، له ڕاستیدا ئەوەی ئیمان بهێنێت و، کاروکردەوه نەکات، له دوو حاڵەت بەدەر نییه:

یەکەم: کەسێک شایەتومان بهێنێ، بەڵام ڕێگرێک هەبێ لەوەی کاروکردەوه ئەنجام بدات، له ڕێگرییه شەرعییەکان، وەکوو ئەوەی شایەتومان بهێنێ و، فریای کاروکردەوه نەکەوێت و بمرێت، هەر لەبەر ئەمەیه پێغەمبەری خوا ﷺ له کاتی سەرەمەرگی مامیدا پێی دەفەرمووێت: "قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ كَلِمَةً أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ"[١٨]. واته: بڵێ لا إله إلا الله، وشەیەکه دەتوانم بەهۆیەوه ڕزگارت بکەم لای ﷲ، مورجیئەکان بەمجۆره فەرموودانه شوبهه و گومان دروست دەکەن بۆ سەر دڵی موسڵمانان، دەڵێن: ئەوەتا بەس بیگوتایه لا إله إلا الله، ئیتر کردەوەشی نەکردایه، ڕزگاری دەبوو، بۆیه کردەوه بەشێک نییه له پایەی ئیمان، بەڵام ئەوان تێناگەن، که ئەمه جۆری یەکەم و حاڵەتی یەکەمه، که بریتییه له وتەی دڵ و، وتەی زوبان و، فریای کردەوەی لاشه ناکەوێت، یاخود کەسێکی تازه موسڵمانبووه و، ئیمانی هێناوه، بەڵام هێشتا دەستی نەکردووه به کاروکردەوه، ئەمانه حاڵەتی تایبەتن، بۆیه عوزریان پێ دەدرێت.

(١٨) صحيح البخاري: ٣٨٨٤.

دووەم: کەسێک بانگەشەی ئیمان بکات و، کار نەکات بەو کردارانەی کە لە شەرعدا، الله کردویەتی بە بنەما و بنچینەی ئیسلام، وازی لێبهێنێت و ئەنجامی نەدات، بەبێ هیچ عوزرێکی شەرعیی، ئەوا ئەو کەسە بێگومان **(لَيسَ بِمُؤمِن، بَل هُوَ كَافِر)**، واتە: ئیماندار نییە؛ بەڵکو کافرە، بۆ نموونە: کەسێک خۆی بە موسڵمان بزانێت و هیچ کاروکردەوەیەک نەکات، لەو کاروکردەوانەی کە وازهێنان لێی دەبێتە هۆی کافربوون.

کەواتە: لەمەوە تێدەگەین، کە مورجیئەکان بە نارێکی تێگەشتوون لە پێکهاتەی ئیمان؛ بەوەی سەرەتای ئیمان هێنان و، بەردەوامی لەسەر ئیمان لێکجیاناکەنەوە، لە بەڵگەکان تێناگەن، لە ڕاستیدا: **"لَا يَصِحُّ الإِيمَانُ بِلَا قَولٍ، وَإِعتِقَادٌ وَقَولٌ بِلَا عَمَلٍ"**. واتە: ئیمان بەبێ وتە، سەحیح و دامەزراو نییە، وە بیروباوەڕ و وتەش بەبێ کردار، سەحیح و دامەزراو نییە.

هەروەها مورجیئەکان دەربارەی کوفریش هەروا دەڵێن، کە کرداری کوفری بە هۆکاری چوونە دەرەوە لە ئیسلام نازانن، ئەمە بیروباوەڕی ئەهلی ئیرجائە لە کۆنەکان، وە لەوانەی خەلەف و سەردەمییەکانیش کە شوێن پێشینانیان کەوتوون.

گەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین، دەبینین الله تعالی لە باسی ئەهلی ئیماندا، باسی عەمەل و کردار ئەکات، کە هۆکارە بۆ چوونە بەهەشتیان، وەکو الله تعالی:

١- دەفەرموویت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾[١٩]. واتە: کەسێکیش کردەوە چاکەکان جێبەجێ بکات، لە نێر یان لە مێ، لەهەمان کاتدا ئەو کەسە بڕوادار بێت، ئەوا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و، هێندەی توێکڵی ناوکە خورمایەك ستەمیان لێ ناکرێت.

٢- وە دەفەرموویت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[٢٠]. واتە: هەرکەس، لە نێر یان لە مێ، کردەوەی چاکی کردبێ و بڕواداریش بووبێت، ئەوە سوێند بە ﷲ، بە ژیانێکی خۆش دەیان ژیێنین و، سوێندبێ پاداشتیان دەدەینەوە بە چاکتر لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

٣- وە دەفەرموویت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَـٰتِبُونَ﴾[٢١]. واتە: ئینجا هەرکەسێک هەرچەند لە کردەوە چاکەکان بکات و باوەڕداریش بێت، ئەوە پاداشتی کۆششەکەی ون نابێ و بەفیڕۆ ناڕوات، بەڕاستی ئێمە بۆ کردەوەکانی ئەو نووسەرین.

٤- وە ﷲ تعالی موژدە دەدات بە ئەهلی ئیمان، ئەوانەی کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، وەکو دەفەرموویت: ﴿وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ

---

(١٩) النساء: ١٢٤.

(٢٠) النحل: ٩٧.

(٢١) الأنبياء: ٩٤.

ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا)[٢٢]. واتە: موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن، کە بەڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

بۆیە نابینیت باسی ئەهلی ئیمان هاتبێ و، موژدەی بەهەشتیان پێ درابێ و، ئەوان کرداریان نەکردبێ.

بە پشتیوانی ﷲ باسی گومانەکانی مورجیئەکان دەکەین، کە هەندێ ئایەت و فەرموودە بە بەڵگە دەهێننەوە، کە لای ئەوان بووە بە بەڵگە، ئەگینا خۆی شوبهەیە، لەوانە فەرموودەی: **((لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ))**[٢٣]، وە بەڵگەی دیکەش.

٥- وە دەفەرموێت: (وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا)[٢٤]. واتە: مژدەش بدات بەو باوەڕدارانەی، کە کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، بەوەی کە پاداشتێکی چاکیان بۆ هەیە.

٦- وە دەفەرموێت: (فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًا)[٢٥]. واتە: جا هەرکەس بەتەمایە بە خزمەت

---

([٢٢]) الإسراء: ٩.
([٢٣]) صحيح البخاري: ٧٥٠٦.
([٢٤]) الكهف: ٢.
([٢٥]) الكهف: ١١٠.

پەروەردگاری بگات لە قیامەتدا، ئەوە با کردەوەی چاك ئەنجام بدات و، لە پەرستنی پەروەردگاریدا کەس نەکات بە هاوبەشی.

هەر لەبەر ئەمەیە؛ کە ئیمامی مەڕوەزی لە کیتابی [تعظیم قدر الصلاة]دا ئەڵێ: "كُلُّ آيَةٍ وَعَدَ اللهُ المُؤمِنِينَ فِيهَا الجَنَّةَ وَبَشَّرَهُم بِهَا، إِنَّمَا أَرَادَ المُؤمِنِينَ الذِّينَ عَمِلُوا الصَّالِحَات". واتە: هەر ئایەتێک کە ﷲ تعالی تێیدا وەعدی دابێ بە ئیمانداران بە بەهەشت، ئیللا مەبەستی ئەو ئیماندارانەیە کە کاروکردەوەی چاک ئەنجام ئەدەن. بۆیە هەرکەسێک لافی ئیمان لێبدات و "لَم تَعمَل جَوارِحُهُ"، کاروکردەوەی نەبێ بە ئەندامەکانی جەستەی، یان تەرکی پایەکانی ئیسلامی کردبێ، ئەوە ئەو کەسە هێشتا دەرنەچووە لە "ظُلُمَاتِ الكُفر"، تاریکییەکان کوفرو، موسڵمان نییە!

٧- وە دەفەرموویت: (رَّسُولًا يَتْلُوا عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَـٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَـٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا)[٢٦]. واتە: هەروەك پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، کە ئایەتەکانی ﷲ دەخوێنێتەوە بۆتان، کە ڕوون کەرەوەن، تا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە، دەربێنێ لە

---

([٢٦]) الطلاق: ١١.

تاریکستانی بێ دینی بۆ ڕووناکیی دینداری، هەرکەسێك باوەڕ بێنێ بە ﷲ و کاری چاك ئەنجام بدات، دەیخاتە ناو بەهەشتانێکەوە، کە جۆگە ئاوی زۆر بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، بێگومان ﷲ لەوێدا ڕۆزیی چاکی بۆ ئامادەکردووە.

کەواتە: ﷲ تعالی کردەوەی چاکی کردۆتە هۆکاری ڕزگاربوونی مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ، هەرچەند کردارەکەش کەم بێ و تاوانی زۆربێ، بەڵام هەر دەبێ ئەو کردار و عەمەلەی لەگەڵدابێ، کە جیاکەرەوەی ئیسلام و کوفرە.

٨- وە دەفەرمووێت: (وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَـٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا)[٢٧]. واتە: وە کەسانێکی دیکە هەن دانیان ناوە بە گوناهەکانیاندا، کردەوەی چاکیان تێکەڵکردووە لەگەڵ کردەوەی دیکەی خراپدا.

٩- وە بێگومان تەوبە لە کوفر، کە بیروباوەڕ و وتەی لەگەڵدا بێت، ئیللا دەبێ کردەوەی جەستەشی لەگەڵ بێت، ﷲ خۆی دەفەرمووێت: (إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَأُولَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا)[٢٨]. واتە: جگە لەوەی کە تۆبەی کردبێت و باوەڕی هێنابێ و کاروکردەوەی

---

(٢٧) التوبة: ١٠٢.

(٢٨) مريم: ٦٠.

چاكی كردبێت، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ ستەمێكیان لێناكرێت و لە پاداشتی كردەوە چاكەكانیان كەم ناكرێتەوە.

دەیان بەڵگەی ئایەتمان هەیە، كە كرداری باش، لەو كردارەی كە پایەی ئیسلام و جیاكەرەوەی شەریعەتی ئیسلامی حەق و شەریعەتەكانی ترە، بە بنەما و پایەیەكی دانەبڕوای ئیمان دادەنێت.

١٠- وە دانەمەزراندی ئیمان بەبێ كردار، دینی هەموو پێغەمبەران بووە، وەك اللَّهُ تعالی دەفەرمووێت: (إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَٱلَّذِينَ هَادُوا وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)[٢٩]. واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئیماندار و موسوڵمانن، وە ئەوانەی جوولەكەن، وە گاور و ئەوانەی لە ئاینی موسا و عیسا لایاندا و بوونە فریشتە پەرست، -سەلامی اللَّهُ لەو دوو پێغەمبەرە بەڕێزە بێت-، هەركامێک لەمانە بڕوای هێنا بە اللَّهُ و ڕۆژی دوایی و كردەوەی چاكی ئەنجامدا، ئەوە پاداشتیان بۆ هەیە لەلای پەروەردگاریانەوە، نەترسیان لەسەرە و نە خەفەت دەخۆن. ئەم ئایەتە لە بەهێزترینی بەڵگەكانە لەوەی، كە كردار بەشێكی دانەبڕاوە لە ئیمان، وە ئیمان و كردار موتەلازیم و دانەبڕاون لە یەكتری.

---

[٢٩] البقرة: ٦٢.

وەهەروەها کۆدەنگی نەقڵکراوە دەربارەی ئەم بابەتە، وەکوو:

شافیعی کۆدەنگی هاوەڵان و تابیعی و تابیعی تابیعییەکان ئەگوازێتەوە و، ئەڵێ: "كَانَ الإجمَاعُ مِنَ الصَّحَابَة والتَّابِعِينَ مِن بَعدِهِم مِمَّن أَدرَكنَاهُم، أَنَّ الإِيمَانَ قَولٌ وَعَمَلٌ وَنِيَّةٌ، وَلَا يُجزِيءُ وَاحِدٍ مِنَّ الثَّلَاثَة إِلَّا بِالآخَر". واتە: کۆدەنگی هەبووە لەلای هاوەڵان و تابیعییەکانی دوای ئەوانیش، لەوانەی کە پێیان گەیشتووین، کە ئیمان بریتییە لە وتە و، کردار و، نییەت، هیچ یەکێک لەو سیانە بەبێ ئەوانی دیکەیان نایەنە بوون.

وە (إبن أبي زيد القيرواني و إبن قطان)و جگە لەوانیش کۆدەنگی ئەگوازنەوە دەربارەی ئەم بابەتە.

لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە، کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئیرجاء: "فَقَالَ: يَقُولُونَ الإِيمَان قَولٌ، وَنَحنُ نَقُولُ: الإِيمَانُ قَولٌ وَعَمَلٌ". واتە: دەڵێ: ئەوان دەڵێن: ئیمان وتەیە، ئێمە دەڵێین: ئیمان وتە و کردارە، وە دەڵێ: "وَالمُرجِئَةُ أَوجَبُ الجَنَّةَ لِمَن شَهِدَ أَن لَا إِلَهَ إِلَّا الله مُصِرّاً بِقَلبِهِ عَلَى تَركِ الفَرَائِض". واتە: موڕجیئەکان بەهەشت واجب دەکەن، بۆ ئەوانەی لە دڵیانەوە، بە یەقینی و سووربوونەوە، شایەتییان داوە لەسەر لا اله الا الله، لەگەڵ تەرککردنی فەرزەکان، وە دەڵێ: "وَسَمَّوا تَركَ الفَرَائِضِ ذَنباً بِمَنزِلَةِ رُكُوبِ المَحَارِمِ". واتە: وە بە تەرککردنی فەرزەکان دەڵێن تاوان و، لەئاستی تاوانە گەورەکان دایدەنێن، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت تاوانی گەورە و تەرکی فەرزەکان لەیەک ئاستدا سەیر ناکەن، وەک ئیمام دەڵێ: "وَلَيسَا بِالسَّوَاءِ؛ لِأَنَّ رُكُوبَ

**المَحَارِمِ مِن غَيرِ إستِحلَالٍ مَعصِيَّة، وَتَركُ الفَرَائِضِ مُتَعَمِّداً مِن غَيرِ جَهلٍ وَلَا عُذرٍ كُفرٌ".** واتە: وەك یەك نین؛ چونکە توشبوون بە تاوانی گەورە بەبێ بە حەڵاڵ دانان تاوانە، بەڵام تەرکی فەرزەکان بە ئەنقەست و بێ عوزری شەرعیی و نەزانی، کوفرە. ئەو عوزرانەش بۆ نموونە کەسی تازە موسڵمانبوو، یان لە بابەتی ڕۆژوودا بۆ کەسانی نەخۆش و بێ توانا، یان ئافرەتان کە تووشی ئەو حاڵەتە دەبن کە ڕۆژوویان لەسەر نابێ.

وە دەبینین لە بارەی ئادەم (عليه السلام) و ئیبلیس -لعنە اللە-، شتێک بەدیار دەکەوێ، ئەویش ئەوەیە، کە الله تعالی بە ئیبلیس دەفەرمووێ: سەجدە ببە بۆ ئادەم، سەجدەی ڕێز، بەڵام ئەو بە ئەنقەست سەجدەی نەبرد و، الله ناوی کافری لێنا، بەڵام ئادەم (عليه السلام) نەهی لێکرا لەوەی، لەو دارە بخوات، بەڵام لێی خوارد و بوو بە تاوانبار.

کەواتە: ئەهلی سوننەت وجەماعەت، تاوانی گەورە و تەرکی فەرز لەیەک جیادەکەنەوە.

لە بابەتی ئیماندا سێ گرووپ خۆیان پاڵداوە بۆ ئیسلام و، لەبارەی ئیمان قسەیان لەسەر هەیە:

یەکەم و دووەم: خەواریجەکان و موعتەزیلەکانن: (وەعیدییەکان)یشیان پێ دەوترێ، ئەمانە لەنێوان خۆشیاندا خیلاف و ڕاجیاوازییان هەیە دەربارەی ناوی ئیمان؛ ناوی ئیمان لە کەسانێک ئەستێننەوە، کە کوفر و شیرکیان نەکردووە،

بەڵکو تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن، ئەو ئایەتانەی کە دەربارەی ئەهلی کوفر هاتوون، دایدەبەزێنن بەسەر ئەهلی ئیماندا، بەڵام حەق ئەوەیە، کە ناوی ئیمان لە کەسانێک ناسەنرێتەوە، کە بە تەنها تاوانی گەورە دەکەن، جگە لە کوفر و شیرکی گەورە، وە ﷲ تعالی تەنها لەبارەی شیرک و کوفری گەورەوە دەفەرمووێت: (وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ)[٣٠]. واتە: وە ئەوەی کافربێ بە ئیمان و شەریعەت، ئەوە بێگومان کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوە و لە ڕۆژی دواییدا یەکێکە لە ڕەنج بێبەران و زەرەرمەندان. وە دەفەرمووێت: (لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ)[٣١]. واتە: ئەگەر شەریک و هاوبەش بۆ ﷲ دابنێیت، بەڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە، وە بێگومان لە زەرەرمەندان دەبیت.

جا عەقیدەی خەواریجەکان وابوو کە ئەهلی تاوانە گەورەکان بەکافر دەزانن، وە بە تاوانی گەورە موسڵمانی موەحیدی نوێژکەر لە دین دەردەکەن.

سێیەم: بە پێچەوانەی خەواریجەکانەوە، مورجیئەکان هەن: کە پێیان دەڵێن (وەعدییەکان)، ئەم گرووپەش بۆخۆیان چەند بەشێکن:

١- جەهمییەکان یان غولاتی ئیرجائن: ئەمان پێناسەی ئیمان دەکەن بە مەعریفەت و ناسینی دڵ بەتەنها، وە نەزانین و جەهل بەرامبەر بە ﷲ بە کوفر دەزانن.

---

(٣٠) المائدة: ٥.

(٣١) الزمر: ٦٥.

٢- کەڕرامییەکان: کە شوێنکەوتەی موحەممەدی کوڕی کەڕرامی سیجیستانی خۆڕاسانیین، ئەمان پێیان وایە ئیمان تەنها وتەی زوبانە، واتە بیروباوەڕ و کردار لە پێکهاتەی ئیمان دەکەنە دەرەوە، لای ئەمانە مونافیقەکانیش موسڵمانن. وە ئەو گرووپەش لەمرۆیا، پێیان وایە کەسێک خۆی بە موسڵمان بزانێ و بەخۆی بڵێ موسڵمان، ئیتر ئەوە موسڵمانە و هەرچییەکیش بکات!

٣- ئەشعەرییەکان بە تەواوی بۆچوونەکانیانەوە: ئەمانیش پێیان وایە کە ئیمان بەڕاستدانانی دڵە، هەتا ئەوان کرداری جەستە وبیروباوەڕی دڵیش لە ئیمان دەخەنە دەرەوە، بێگومان ئەمە وتەی زۆربەی ئەشعەرییەکانی ئەم سەردەمەیە، بەڵام هەبووە لە پێشینەکانیان وتوویانە: ئیمان وتەی زوبان و بیروباوەڕی دڵە، ئەمانەش کرداریان کردۆتە دەرەوە. کەواتە: تەواوی ئەشعەرییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کردار لە ئیمان دەکەنە دەرەوە، لایان وایە کەسێک تەواوی فەڕزەکانیش تەرک بکات، هەر بە ئەهلی ئیمانی دەزانن!

٤- گرووپێکی دیکە وەکو سەلەفی ساڵح دەڵێن: ئیمان بیرباوەڕ و، وتە و، کردارە. بەڵام پێیان وایە کردار لە کەماڵی ئیمانە، واتە کردار بە مەرجی دروستی ئیمان نازانن، بەڵکو بە مەرجی کەماڵێتی ئیمانی دەزانن، واتە دەڵێن گەر کاروکردەوەش بوونی نەبێ، ئیمان هەر بوونی هەیە، بەڵام گەر کردار هەبوو ئەوە باشترە و ئیمانەکە کامڵتر دەبێ!

٥- گرووپێکی دیکە مورجیئە کۆنەکانن، کە هەندێ لە خەلەف پێیان دەڵێن مورجیئەی فوقەهاء، حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان و، ئەبی حەنیفە و، جگە لەوانیش لە هاوەڵەکانیان لەسەر ئەو بیروباوەڕەن، کە دەڵێن ئیمان تەنها وتە و، بیروباوەڕە و، کردار بەشێک نییە لە ئیمان. بیرمان نەچێ تەواوی ئەو ڕەدد و وەڵامانەی، کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕەددی ئەهل ئیرجائیان پێدانەوە، مەبەستیان پێی ئەم مورجیئانە بووە، نەک ئەشعەرییەکان، چونکە ئەوان دواتر هاتن!

وەهەروەها ئەهلی سوننەت و جەماعەت: لایان وایە بیروباوەڕ و وتە و کردار، هەرسێکی پایەی ئیمانن و، بەبێ هیچ یەکێکیان ئەوانی دیکە سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت! وە لە ماوەی ڕابردوو باسکرا، بێگومان ئەوەش مەنهەجی حەقە.

## يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.(١)

---

(١) **يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.** واته: زیاد ئەکات و کەمیش ئەکات.

ئەمەش کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە کە دەڵێن ئیمان زیاد ئەکات و کەمیش ئەکات، وەکو ﷲ تعالی:

١- دەفەرموویت: (إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)(٣٢). واتە: بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن، کە کاتێ باسی ﷲ کرا و ناوی هێنرا، دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت، کاتێکیش ئایەتەکانی ﷲ بخوێنرێتەوە بە سەریاندا، بڕوایان زیاد دەبێت و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

٢- وە دەفەرموویت: (ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ)(٣٣). واتە: ئەوانەی کە خەڵکی پێیان دەوتن: بەڕاستی خەڵکیی (مەبەستی قوڕەیشە) لەشکر و کۆمەڵی زۆریان کۆکردۆتەوە لە دژتان، کەواتە بترسن لێیان،

---

(٣٢) الأنفال: ٢.

(٣٣) آل عمران: ١٧٣.

کەچی ئیمانداران بەمە باوەڕیان زیاد بوو، وە وتیان: هەر اللَّهُ مان بەسە، چەند پشت پێ بەستراوێکی چاکە.

ئەمە عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، کە ئیمان زیاد دەکات و کەمیش دەکات، بە پێچەوانەی بیروباوەڕی مورجیئەکانی سەرەتاوە، کە ئەوان بیروباوەڕیان وابوو، کە ئیمان زیاد ناکات و کەم ناکات، بەڵام بێگومان ئیمان بە گوێڕایەڵی اللَّهُ تعالی زیاد دەکات و، بە سەرپێچی اللَّهُ کەم ئەکات، بە بەڵگەی ئایەتەکان و فەرموودەکان.

## ٢- وَالْقُرْآنُ كَلَامُ اللَّهِ غَيْرُ مَخْلُوقٍ بِجَمِيعِ جِهَاتِهِ.(١)

(١) **وَالْقُرْآنُ كَلَامُ اللَّهِ غَيْرُ مَخْلُوقٍ بِجَمِيعِ جِهَاتِهِ.** واته: قورئان کەلامی (اللَّهُ تعالی)یە و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزێنراوە و، دروستکراو نییە، بە هەموو ڕووەکانییەوە.

قورئان: ناوە بۆ ئەو پەرتووکەی دابەزیوە بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ و، لە کەلامی (اللَّهُ)یە و، بەڵام هەموو کەلامی ئەو نییە، بەڵکو کەلامی تریشی هەیە جگە لە قورئان، کەلامی اللَّهُ وتەی خۆیەتی، وەکوو لە قورئاندا دەفەرمووێت:

١- (ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا)[٣٤]. واته: اللَّهُ جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە، قورئانێکە کە ئایەتەکانی لە یەکچووی دووپات کراوەن.

٢- وە دەفەرمووێت: (وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا)[٣٥]. واته: جا قسەی کێ لە قسەی اللَّهُ تعالی ڕاسترە. بۆیە قورئان وتەی (اللَّهُ تعالی)یە.

٣- وە دەفەرمووێت: (وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓا إِلَـٰهَيْنِ ٱثْنَيْنِ)[٣٦]. واته: اللَّهُ تعالی فەرمووی: دوو پەرستراو بۆ خۆتان دامەنێن.

---

(٣٤) الزمر: ٢٣.

(٣٥) النساء: ٨٧.

(٣٦) النحل: ٥١.

٤- وه دەفەرمووێت: (إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا)[٣٧]. واته: بێگومان ئێمه لەمەولا قورئانت بۆ دەنێرینه خوارەوە، که گوفتارێکی قورس و گرانه.

کەواته: ﷲ تعالی قسه دەفەرمووێت و، قسەی فەرمووە، به پیت و دەنگ، بەڵام پیت و دەنگی ﷲ تعالی مەخلووق نییه، وەکو چۆن زاتی ﷲ تعالی له هیچ دروستکراوێکی ناچێ، بەهەمان شێوه ناو و سیفەتەکانیشی له ناو و سیفەتی هیچ کەسێک ناچێت، لەو سیفەتانه: سیفەتی قسەکردنی (ﷲ تعالی)یه، وەهەروەها وەکو وتمان: **(لَا يَختَصُّ بِالقُرآن)**. واته: کەلامی ﷲ تایبەت نییه به قورئان به تەنها، هەموو ئەو پەرتووکانەی دیکه، که دابەزیوەته سەر پێغەمبەرانی خوای تعالی -عَلَى نَبِيِّنَا وَعَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام- هەموو ئەوانه کەلام و وتەی خوای پەروەردگارن، کەلامی ﷲ بۆ فریشتەکانی، ئەوانەی دەیانەوێ قسەی لەگەڵ بکەن، وە بۆ ئەو مەخلووقانەی که ﷲ ویستی لێیه قسەیان لەگەڵدا بکات، هەموو ئەوانه کەلامی (ﷲ تعالی)ن.

بۆچی سەلەف له بابەتی بیروباوەڕدا قورئانیان تایبەتکردووە و دەڵێن کەلامی (ﷲ تعالی)یه؟

له وەڵامدا دەتوانین بڵێین: لەبەر ئەو بیدعه کوفرییەی که له سەردەمی سەلەفدا دروستبوو، که خەڵکانێک هاتن ئەوەیان ڕەتکردەوە که قورئان کەلامی ﷲ تعالی بێت و وتیان مەخلووقه، بۆیه دەبینین کۆدەنگی سەلەف و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوەیه، که قورئان: کەلامی

(٣٧) المزمل: ٥.

(ﷲ تعالى)یە و، سیفەتی ﷲ تعالی یە و، مەخلووق نییە، وە پەروەردگارمان بە دەنگ و پیت قسەی فەرمووە بە قورئان.

ئەو پەروەردگارەی ئێمە دەیپەرستین، خاوەن کەلامە و بە دەنگ و پیت قسە دەکات، وەکو چۆن تەواوی سیفەتەکانی دیکەی وەکوو: (سَمع، بَصَر، وَجە، رَحمَة، قُدرَة، غُفرَان، بُغض.. إلَخ). واتە: بیستن و، بینین و، ڕووی پیرۆزیی و، ڕەحمەت و، توانا و، لێخۆشبوون و، ڕقلێبوونەوە.. تاد، لە سیفەتی هیچ کەس و مەخلووقێک ناچێت، بە هەمان شێوەش سیفەتی قسەکردنی ﷲ تعالی لە هی هیچ کەسێک ناچێت.

بێگومان ئەمە بنەمایەکە لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی هاوەڵان و تابیعی و تابیعی تابیعییەکان و هەموو شوێنکەوتووانی سەلەفی ساڵحە هەتا ڕۆژی قیامەت، وە کۆدەنگی هەموو زانایان لە هەموو شار و وڵاتەکان دروستبووە لەسەر ئەوەی: قورئان کەلامی (ﷲ تعالی)یە و، کەلامی (ﷲ)ش دروستکراو نییە.

هەروەکو بە دەق لە ئیمامی مالیک، سوفیانی سەوری، سوفیانی کوڕی عویەینە، حەممادی کوڕی زەید، ئیبنو موبارەک، ئیبن مەهدی، وەکیع، شافیعی، موزەنی.. جگە لەوانیشەوە هاتووە، کە قورئان کەلامی (ﷲ تعالی)یە و مەخلووق نییە. وە تەنانەت لەعنەتیان دەکرد لەوانەی دەیانوت قورئان مەخلووقە و کەلامی ﷲ نییە.

ئەم فیکرەیە لە مەجالیسەکانی نەیسابوردا بڵاوبوویەوە، لەوانەی کە هەڵگری بوون: زەعفەرانی و، جەهمی کوڕی سەفوان بوو لە خۆڕاسان، وە کاتێکیش کە کوژرا، خەڵک زۆر دڵخۆش بوون بە کوشتنی، لەبەر ئەوەی هەڵگر و داهێنەری کۆمەڵێک بیدعەی کوفریی بوو. بۆیە شافیعی و ئەحمەد و ئەبو سەور و جگە لەوانیش کۆدەنگی دەگوازنەوە، کە لە ناو هاوەڵان و جگە لەوانیش، هیچ کەسێک هەڵگری ئەم بیروباوەڕە کوفرییە نەبووە، کە پێی وابووبێ قورئان دروستکراوە و کەلامی ألله نییە، بەڵکو لە تەفسیری ئایەتی: (قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ)[٣٨]. ئیبنو عەبباس ﷺ -گەورە ڕاڤەکاری قورئان- فەرموویەتی: **"غَيْرُ مَخلُوقٍ"**. واتە: دروستکراو نییە.

ڕیوایەتکراوە لە عەمری کوڕی جەمیعەوە، لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە، لە ئیبن عەبباسەوە، لە جگە لەوانیشەوە ڕیوایەتکراوە، کە قورئان کەلامی ألله تعالی یە و مەخلووق نییە.

لەناو تابیعییەکانیش ناژمێردرێ، دیسان لەناو تابیعی تابیعییەکانیش ناژمێردرێ، کە هەموویان لەسەر ئەو بیروباوەڕە پاکەبوونە، وەکو ئیمام فەزلی کوڕی دوکەین دەڵێ: **"أَدرَكتُ النَّاسَ مَا تُكَلِّمُونَ فِي هَذَا وَلَا عَرَّفنَا هَذَا إِلَّا بَعدَ مُنذُ سَنَتَينِ"**. واتە: گەشتم بە زۆرێک خەڵکی لە سەلەف، هیچ کەسێک هەڵگری ئەم بیروباوەڕە نەبوو، ئیللا دوای ئەوە دوو ساڵە.

---

(٣٨) الزمر : ٢٨.

تەنها جەهمی کوڕی سەفوان و شوێنکەوتووەکانی نەبێ، کە لایان وابوو ﷲ قسە ناکات، وە ئەو قورئانە کەلامی ﷲ نییە و قسەی پێ نەکردووە، گەر کەلامی (ﷲ)ش بێت، ئەوە مەخلووقە، پەنا بە ﷲ!

بێگومان ئەم بابەتە بابەتێکی زۆر گرنگە و، بنەمایەکە لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، چونکە دەڵێ: **"وَالْقُرْآنُ كَلَامُ اللَّهِ غَيْرُ مَخْلُوقٍ بِجَمِيعِ جِهَاتِهِ"**. لەبەرئەوەی لەوازیمی ئەو بیروباوەڕەی، کە پێیان وایە قورئان دروستکراوە، کوفرە، بێگومان کۆمەڵێک لەوازیم و شتی پەیوەست بەو بیروباوەڕەوە هەیە، کە کوفرە و سەردەکێشێ بۆ ئیلحاد و مولحیدبوون، بەوەی بەرەو ئەوە بڕۆن بڵێن: (ﷲ)ش مەخلووقە، پەنا بە ﷲ تعالی!

بۆیە کە ئەم دوو ئیمامە دەڵێن **"بِجَمِيعِ جِهَاتِهِ"**. واتە: بە تەواوی ڕووەکانی قورئان کەلامی (ﷲ تعالی)یە، واتە هەریەک لە ئەحواڵ و ئەوسافی قورئان لە ڕووی:

١- **(حِفظ)** لەبەرکردن: بەوەی ئەوەی لەبەر دەکرێت و لە سینگدا جێگیر دەبێت، ئەوە کەلامی (ﷲ تعالی)یە و دروستکراو نییە.

٢- **(تِلَاوَة)** خوێندنەوە: ئەوەی دەخوێندرێتەوە، کەلامی (ﷲ تعالی)یە و دروستکراو نییە.

٣- **(سَمع)** بیستن: ئەوەی دەبیسترێ لە قورئان، کەلامی (ﷲ تعالی)یە و دروستکراو نییە.

٤- **(نَظَر)** ئەوەی کە سەیر دەکرێت: کەلامی (اللّٰه تعالى)یە و دروستکراو نییە.

٥- **(كِتَابَة)** ئەوەی کە دەنوسرێت: کەلامی (اللّٰه تعالى)یە و دروستکراو نییە.

بۆیە ئەو قەیدە، کە ئەم دوو ئیمامە هێناویانە، قەیدێکی زۆر گرنگە، کە دەڵێن **"بِجَمِيعِ جِهَاتِهِ"**، تاکو ئەو گرووپەی کە -إن شاء الله- باسیان دەکەین و پێیان دەوترێ **(اللَّفظِيَّة)**، دەربچێت لەم بیروباوەڕە، چونکە هەندێ گرووپ هەیە، دەڵێن قورئان مەخلووق نییە، بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە نا، بەڵکو دەڵێن لە هەندێ ڕووەوە مخلووقە، پەنا بە اللّٰه!

بۆیە:

١- ئەوەی کە دابەزیوە قورئانە، وەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا)[٣٩]. واتە: بێگومان ئێمە قورئانمان بۆ ناردوویتە خوارێ، بە ناردن و بەش بەش.

بێگومان ئەو قورئانەی کە دابەزیوە، دروستکراو و مەخلووق نییە.

٢- ئەوەی کە دەخوێندرێتەوە قورئانە، وەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێت: (فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ)[٤٠]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! ئەی باوەڕدار! کاتێ ویستت قورئان بخوێنی، پەنا بگرە بە اللّٰه.

---

(٣٩) الإنسان: ٢٣.

(٤٠) النحل: ٩٨.

کەواتە ئەوەی کە دەخوێندرێت قورئانە و، دروستکراو نییە.

٣- ئەوەی کە دەبیسترێت قورئانە، وەک اللَّهُ تعالی دەفەرمووێت: (وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ)[٤١]. واتە: وە ئەگەر کەسێك لە هاوبەشدانەران و موشریکان داوای هاوسێیەتی و پەنادانی لێکردیت، ئەوە پەنای بدە، تاکو وتەی اللَّهُ دەبیستێ، کە قورئانەکەیەتی. وە دەفەرمووێت: (وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا لَهُۥ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ)[٤٢]. واتە: وە کاتێك کە قورئان خوێندرا، دەبێ گوێی لێبگرن و بێدەنگیشبن، بۆ ئەوەی اللَّهُ میهرەبانیتان لەگەڵدا بکات و ڕەحمتان پێبکات.

٤- ئەوەی لە ناو دڵەکاندا دەمێنێتەوە و لەبەر دەکرێت قورئانە، وەک اللَّهُ تعالی دەفەرمووێت: (بَلْ هُوَ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا ٱلْعِلْمَ)[٤٣]. واتە: نەخێر وانییە کە گومان دەبەن، بەڵکو قورئان نیشانەکانی ئاشکران، لە دڵ و دەروونی کەسانێکدایە، کە زانستیان پێدراوە. وە هەموو ئەوانەی لە سینگەکاندا جێگیرکراون و لە بەرنامە و لاپەڕەکاندا نووسراون هەمووی (إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَـٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾)[٤٤]. واتە: کە

---

(٤١) التوبة: ٦.

(٤٢) الأعراف: ٢٠٤.

(٤٣) العنكبوت: ٤٩.

٤٤ الواقعة: ٧٧ و ٧٨.

بێگومان ئەمە قورئانێکی گەورەو بەڕێزە ﴿٧٧﴾ لەناو کتێبێکی شاراوەدایە کە (لَوحُ المَحفُوظ)ە ﴿٧٨﴾). وە دەفەرمووێت: (وَكِتَـٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ﴿٣﴾)، واتە: وە بە کتێبی نووسراو ﴿٧٧﴾ لە پێستی تەنکی بڵاوکراوە﴿٧٨﴾). هەموو ئەوانە کەلامی (ٱللَّهُ تعالی)یە و مەخلووق نییە، وە ئەوەشی تەدەببوری دەکرێ و لەناو دڵەکاندایە، کەلامی (ٱللَّهُ تعالی)یە و مەخلووق نییە. (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ)[٤٥]. واتە: ئایا ئەوانە ورد نابنەوە لە قورئان و تێی ناگەن؟ وا نییە بەڵکو دڵیان قوفڵی لێدراوە.

کەواتە: بە تەواوی ڕووەکانی کە ئەو پێنج خاڵە بوو، قورئان کەلامی (ٱللَّهُ تعالی)یە و مەخلووق نییە.

هاوەڵان و، تابیعی و، تابیعی تابیعین و، ئەهلی سوننەت و جەماعەت کۆدەنگن لەسەر ئەوەی قورئان بە هەموو ڕووەکانییەوە کەلامی (ٱللَّهُ تعالی)یە.

دەبینین گرووپ و ڕێچکە گەلێک موخالیف و دژی ئەهلی حەقن دەربارەی بابەتی قورئان، ئەوانیش:

یەکەم: جەهمییەکان و موعتەزیلەکانن: (الَّذِينَ يَقُولُونَ بِخَلقِ القُرآنِ وَبِخَلقِ كَلَامِ الله). واتە: ئەوانەن کە دەڵێن قورئان مەخلووقە و، کەلامی

---

(٤٥) محمد: ٢٤.

(ﷲ تعالى)ش مەخلووقە. وەکو چۆن ئاسمان و زەوی و دار و بەرد مەخلووقن.

بێگومان جەهمییەکان کوفریان زۆرە، وەک سەلەف دەڵێن نزیکەی حەفتا کوفریان هەیە، کە (السَّبعِينِيَّة)ی پێ دەوترێت، وە ئەوان بیروباوەڕیان وا نییە کە ﷲ لە ئاسمان بێت.

وە بە هەندێ شوبهە لایان وایە کە قورئان مەخلووقە، پەنا بە ﷲ، ئەوان ئەڵێن:

١- ﷲ فەرموویەتی: (ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ)[٤٦]. واتە: ﷲ بەدیهێنەری هەموو شتێکە. دەڵێن: قورئانیش شتە، ﷲ ش دروستکەری هەموو شتێکە، کەواتە: قورئان دروستکراوی (ﷲ تعالی)یە.

بێگومان ئەم قسەیە بەتاڵە، چونکە: ﷲ دەفەرموێت: (كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ)[٤٧]. واتە: هەموو خاوەن گیان و ڕۆحێک مردن دەچێژێ. لەهەمان کاتیشدا ﷲ تعالی نەفسی جێگیر کردووە بۆ خۆی، ئایا دەوێریت بڵێیت (ﷲ تعالی)ش ئەمرێ؟ پەنا بە ﷲ.

---

(٤٦) الزمر: ٦٢.
(٤٧) آل عمران: ١٨٥.

وه دەفەرمووێت: (قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ ٱللَّهُ)[٤٨]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: شایەتیدانی چ کەس و شتێک لە هەموو شایەتیدانێك گەورەترە لەسەر پێغەمبەرێتی من؟ وە بڵێ: اللَّهُ گەورەترین شایەتە. اللَّهُ تعالى بە شت باسی خۆیی کرد، ئایا دەوێریت بڵێیت (اللَّهُ)ش دروستکراوە؟ پەنا بە اللَّهُ.

تەبعەن گومڕایی و کوفری جەهمیی و موعتەزیلەکان لەوکاتەوە دەرکەوت، کە موناقەشەیان لەگەڵ فەلاسیفەکان دەکرد و، بە ئەقڵێکی لاواز و نەقڵێکی لاوازەوە وەڵامی ئەوانیان دەدایەوە، چونکە ئەوان هەڵگری نەقڵێکی دروست نەبوون، کە لە ئایەت و فەرموودەکانەوە بێت، لە هاوەڵان و دوای ئەوانیش لە ئەهلی حەق.

٢- اللَّهُ فەرموویەتی: (إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا)[٤٩]. واتە: بەڕاستی ئێمە قورئانمان بە عەرەبی داناوە. دەیانوت: (جَعَلْنَٰهُ) بەواتای: **(خَلَقنَاهُ)** دێت.

بێگومان ئەم گومانەشیان بەتاڵە لەبەرئەوەی وشەی **(جَعل)** لە قورئاندا لە هەموو شوێنێکدا بەواتای **(خَلق)** نایەت، دەبینین بەچەند واتایەک هاتووە، لەوانە:

---

(٤٨) الأنعام: ١٩.

(٤٩) الزخرف: ٣.

١- اللَّهُ تعالى دەفەرموویت: (وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ)[٥٠]. واتە: سوێندەکانتان بە اللَّهُ مەکەن بە کۆسپ و بەرهەڵستی ئەو شتانەی سوێندتان لەسەری خواردووە لە کارە چاکەکان تاکو نەیکەن. لێرەدا ئەسڵەن بە واتای (خَلق) نایەت.

٢- وە دەفەرموویت: (وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا)[٥١]. واتە: لە کاتێکدا اللَّهُتان کردووە بەشایەت و چاودێر بەسەر خۆتانەوە. ئەم ئایەتە بەواتای ئەوە نایەت، کە اللَّهُ دروستی کردوون بە کەفیل.

٣- وە دەربارەی ئەهلی شیرک دەفەرموویت: (وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ)[٥٢]. واتە: هاوبەشانێکیان بڕیارداوە بۆ اللَّهُ، کە جنۆکەن، خۆ لەهەمان کاتدا مرۆڤەکان کرداری دروستکردن ناکەن، واتە خەلق ناکەن.

٤- وە دەفەرموویت: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا)[٥٣]. واتە: ئەو پەروەردگارەی کە زەوی بۆ ڕاخستوون. لێرەدا (جَعل) بە واتای: (صَيَّرَه) دێت، واتە: بۆی فەراهەم کردوون.

٥- وە دەفەرموویت: (وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ)[٥٤]. واتە: وە تاریکییەکان و ڕووناکی داناوە. لێرەدا (جَعل) بە واتای: (أَوجَدَ) دێت، واتە: بەدیهێناوە.

---

(٥٠) البقرة: ٢٢٤.
(٥١) النحل: ٩١.
(٥٢) الأنعام: ١٠٠.
(٥٣) البقرة: ٢٢.
(٥٤) الأنعام: ١.

٦- جاری وا هەیە (جَعل) بە واتای دەرهێنانی شتێک دێت لە شتێکی تر، وەک ﷲ تعالی دەفەرموویت: (وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ)[٥٥].
واتە: وە لە ژن و هاوسەرەکانتان کوڕ و نەوەی بۆ فەراهەم هێناون.

کەواتە: ئێمە ئەگەر بە تەنها (جَعل) بە (خَلق) تەفسیر بکەین، دەکەوینە ناو ئەو گومڕاییەی کە جەهمییەکان و موعتەزیلەکانی تێکەوتووە.

بێگومان جەهمییەکان گرووپێکی کوفریی کافرن، وە سەلەف کۆدەنگییان لەسەر کافرێتی ئەوان هەبووە، وە جەهمییەکان بۆ خۆیان دەکرێن بە سێ گرووپەوە:

١- جَهمِيَّةُ الخَلقِيَّة: ئەوانەن کە وتیان قورئان مەخلووقە و، باسیانکرا.
٢- جَهمِيَّةُ الوَاقِفِيَّة: ئەوانەن کە دەڵێن: قورئان کەلامی ﷲ تعالی یە و بێدەنگ دەبن، نە دەڵێن دوستکراوە، نە دەڵێن دروستکراو نییە، ئەم گرووپەش کاتێک دروستبوون، کە فیتنەی گەورەی خەلقی قورئان دروستبوو، ئەمان بەحیساب لە ڕەددی ئەواندا دروستبوون و، بەحیساب لە نێوان جەهمییەکان و ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا نێوەندگیرییان دەکرد، بەڵام بێگومان سەلەف لەسەر ئەم گرووپە زۆر زۆر توندبوون، بەڵکو هەندێکییان بە خراپتر لە جەهمییەی خەلقییە وەسفیان دەکردن و، جیاوازییان نەدەکرد لە نێوانیاندا، چونکە وەستان لەبەردەم حەقێکی ئاوهادا، سەرەنجامی کەوتنە ناو چاڵی خەلقییەتی قورئانە، پەروەردگار

(٥٥) النحل: ٧٢.

ئێمه و ئێوەش بپارێزێ. ئەم گرووپە سەلەف زۆر زۆر لەسەریان توندبوون، بەتایبەت ئیمام ئەحمەد و، ئیسحاق و، قوتەیبەی کوڕی سەعید و، عوسمانی کوڕی ئەبو شەیبە و، موحەممەدی کوڕی موقاتیل.. تاد، لەسەریان زۆر توند بوون و بە گرووپێکی جەهمییەت ناویان دەهێنان.

٣- **جَهمِيَّةُ اللَّفظِيَّة: (الَّذِينَ يُقُولُونَ لَفظُنَا بِالقُرآنِ مَخلُوق)**. واتە: ئەوانەی کە دەیانگوت لەفز و گۆکردنمان بە قورئان مەخلووقە. ئەم بیدعەیە لە ئەسڵدا کەڕابیسی و داوودی کوڕی عەلی ئەسبەهانی زاهیری دایانهێنا، بێگومان پێشەوایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وەک شافیعی و، زوهری و، ئەحمەد و، ئیسحاق و، ئەبی عوبەید و جگە لەوانیش ڕەددیان دایەوە و لەفزییەیان بە جەهمییە ناودەبرد. لەفزییە بیروباوڕیان وابوو کە لەفزیان بە قورئان مەخلووقە، بەڵام ئەهلی حەق، ئەهلی سوننەت و جەماعەت، سەلەفی ساڵحمان ئەم دەرگایەیان داخستووە؛ چونکە گەر ئەم دەرگایە بکرێتەوە سەرەنجامەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جەهمییەت!

کەواتە: جەهمییەت بە تەواوی گرووپەکانیانەوە پێیان وایە قورئان مەخلووقە و اللَّهُ تعالی قسە ناکات.

دووەم: ئەشعەرییەکان و کوللابییەکان: ئەمانەش دەڵێن: قورئان کەلامی اللَّهُ تعالی یە، بەڵام کەلامێکی نەفسیی کۆن دەدەنە پاڵ اللَّهُ، کە بە خودی

خۆیەوە ڕاوەستاوە، پێیان وانییە پەروەردگار بە دەنگ و پیت قسە بکات، پێیان وایە الله خاوەنی قسەکردنە، بەڵام قسەکردنێک کە لەناو نەفسی خۆیدایە، هەرکات بیەوێت قسە بکات، قسەکە دەخاتە ناو نەفسی ئەو کەسەشەوە، بەبێ دەنگ و پیت، کە ئەمە لە بنەڕەتدا بیروباوەڕی کوللابیەکانە، ئەوان ئەم بیروباوەڕەیان داهێنا، پاشانیش ئەشعەری ئەوەی لە ئیبنو کوللابەوە وەرگرت، ئەم بیروباوەڕە سەقەت و خراپە، ئەسڵەن موخالیفە و پێچەوانەی زمانی عەرەبیشە، چونکە گەر عەرەب و عەجەم بە کافر و موسڵمانیشیانەوە بگەڕێیت و پێیان بڵێیت: کەلام چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: **(هُوَ مَا كَانَ بِالحُرُفِ وَالصَّوت)**. واتە: کەلام کاتێک کەلامە، کە دەنگ و پیتی لەگەڵدا بێت. گەر دەنگ و پیتی لەگەڵدا نەبێت، ئەسڵەن پێی ناوترێ کەلام، بەڵام ئیبنو کوللاب بیدعەی کەلامی نەفسیی داهێنا، ئەمەی لە وەڵامی فەلاسیفەکان داهێنا، ئەوان دەیانوت: زاتێک قسە بکات، پێویستی بە تەئلیف و تەڕکیب و حەڕەکە و سکون و کۆمەڵێک شتە. ئەوان لەو گۆشەیەوە قسەیان دەکرد، کە هەر سیفەتێک بدرێتە پاڵ الله تعالی، ئەوە مەبەست پێی شوبهاندی الله تعالی یە بە مەخلووق، بۆیە ناچار بیدعەیان دادەهێنا، بە حیساب تا نەکەونە ناو چاڵی تەشبیهەوە، بێئاگا لەوەی دەکەونە ناو چاڵی قوڵتر لەوە، کە ئەویش چاڵی تەعتیل و تەحریفی واتاکانی سیفەتە بەرزەکانی الله تعالی یە و، لادانە لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

کەواتە لە ئەسڵدا ئەشعەرییەکان دەڵێن: قورئان کەلامی (اللّٰه تعالی)یە، بەڵام ئەوان پێیان وانییە، کە ئەو پەروەردگارەی خەڵک دەیپەرستن و، ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەیپەرستن، قسە بکات بە قسەکردنێک، کە دەنگ و پیتی لەگەڵدا بێت، بەڵکوو پێیان وایە ئەو قسەکردنە لەناو نەفسی خۆیایەتی و خستویەتییە ناو دڵی جبریل، ئەویش هێناویەتی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

هەندێ لە ئەشعەرییەکان بە تایبەت دواییینەکانیان، پێیان وایە ئەو موسحەفە، واتە ئەو قورئانەی لەبەردەستماندایە و دەخوێنرێتەوە و اللّٰه تعالی بە عەرەبی دایبەزاندووە، گێڕانەوەیەکە بۆ کەلامی نەفسیی اللّٰه و، لە ئەسڵدا کەلامی اللّٰه نییە. بێگومان لە سەرەنجامدا بیروباوەڕی ئەشعەرییەکان و کوللابییەکان جیاوازییەکی ئەوتۆی نابێ لەگەڵ جەهمییەکان و موعتەزیلەکان، سەرەنجام ئەوانیش بیروباوەڕیان بە پەروەردگارێک نییە، کە بە دەنگ و پیت لەگەڵ موسادا ﷵ قسەی کردبێت، یان لەگەڵ پێغەمبەر موحەممەددا ﷺ، کاتێک میعڕاجی پێکرا، وە لەگەڵ فریشتەکان و ئەهلی ئیمان لە قیامەتدا، کە ئەوە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە؛ پێمان وایە اللّٰه تعالی بە دەنگ و پیت قسەی کردووە و قسە دەکات، بەڵام جیاوازە لە مەخلووق و تایبەتە بە زاتی خۆی، پاکوبێگەردە لە شوبهاندن و لاوازیی، کەلامی پەروەردگار مەسموعە، واتە بە گوێی سەر دەبیسترێ، هەروەک موسا ﷵ بە گوێی سەر کەلامی پەروەردگاری بیست و، پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوێی سەر کەلامی پەروەردگاری بیست، کە میعڕاجی پێکرا، ئەمە بیروباوەڕی پاکی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و،

شوێنکەوتەی سەلەفی ساڵحە، بە پێچەوانەی گرووپە گومڕاکان، لە جەهمییەکان و شوێنکەوتەکانیان، کە پێیان وایە ﷲ تعالى لەگەڵ بەندەکانیدا قسە ناکا، بە قسەکردنێک کە بە گوێیەکان ببیسترێ.

بۆیە وەك دەبینین: جەهمییەکان و موعتەزیلەکان پیرۆزی و زاتی ﷲ یان نەهێشتووە، بەوەی کە پێیان وایە بە هیچ شێوەیەک قسە ناکات، بۆیە قورئان لای ئەوان موقەددەس نییە!

هەرچی کوللابی و ئەشاعیرەکانن، ئەوە پیرۆزی و قودسییەتی پیت و واتای قورئانیان نەهێشتووە، چونکە ئەوان پێیان وایە: ﷲ لە بنەڕەتدا قسە دەکات، بەڵام ئەو قورئانەی کە لەبەردەستماندایە و لەناو سینگەکاندایە و دەبینرێ و دەبیسترێ، (عیبارەت)ە، یان هەندێکیان دەڵێن: (حیکایەت)ە لە کەلامی نەفسیی ﷲ تعالى، چونکە ﷲ لای ئەوان خاوەنی سیفەتی کەلامی نەفسییە، نەک کەلامێک، کە بە گوێیەکان ببیسترێ.

بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت و، ئەوانەی شوێنکەوتەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن: **(أَثْبَتُوا لَهُ مَعَانِيَهُ وَمَبَانِيَهُ)**. واتە: قورئان، چ مەعانییەکانی و چ مەبانییەکانی، بۆ خوا جێگیر دەکەن.

ﷲ تعالى، لە چەندین شوێنی قورئاندا، قورئانی بە کەلامی خۆی ناوبردووە، وەکوو ﷲ دەفەرموێت: (وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا

لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ)[٥٦]. واتە: وە ئەگەر دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت، دوای ئەو زانینەی، کە لە اللَّهُ ەوە بۆت هاتووە، هیچ سەرپەرشتیکەر و یاریدەدەرێکت نابێ لەلایەن اللَّهُ وە.

کەواتە: قورئان زاستی (اللَّهُ تعالی)یە، زانستی (اللَّهُ تعالی)ش سیفەتی ئەوە.

کەواتە لەوازیم و پێویستیەکانی وتەی: قورئان مەخلووقە، ئەوەیە بوترێ: زانستی اللَّهُ ش مەخلووقە، کە بێگومان عیلمی اللَّهُ تعالی مەخلووق نییە، بەڵکو سیفەتی بەرزی خۆیەتی و، بە زاتی خۆیەوە قائیم و ڕاوەستاوە.

لازمێکی دیکە لەم بیروباوەڕە پیسە ئەوەیە: تەواوی سیفەتەکانی اللَّهُ تعالی بکرێت بە مەخلووق، پەنا بە اللَّهُ!

دەیان فەرموودەمان هەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: اللَّهُ تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا قسە لەگەڵ ئەهلی ئیمان و بەهەشتییەکاندا دەکات و، بەهەشتیەکان گوێیان لە دەنگی پەروەردگاریان دەبێت.

ئەم پوختەیەی باسکرا کۆدەنگی بیروباوەڕی سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، دەربارەی قورئان، کە کەلامی اللَّهُ تعالی یە، کەلامێک، کە خاوەنی دەنگ و پیتە و، لە دەنگ و پیتی هیچ کەسێک ناچێت و، پاکوپیرۆزە و، بەرز و بێنیازە لەوەی لە هی هیچ دروستکراوێکی بچێت.

---

(٥٦) البقرة: ١٢٠.

ئەو پەروەردگارەی کە موسڵمانان و ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەیپەرستن، قسەی کردووە و دەیکات، هەرکاتێک بیەوێت و لەگەڵ هەرکەسێک بیەوێت. بە پێچەوانەی بیروباوەڕی جەهمییەکان و موعتەزیلەکان و ئەشعەرییەکان و کوللابییەکان و ماتوریدییەکان، کە خۆیان دەدەنە پاڵ ئەهلی سوننەت و جەماعەت، حاشا! دوورن لەو بیروباوەڕەی کە هاوەڵان و شوێنکەوتەکانیان لەسەری بوون، بەڵکو ئەوانە بەشێکن لە شوێنکەوتەی جەهمییەکان و شوێنکەوتەکانیان؛ چونکە بیروباوەڕیان وانییە اللّٰه قسەی کردبێت لەگەڵ ئەو دروستکراوانەی کە باسکراوە قسەی لەگەڵیان کردووە، پەنا بە اللّٰه تعالی.

## ٣- وَالْقَدَرُ خَيْرُهُ وَشَرُّهُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.[١]

---

(١) **وَالْقَدَرُ خَيْرُهُ وَشَرُّهُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ**. واتە: قەدەر، خێری و شەڕی لەلایەن (الله تعالى)وەیە.

باس و بابەتێکی تر لەو کۆدەنگییانەی کە سەلەفی سالْح و، ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لەسەرە، بریتییە لە: باوەڕبوون بە قەدەر، خێری و شەڕی. باوەڕبوون بە قەدەر لە پایەکانی ئیمانە، ئیمانی هیچ کەس سەحیح نییە، تاکو باوەڕ بە قەدەر نەهێنێت، مەبەستیش لە باوەڕبوون بە قەدەر بریتییە لە: باوەڕبوون بە زانست و کیتابەتی الله تعالى، بە هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویانداوە و ڕوودەدەن، ئەمەش بە ویستی (الله تعالى)یە، الله سبحانه وتعالى خۆی هەموو شتێکی خەلق کردووە و، مەقادیری خەلقی کردووە و، ئەندازەگیری بۆ کردووە، پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، وەکوو الله تعالى:

١- دەفەرموێت: (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَـٰهُ بِقَدَرٍ)[٥٧]. واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروست کردووە.

٢- وە دەفەرموێت: (فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَـٰدِرُونَ)[٥٨]. واتە: ئینجا ماوەمان بۆ دانا، بێگومان ئێمە چاك ئەندازەگیرین.

---

(٥٧) القمر: ٤٩.

٣- وه دەفەرمووێت: (وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ)[٥٩]. واتە: وە هیچ شتێك نییە مەگەر خەزێنەکانی لای ئێمەیە و، نایئێرین و نایدەین، بە ئەندازەی دیاریکراو نەبێت.

٤- کاتێک جبریل عليه السلام پرسیاری ئیمانی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: "أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، خَيْرِهِ وَشَرِّهِ"[٦٠]. واتە: ئیمان بریتییە لەوەی: باوەڕبهێنیت بە: الله تعالی و فریشتەکانی و پەرتووکە ئاسمانییەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و، باوەڕبهێنیت بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە. شەشەم پایە لە پایەکانی ئیمان، پایەی باوەڕبوونە بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە.

٥- لە [سنن الترمذي]دا، لە (جابری کوڕی عبدالله)وە هاتووە رضي الله عنه، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە دەفەرمووێت: "لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ"[٦١]. واتە: هیچ کەسێک ئیمانی نییە، تاکو ئیمان بە قەدەر دەهێنێت، بە خێر و شەڕیەوە. وە "مَنْ مَاتَ عَلَى غَيْرِ هَذَا فَلَيْسَ مِنِّي"[٦٢]. واتە: هەرکەسێک لەسەر جگە لەمە بمرێت، ئەوە لە من نییە.

---

(٥٨) المرسلات: ٢٣.
(٥٩) الحجر: ٢١.
(٦٠) سەحیحی موسلیم: ٨.
(٦١) جامیعی تورمزی: ٢١٤٤.
(٦٢) سونەنی ئەبو داوود: ٤٧٠٠.

٦- يەكێكی دیكە لەو فەرموودانە، ئیمامی ئەبو داوود و جگە لەویش ڕیوایەتیان كردووە، لە فەرموودەی عوبادەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، دەفەرمووێت: "لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ، يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ بَعَثَنِي بِالْحَقِّ، وَيُؤْمِنُ بِالْمَوْتِ، وَبِالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَيُؤْمِنُ بِالْقَدَرِ"[٦٣]. واتە: مرۆڤ باوەڕی نییە، تاكوو باوەڕی بە چوار شت نەبێت، شایەتی بدات بەوەی: هیچ پەرستراوێكی بە حەق بوونی نییە جگە لە الله تعالی، كە پەرستراوی بەحەققە، وە من پێغەمبەری ئەو خوایەم، كە ناردوومی بەحەق، وە باوەڕی بە مردن هەبێت، كە لەلایەن (الله تعالی)وەیە، باوەڕیشی بە زیندووبوونەوەی دوای مردن هەبێت، باوەڕیشی بە قەدەر هەبێت، ئەوكات باوەڕدارە. كەواتە باوەڕبوون بە قەدەر، بێگومان لە پایەكانی ئیمانە، بەبێ باوەڕبوون بە قەدەر؛ ئیمان بوونی نییە و سەحیح نییە.

٧- طاوس دەڵێ: "أَدرَكتُ ثَلَاثُ مِئَةٍ مِن أَصحَابِ رَسُولِ الله يَقُولُونَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَر". واتە: گەیشتووم بە سێ سەد كەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتوویانە: هەموو شتێك بە قەدەرە.

٨- أَبُو أَسوَد الدِّيلي دەڵێ: "مَا رَأَينَا أَحَداً مِن أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ لَا يُثبِتُ القَدَر". واتە: هیچ یەكێك لە هاوەڵەكانی پێغەمبەری خوامان ﷺ نەبینیوە، كە باوەڕی بە قەدەر نەبێت و جێگیری نەكات.

---

[٦٣] جامیعی تورمزی: ٤١٢٥.

٩- زوهری له ئیبن عەبباسەوە ڕیوایەت دەکات و دەڵێ: "**تَكْذِيبُ الْقَدَرِ نَقضٌ للتَّوحِيد**". واته: باوەڕنەبوون بە قەدەر و بەدرۆ خستنەوەی، هەڵوەشێنەرەوەی تەوحیدە. ئەوەی باوەڕی بە قەدەر نییە، تەوحیدیشی نییە و هەڵوەشاوەتەوە.

بۆیە لە هاوەڵان و تابیعیەکان، کە بەحەق شوێنکەوتەبوون و، تابیعی تابیعییەکان، کە بەحەق شوێنکەوتەبوون، کەسیان نەبوون قەدەریان بەدرۆ خستبێتەوە و باوەڕیان پێی نەبووبێت، تاکوو ئەوکاتەی کەسانێک دەرکەوتن، پێیان دەوترێ: قەدەرییەکان؛ کە زیاتر لە بەسرەوە دەرکەوتن، سەرۆکیان کەسێک بوو بەناوی (سیسەوەیهـ)، یاخود هەندێک پێی دەڵێن: (سەوسەن)، کەسێکی گاور بوو، وە دواتر مەعبەدی جوهەنی لەوەوە وەریگرت، بۆیە کەس نابینیت لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە ئینکاری قەدەری کردبێت.

پاشانیش، ئینکاری کردنی قەدەر لە دوو حاڵەت بەدەر نییە، ئەوانیش:

یەکەم: کەسێک ئینکاری عیلم و زانستی اللَّهُ تعالی بکات، واتە: زانست و عیلمی پێشوەختە، بەوەی باوەڕی وابێت کە اللَّهُ تعالی پێش ڕوودانی ڕوودەوەکان و پێش هاتنەدی شتەکان، عیلمی بە شتەکان نییە.

دووەم: یاخود کەسێک پێی وابێ کە هەندێک شت هەیە، مەخلووقات خۆیان خەلقی دەکەن، بێگومان لەم حاڵەتەدا دوو شت ئەدرێتە پاڵ اللَّهُ تعالی، ئەوانیش:

١- جەهل و نەزانین.

٢- شەریک و هاوەڵ بڕیاردان.

پەنا بە ﷲ تعالی، هەرکەس وابێت کافرە، بە ئیجماعی سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

بەڵام کەسانێکی دیکە، گەر قەدەر جێگیر بکەن و زانست و عیلمی پێشوەختەی ﷲ تعالی جێگیر بکەن، بەڵام لە هەندێ وردەکاریی قەدەردا ئیمانیان وەکو ئیمانی سەلەف نەبووبێ، لێرەدا لەلایەن سەلەفەوە دوو بۆچوون لەسەریان هەیە:

١- هەندێکیان بە موبتەدیعیان زانیون.

٢- هەندێکی دیکەیان بە ڕاشکاوی بە کافریان زانیون، بەڕەهایی و بەبێ وردەکاری پێدان، وەکوو دەبینین بە موتڵەقی لەلایەن ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر و حەسەنی بەسری و مالیک و شافیعی و جگە لەوانیشەوە هاتووە کە حوکمیان داوە بەسەر قەدەرییەکان، بەوەی دەرچوون لە ئیسلام.

بەڵام دەبینین ئیمامی ئەبو زورعە و ئەبو حاتەم و ئەحمەد و زۆرێکی دیکە لە سەلەف، کە دواتر باسیان دەکەین، دەربارەی قەدەرییەکان دەڵێن: "الْقَدَرِيَّةُ الْمُبْتَدِعَةُ ضُلَّال". واتە ئەسڵ و بنەما لە قەدەرییەکاندا ئەوەیە موبتەدیعی گومڕان، نەک ئەهلی کوفری کافربوون بن، بەڵام: "وَمَن أَنكَرَ مِنهُم أَنَّ الله عَزَّ

وَجَلّ يَعلَمُ مَا يَكُونُ قَبلَ أَن يَكُون؛ فَهُو كَافِر". واتە: ئەوانەی ئینکاری زانستی پێشوختەی اللَّهُ تعالی دەکەن، پێش ڕووداونی ڕووداوەکان؛ ئەوە کافرن.

وە بێگومان قەدەری اللَّهُ تعالی، ئەوانەی ئێمە بە خێر و بە شیرین دەیانبینین و، ئەوانەش بە خراپ و تاڵ دەیانبینین، هەمووی پڕن لە حیکمەتی اللَّهُ سبحانە و تعالی، بۆیە هیچ شتێک نییە لەسەر زەوی ڕوویدات، ئیللا اللَّهُ تعالی حیکمەتی تێدا داناوە.

## جیاوازی نێوان قەزا و قەدەر چییە؟

هەندێک لە زانایان بە هاوواتای یەکیان دادەنێن و، بە قەزا دەڵێن قەدەر و، بە قەدەریش دەڵێن قەزا، بەوەی کاتێك باسی قەدەر دەکەن، مەبەستیان قەزایە، کاتێکیش باسی قەزا دەکەن، مەبەستیان قەدەری (اللَّهُ تعالی)یە، بەڵام هەندێک لە زانایان قەزایان بە تایبەتتر داناوە لە قەدەر، بەوەی دەڵێن: قەزا جێبەجێکردن و فەسڵە، واتە: قەدەر: تەقیدرەکەیە و ئەوەیە کە اللَّهُ تعالی ویستی لێی هەیە، قەزاکەش برتییە لە: جێبەجێکردنی شتەکە، ئەمە وەکو ئەهلی لوغە وتوویانە، بەڵام هەردووکیان موتەلازیمی یەکترن.

## پایەکانی قەدەر:

هەندێک لە ئەهلی عیلم دەڵێن: قەدەر دوو پایەیە و، بە وردکردنەوەی دەبێ بە چوار پایە، کاتێک ئیمانمان بە قەدەر دێتە بوون، دەبێ باوەڕمان بە هەر چوار پایەکە هەبێت:

**یەکەم: (العِلم)**، واتە: زانستی پەروەردگارمان: دەبێ باوەڕمان وابێ پەروەردگارمان زانستی پێشوەختەی بە تەواوی دروستکراوەکان هەیە، پێش ئەوەی دروستیان بکات، دەربارەی ئەم پایەیە بەڵگەکان زۆرن، لەوانە:

١- اللهُ تعالی دەفەرموویت: (ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ)[٦٤]. واتە: ئەوەش بۆ ئەوەی بزانن، کە بەڕاستی اللهُ دەزانێ و بە ئاگایە، کەچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بێگومان اللهُ بە هەموو شتێک زانایە.

٢- پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەی ئیمامی عەلیدا، کە **[مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ]**یە، دەفەرموویت: **"مَا مِنْكُمْ مِنْ نَفْسٍ، إِلَّا وَقَدْ عُلِمَ مَنْزِلُهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ"**[٦٥]. واتە: هیچ نەفسێک نییە، ئیللا اللهُ تعالی عیلمی پێی هەیە، کە ئەو نەفسە جێگەی بەهەشتە یان دۆزەخە.

بۆیە کاتێک مرۆڤ بە ئیماندار دادەنرێت و، ئیمانەکەی سوودی بۆی دەبێت، کە باوەڕی بە زانستی پێشوەختەی اللهُ تعالی هەبێ، دەربارەی ئەو شتانەی کە ڕوودەدەن، ئەوەی کە بووە و دەبێت، هەمووی پێش ڕوودانیان، اللهُ تعالی زانستی پێیان هەبووە، بۆیە ئیمانمان وایە اللهُ تعالی زانستی پێشوەختەی بە هەموو شتێک هەیە، با هێشتا ڕووشی نەدابێت.

---

(٦٤) المائدة: ٩٦.

(٦٥) سەحیحی موسلیم: ٢٦٤٧.

دووەم: (الكِتَابَة)، واتە: اللَّهُ تعالی هەموو قەدەرەکانی نووسیوەتەوە: دەبێ باوەڕمان وابێت کە اللَّهُ سبحانە و تعالی هەموو قەدەر و ئەندازەگیرییەک، کە ڕوویداوە و ڕوودەدات، هەر هەموویی لە (لوح المحفوظ)دا نووسیوەتەوە، بەڵگەکانیش زۆرن، لەوانە:

١- اللَّهُ تعالی دەفەرموێت: (أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَـٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ)[٦٦]. واتە: ئایا نازانی بەڕاستی اللَّهُ تعالی هەموو ئەو شتانەی کە لە ئاسمان و زەویدایە دەزانێ، بێگومان ئەوەی باسکرا لە کتێبی (لَوحُ المَحفُوظ)دایە، بەڕاستی ئەم زانیارییەی باسکرا لەلای (اللَّهُ تعالی)وە ئاسانە.

٢- وە دەفەرموێت: (مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَـٰبِ مِن شَىْءٍ)[٦٧]. واتە: لەم پەرتووکەدا کە (لَوحُ المَحفُوظ)و قورئانە، هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە.

٣- لە فەرموودەیەکی سەحیحدا، کە بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "كُتِبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَصِيبُهُ مِنَ الزِّنَى، مُدْرِكٌ ذَلِكَ لَا مَحَالَةَ، فَالْعَيْنَانِ زِنَاهُمَا النَّظَرُ"[٦٨]. لەکۆتایی فەرموودەکەدا دەفەرموێت:

---

(٦٦) الحج: ٧٠.

(٦٧) الأنعام: ٣٨.

(٦٨) سەحیحی موسلیم: ٢٦٥٧.

"فِيمَا جَفَّتْ بِهِ الْأَقْلَامُ وَجَرَتْ بِهِ الْمَقَادِيرُ"[٦٩]. واته: پەروەردگار هەمووشتێکی نووسیوەتەوە و، هەموو شتێک بە عیلمی اللَّهُ تعالی بڕاوەتەوە.

عەقیدەمان وایە ئەوەی ڕوویداوە و، ئەوەشی لە داهاتوودا ڕوودەدات، اللَّهُ تعالی عیلمی پێیان هەیە.

٤- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، وقَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ"[٧٠]. واته: اللَّهُ تعالی ئەندازەی هەموو دروستکراوەکانی نووسیوەتەوە، پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروستبکات، بە پەنجا هەزار ساڵ، وە فەرمووی: عەرشی اللَّهُ تعالی لەسەر ئاوە.

ئەندازەگیری و نووسینەوەی قەدەرەکانی اللَّهُ تعالی، بە گوێرەی زەمان دەکرێتە چوار جۆر تەقدیر، ئەوانیش:

١- (تەقدیری ئەزەلی): لەوکاتەی کە اللَّهُ تعالی خەلقی پێنووس و پەرتووکی کرد، وردەکاریی هەموو ڕووداوەکان و شتەکانی نووسی، اللَّهُ تعالی دەفەرمووێ: (مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَـٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ)[٧١]. واته: هیچ زیان و

---

(٦٩) موسنەدی ئەحمەد: ١٤١١٦.

(٧٠) سەحیحی موسلیم: ٢٦٥٣.

(٧١) الحديد: ٢٢.

بەڵایەك ڕووینەداوە، نە لە زەوی و نە لە خودی خۆتاندا، ئیللا لە **(لَوحُ المَحفُوظ)**دا نوسراوە، پێش ئەوەی بەدی بهێنین، بێگومان ئەوە بۆ اللَّهُ زۆر ئاسانە. وە دەفەرمووێت: (وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ فِيٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ)[٧٢]. واتە: وە هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ڕوونکەرەوەدا هەڵژماردووە بە نووسین.

کەواتە ئەمە تەقدیری ئەزەلییە، پێش دروستکردنی مەخلووقاتەکانی بە پەنجا هەزار ساڵ، ئەم تەقدیرەی نووسیوە.

٢- (تەقدیری عومری لەکاتی وەرگرتنی پەیمانەکانمان): لەوکاتەی اللَّهُ تعالی ئادەمی خەلق کرد عليه السلام، هەمووومانی لەپشتی ئادەم دەرهێنا و پەیمانی لێوەرگرتین، هەروەک اللَّهُ تعالی لە چەند شوێنێکدا باسی دەکات، وەکو دەفەرمووێت: (وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُوا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾)[٧٣]. واتە: بەبیر خۆت بێنەوە کاتێ کە پەروەردگارت لە پشتی ئادەم نەوە و وەچەکانی دەرهێنا، کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و پێی فەرموون: ئایا من پەروەرگاری ئێوە نیم؟ ناشبێ بە تەنها من بپەرستن؟ لە وەڵامدا نەوەکانی

---

(٧٢) يس: ١٢.

(٧٣ ) الأعراف: ١٧٢ و ١٧٣

وتیان: بەڵێ شایەتیماندا، تا لە ڕۆژی دواییدا نەڵێن: بەڕاستی ئێمە بێئاگا بووین لەوەی کە الله پەروەردگارمانە ﴿١٧٢﴾، یاخود نەوەک بڵێن: بێگومان باو و باپیرانمان لەپێش ئێمەوە هاوبەشییان بڕیارداوە و موشریک بوون، ئێمەش وەچە و نەوەی دوای ئەوان بووین، دەی ئایا لەناومان دەبەیت بەوەی، کە ئەوانی بێفەڕ و خراپەکار کردوویانە؟

بێگومان ئەمەش تەقدیری عومرییە، کە لەکاتی وەرگرتنی پەیماندا وتوومانە و، الله تعالی نوسیویەتی.

٣- (تەقدیری عومری لەکاتی دروستبوونی نوتفەدا): کاتێک منداڵ لە ڕەحمی دایکیدا دروست دەبێت، وەک لە فەرموودەی ئیبنو مەسعووددا ﵁، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: **"إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ"**. تا لە کۆتایی فەرموودەکە دەفەرمووێت: **"ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا، فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ"**[٧٤]. واتە: پاشان پەروەردگار فریشتەیەک دەنێرێت و، فەرمانی پێدەکرێت بە نوسینی چوار شت، **"فَيَقُولُ: اكْتُبْ عَمَلَهُ وَأَجَلَهُ وَرِزْقَهُ، وَاكْتُبْهُ شَقِيًّا أَوْ سَعِيدًا"**[٧٥]. واتە: بنووسە: عەمەلەکەی کە چی دەبێت، وە ڕزقەکەی و ئەجەلەکەی و، ئەوەش کە ئایا بەدبەخت ئەبێت

(٧٤) سحیحی بوخاری: ٣٢٠٨.

(٧٥) موسنەدی ئەحمەد: ٣٩٣٤.

یان سەرفراز، **"ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ"**[٧٦]. واتە: پاشان ڕۆح دەکرێت بەبەریدا.

٤- (تەقدیری حەولی لە شەوی قەدرا): وەکو اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: (فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ)[٧٧]. واتە: لەو شەوە پیرۆزەدا هەموو کاروبارێکی بەجێ لە یەك جیادەکرێتەوە. لە ئیبن عەبباسەوە ﷺ هاتووە، کە تەبەری هێناوێتی، دەڵێت: **"يَعنِي يُكتَبُ مِن أُمِّ الكِتَابِ فِي لَيلَةِ القَدر"**. واتە: ئەوەی کە لە (لَوحُ المَحفُوظ)دا نوسراوە جارێکی دیکە دەنوسرێتەوە، **"مَا يَكُونُ فِي السَّنَةِ مِنْ مَوْتٍ وَحَيَاةٍ وَرِزْقٍ وَمَطَرٍ حَتَّى الْحُجَّاجِ، يقال: يَحُجُّ فلان"**. واتە: ئەوەی لەو ساڵەدا دەبێت، لە مردن و لەدایکبوون و ڕزق و بارانبارین و تەنانەت ناوی حاجییەکانیش، دەوترێت: فڵان کەس حەج دەکات.

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسبکرێ، بریتییە لە سوودێک کە لە تەقدیری عومریی لە ئایەتی میساقەوە وەردەگیرێت، ئەویش ئەوەیە: سەلەفی ساڵح ئەم ئایەتی میساقە لەلایان بەڵگە بووە دەربارەی تەواوی مرۆڤایەتی، بەوەی کە ئێمە لە جیهانی ڕۆحەکاندا بووین، پەیمانی لێوەرگرتووین لەسەر ئەوەی: ژیانمان لەسەر تەوحید بونیاد بنێین و دووربین لە شیرک، بەڵام وەک دەبینرێ زۆرێک لە خەڵکی لەسەر شیرکن و ئەو پەیماننامەیان بیرچۆتەوە، لە قیامەتیشدا دەڵێن:

---

(٧٦) سەحیحی بوخاری: ٣١٠٨.
(٧٧) الدخان: ٤.

(إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ). واته: بێگومان باو و باپیرانمان لەپێش ئێمەوە هاوبەشییان بڕیارداوە و موشریک بوون.

کەواتە بێگومان اللَّهُ تعالى بەڵگەی زۆری هەیە بەسەرمانەوە، یەکێک لەوانە ئەم ئایەتی میساقەیە.

سێیەم: (مَشِيئَة)، واتە: ویستی اللَّهُ تعالى، یەکێکی دیکەیە لەو پایانەی کە بەبێ بوونی، ئیمانمان تەواو نییە، بریتییە لەوەی: باوەڕمان وابێ اللَّهُ تعالى ویستی لەسەر هەرشتێک هەبێت لە گەردووندا، ئەوە ئیللا دێتە بوون، هیچ شتێک نییە لە ژێر ویستی اللَّهُ تعالى دەربچێت، وەکوو:

١- اللَّهُ تعالى دەفەرمووێت: (فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا)[٧٨]. واتە: ئینجا هەرکەسێك بیەوێ، ڕێگایەك دەگرێ بۆ لای پەروەردگاری.

٢- وە دەفەرمووێت: (وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا)[٧٩]. واتە: وە ئێوە ویستی شتێکتان نابێ، مەگەر کاتێك کە اللَّهُ بیەوێ، بێگومان اللَّهُ ئاگادار و دانای دروست کردارە.

٣- وە دەفەرمووێت: (لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾)[٨٠]. واتە: بۆ ئەو کەسانەی لە ئێوە، کە

---

(٧٨) المزمل: ١٩.

(٧٩) الإنسان: ٣٠.

(٨٠) التكوير: ٢٨ و ٢٩.

بیانەوێ بەڕێی ڕاستدا بڕۆن ﴿٢٨﴾ ئێوە ئارەزووی ڕێی ڕاست ناکەن، مەگەر کاتێک کە پەروەردگاری هەمووان بیەوێت ﴿٢٩﴾.

٤- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: "إِنَّ اللَّهَ قَبَضَ أَرْوَاحَكُمْ حِينَ شَاءَ، وَرَدَّهَا حِينَ شَاءَ"[٨١]. واتە: پەروەردگار ئەو کاتەی ویستی، ڕۆحەکانتانی کێشا، وە ئەو کاتەی ویستی، زیندووی کردنەوە.

الله تعالی دوو جۆر مەشیئەت و ئیرادەی هەیە، ئەوانیش:

١- (ئیرادە و ویستی کەونی): بریتییە لەوەی هیچ شتێک ڕوونادات لە دەرەوەی ویستی الله تعالی، بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نایەت، کە مەخلووقات و دروستکراوی الله تعالی، لە ئەنجامدانی کردارەکاندا هیچ ویستێکیان نەبێت، بەڵکو مرۆڤەکان و دروستکراوەکانی الله تعالی، هەر ویستێکیان هەبێت، ویستەکەیان ناچێتە دەرەوەی ویستی الله تعالی، بەو واتایەی گەر الله ویستی لەسەر نەبێت، شتەکە ڕوونادات، جا دەگونجێت شتانێک هەبن، کە شەڕ و خراپە بن و، ویستی (الله)ی لەسەر هەبێت، بەڵام ویستی کەونیی الله تعالی، نەک ویستی شەرعیی، بوونی کوفر و کافر، شیرک و موشریک، خراپەکان و شەیتانەکان، حیکمەتێکی گەورەی (الله تعالی)یە و، بۆ جیابوونەوەی پاک لە پیس و، خراپەکار لە چاکەکارە.

٢- (ئیرادە و ویستی شەرعیی): بریتییە لەو ویستەی الله تعالی کە خۆشەویستی خۆی لەگەڵدایە.

---

[٨١] سەحیحی بوخاری: ٧٤٧١.

هەندێک لە ئەهلی عیلم و زانایان، وەکو نموونەیەک ئەم بابەتە ڕوون دەکەنەوە و دەڵێن: گەر کەسێک لەناو دەریایەکدا بێت و کەشتییەکی پێبێت، ئەم کەشتییە بۆ هەرکوێیەک بیانەوێت دەتوانێت بیانبات، بەڵام ئەم کەشتییە لەناو دەریاکە ناچێتە دەرەوە و، تەنها لەناو دەریاکەدا دەتوانێت ڕێ بکات.

بۆیە بێگومان ئێمەش ویستەکانمان ناچێتە دەرەوەی ویستی ﷲ تعالی، بێگومان (فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ)[٨٢]. واتە: جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت. ئەمە لەنێو ویستی کەونی (ﷲ تعالی)دایە، نەک ویستە شەرعییەکەی، بەڵکو ویستە شەرعییەکەی ﷲ تعالی لەگەڵ هەموو کردارێکی باش و چاکدایە.

**چوارەم: (خَلق)**، واتە: دروستکردن، پێویستە ئیمانمان وابێ، کە ﷲ تعالی هەموو شتێکی دروستکردووە، خۆمان و کاروکردەوەکانیشمان، وەک ﷲ تعالی دەفەرموێت: (وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ)[٨٣]. واتە: لە کاتێکدا ﷲ بەدیهێنەری خۆتان و کردارەکانیشتانە. بەڵام ئێمە بکەری کردارەکانین، بە خێر و شەڕەوە، وەک ﷲ تعالی دەفەرموێت: (ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ)[٨٤]. واتە: ﷲ بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە هەر ئەویش پارێزەری هەموو شتێکە. پەروەردگار

(٨٢) الكهف: ٢٩.

(٨٣) الصافات: ٩٦.

(٨٤) الزمر: ٦٢.

وەکو چۆن مرۆڤی دروستکردووە، ئاواش **(خَلَقَ أفعَالَهُ)** واتە: کردارەکانی خەلق کردووە.

بابەتی قەدەر سنوری عەقڵی تێپەڕاندووە، واتە مرۆڤ گەر بیەوێت بە عەقڵ لە وردەکاریی قەدەر تێبگات، بێگومان تێی ناگات، بۆیە فەرمانمان پێکراوە ئیمان بهێنین بەو بابەتانەی لە شەرعدا بۆمان باسکراوە و، لە بابەتی قەدەردا ڕۆنەچین، وەک هەندێک لە هاوەڵان فەرموویانە: "قەدەر نهێنی (اللَّهُ تعالی)یە؛ **(فَلَا تَكَلَّفهُ)**، واتە: هەوڵ مەدە زۆر لەخۆت بکەیت بۆ زانینی". چونکە ئەمە نهێنییەکە اللَّهُ تعالی پێی نەوتویت، هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟"**[٨٥]. واتە: شەیتان دێتە بنکلێشەی هەریەک لە ئێوە، پێتان دەڵێ: کێ ئەمەی دروست کردووە؟ کێ ئەوەی دروست کردووە؟ تا ئەوەی پێتان دەڵێ: ئەی کێ پەروەردگارتی دروست کردووە؟ بۆ ئەوەی ئەو دەرگایە نەکرێتەوە، مرۆڤی موسڵمان دەبێت ڕادەستی فەرمانی پەروەردگاری بێت، چونکە بێگومان عەقڵ سنوری هەیە، وردەکاریی قەدەر غەیب و شاراوەیە و تەنها لای اللَّهُ تعالی خۆیەتی.

---

[٨٥]) سەحیحی بوخاری: ٣٢٧٦.

**هۆكارەكانی شاردنەوەی وردەكارییەكانی قەدەر:**

١- عەقڵەكان دەستەوسانن و ناتوانن درک بە هۆكاری هەموو قەدەرەكان بكەن، (لَا تُحِيطُ بِهَا العُقُول)، واتە: عەڵقەكان ناتوانن درک بە تەواوی قەدەرەكان بكەن، بۆچی؟ (لِضَعفِ العُقُولِ وَالأَفهَام)، واتە: لەبەر لاوازیی عەقڵەكان و تێگەشتنەكان.

٢- ﷲ تعالی بۆ تاقیكردنەوەی بەندەكانی قەدەری داناوە، تا دەركەوێت تا چ ئاستێک ڕادەستی فەرمانی دروستكارەكەیان دەبن، بەوەی بەندەكانی هۆكاری قەدەرەكان نازانن و، ڕادەستی فەرمانی پەروەردگاریان دەبن و باوەڕ بە قەدەرەكە دەهێنن.

بۆیە دەبینین لەبەر لاوازیی عەقڵەكان دەربارەی تێگەیشتن لە قەدەرەكان، زۆرێك لە سەلەفی ساڵح ڕێگرییان لە ڕۆچوون و وردبوونەوە لە قەدەردا كردووە، وەكوو: (إِمَام عَلِي، إِبنُ مَسعُود، حُذَيفَة، إِبنُ عَباس، طَاوُس، قَاسِمُ بنُ مُحَمَّد، حَسَنَ البَصرِيّ، أَحمدَ بنَ حَنبَل، إِبنُ المَدِينِي.. إِلَخ).

**ئەو گرووپانەی لە بابەتی قەدەردا دروست بوون:**

بابەتی قەدەر یەكێكە لەو بابەتانەی كە لە ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ كەسانێک هەبوون، لایاندا لەوەی پێغەمبەرەكەیان و هاوەڵان و سەلەفی ساڵح لەسەری بوون، وە هەندێكیشیان دەرگای كوفریان بۆ كرایەوە و چوونەتە ناو

كوفرەوە و بوون بە کافر لەم بابەتەدا، بەڵام بە گشتی، ئەوانەی لە بابەتی قەدەردا لایانداوە دوو نەفەسی دژیەکن، ئەوانیش:

**یەکەم: (قەدەرییەکان):** کە ئەوانەبوون پێیان وابوو اللّٰه تعالى عیلم و زانستی پێشوختەی بەو شتانە نەبووە کە ڕوویانداوە، ئەمانە **(قَدَرِيَّةَ الغُلَّات)**ن، واتە قەدەرییە ڕۆچووەکان، لەوانە مەعبەدی جوهەنی و جگە لەوانیش، کە کۆدەنگی سەلەف دروستبوو لەسەر کافرێتییان.

بەڵام جۆرێکی دیکە لە قەدەرییەکان هەیە، کە غولات نین، پێیان وایە خۆیان خالیق و دروستکاری کاری خۆیانن، بەتایبەت کارە شەڕەکان، ئەمانە باوەڕیان بە خەلق نییە لە پایەکانی باوەڕبوون بە قەدەردا، ئەمانە سەلەفی ساڵح بە موبتەدیع و گومڕایان داناون و، جیاوازییان کردووە لە نێوان ئەمانە و نێوان غولاتەکان.

عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وایە، کە خۆمان ئەنجامدەری کاروکردەوەکانی خۆمانین، بەڵام اللّٰه تعالى خۆمان و کردارەکانیشمانی خەلق کردووە.

لە ڕاستیدا سەلەفی قەدەرییەکان بریتییە لە قوتابخانەی فەیلەسووفەکان، لە ئەرستۆ و جگە لەوانیش، بۆیە دەبینین مەعبەدی جوهەنی فەلسەفەی نەفیکردن و ڕەتکردنەوەی قەدەری لە (سەوسەن) وەرگرتووە، کە یەکێک بووە لە گاورەکان، لە پاشان بڵاوی کردۆتەوە و خەڵکی پێ گومڕا کردووە.

کەواتە بەم چەشنە قەدەرییەکان دەبن بە دوو بەشەوە:

١- **قەدرییە غولاتەکان،** ئەوانە بوون کە باوەڕیان بە زانستی پێشوەختەی ﷲ تعالی نەبوو، جا ئەوەی باوەڕی بە زانستی پێشوەختە و کیتابەتی ﷲ تعالی نەبێت لە پایەکانی قەدەردا؛ ئەوە کافرە و لە دین دەچێتە دەرەوە.

٢- **جگە لە غولاتەکان،** ئەوانە بوون خەلقیان ڕەتکردەوە لە پایەکانی قەدەردا و، پێی بوون بە گومڕا و سەرلێشێواو و موبتەدیع.

دووەم: **(جەبرییەکان):** لە ڕاستیدا جەهمییەکانن، ئەوانە بوون لەبەرامبەر نەفەسی قەدەرییەکان وەستانەوە و پێیان وابوو، کە بەندە هیچ ویستێکی نییە، هەموو ویستەکان هی (ﷲ تعالی)ن، وە هیچ هەڵبژاردنێکیان بۆ بەندەکان نەهێشتەوە، هیچ جیاوازییەکیشیان نەکرد لەنێوان بێ گیانێک و ئاژەڵێک و مرۆڤێک، بۆیە گەر لە بیروباوەڕی جەبرییەکان ڕابمێنین، دەبینین دین هەڵدەوەشێننەوە، وادەکەن زوڵم بدرێتە پاڵ پەروەردگار پەنا بە خوای پەروەردگار، چونکە لە بیروباوەڕی جەبرییە جەهمییەکاندا، مرۆڤ هەر کارێکی خراپ و قێزەون ئەنجام دەدات، لای ئەوان هیچی بەدەست خۆی نییە، بەندەکان وەک پەڕێک وان، چۆن هەوا دەیانجوڵێنێت، ئاوهاش مرۆڤەکان ﷲ دەیانجوڵێنێت و مرۆڤەکان هیچ ویستێکیان نییە، سەرەنجامی ئەم بیروباوەڕە تانەدانە لە ﷲ تعالی، بەوەی زوڵمی لە بەندەکان کردووە، بەوەی بەندەکانی دەخاتە دۆزەخ، لە کاتێکیشدا خۆی کاروکردەوەیان پێ ئەنجام دەدات، پەنا بە ﷲ تعالی لەو درۆ گەورەیە کە بەدەم (ﷲ تعالی)وە هەڵیدەبەستن.

بۆیە بیروباوەڕی جەهمییەکان لە بابەتی قەدەردا هەمان بیروباوەڕی جەبرییەکانە، بەوەی سیفەتی حیکمەتی اللَّهُ تعالی ڕەت دەکەنەوە. پێیان دەوترێت جەبرییەکان؛ لەبەر ئەوەی لای ئەوان اللَّهُ تعالی بە جەبر و بە زۆر کارەکان بە مرۆڤ دەکات، ئەمەش پێچەوانەی عەدل و حیکمەتی (اللَّهُ تعالی)یە.

ئەشعەرییەکانیش، ئەوانەی کۆن و ئەم سەردەمەش، لە ڕاستیدا جەبرین، ئەوانەی کۆن بە شێوەیەکی ئیجمالی و ئەو شێوەیەی لە قورئادا هاتووە، پایەکان جێگیر دەکەن، بەڵام لە وردەکارییەکەیدا موخالەفە دەکەن، ئەوەتا دەبینین (أبو الحسن الأشعري) لە پەرتووکەکەیدا، کە نامەیەکە بۆ [أهل الثغر]، پایەکانی قەدەر جێگیر دەکات، بەهەمان شێوە ماتوریدیش لە پەرتووکەکەیدا کە ناوی [التوحید]ە، پایەکانی قەدەر جێگیر دەکات، وە باوەڕیان بە قەدەر هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەشعەرییەکان جەبرین، خۆیان وا گومان دەبەن، کە نێوەندگیرن لە نێوان قەدەرییەکان و جەبرییەکاندا، بەڵام لە ڕاستیدا جەبرین؛ چونکە لە وردەکاری پایەکانی قەدەردا، پێیان وایە بەندەکان هیچیان بەدەست نییە و، ئەوەی ئەنجامی دەدەن، هەمووی اللَّهُ پێیان دەکات.

## هۆکارەکانی گومڕابوون لە بابەتی قەدەردا:

١- بەکارخستن و بەگەڕخستنی عەقڵ لە شتانێکدا، کە مرۆڤ لە توانایدا نییە لێیان تێبگات و درکیان پێبکات، بۆیە دەبینین ئەوانەی دەمی خۆیان

تێدەخەن، بەرەو گومڕایی و کوفر دەڕۆن، جا یان بەرەو قەدەرییەت دەڕۆن، بەوەی نەفی قەدەر بکەن، یاخود بەرەو جەبرییەت دەڕۆن، بەوەی نەفی ویستی بەندەکان دەکەن و، بەندەکان وەک بێگیانێک تەماشا دەکەن، ئەمەش بۆخۆی ڕەتکردنەوەی حیکمەتی ناردنی پێغەمبەرانە -عَلَى نَبِيِّنَا وَعَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام- گەر بێتو مرۆڤەکان هیچیان بە دەست نەبێت، ئیتر پێغەمبەران بۆچی نێردراون؟! ئەگەر مرۆڤەکان هیچ ویستێکیان نەبێت لە هەڵبژاردنی کوفر و ئیمان و خراپە و چاکە، ئیتر بۆچی اللَّهُ تعالى بەهەشت و دۆزەخی دروست کردووە؟! گەر هیچ ویست و هەڵبژاردنێکمان نییە و هەمووی پێمان ئەنجام دەدرێ، بۆچی اللَّهُ تعالى عەقڵی داوە بە مرۆڤ؟! بۆیە جەبرییەکان گومڕاترن لە قەدەرییەکان و قەدەرییەکانیش گومڕان، وەکو جەرییەکان.

٢- خۆ خەریککردن بە ئایەت و فەرموودە موتەشابیهەکان، چونکە ئایەت و فەرموودە موتەشابیهەکان زیاد لە لێکدانەوەیەک لەخۆ دەگرن، وە وازهێنان لە موحکەمەکان، ئەوانەی کە واتابڕاو و ڕوون و ئاشکران.

بۆیه باوەڕمان بە قەدەر هەیە بە خێر و بە شەڕییەوە:

١) اللَّه تعالى دەفەرموێت: (قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا)[٨٦]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: هیچمان تووش نابێت جگە لەوەی کە اللَّه تعالى نووسیویێتی بۆمان.

٢) وە دەفەرموێت: (وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً)[٨٧]. واتە: وە ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە خراپە و ناخۆشی، وە بە چاکە و خۆشی، تاکو چاک و خراپ دەرکەوێ.

بۆیە خێر و شەڕ لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، بەڵام لە تەقدیس و بەگەورەدانانی اللَّه تعالى وایە، کە شەڕ پاڵ نەدەین بۆی، بۆیە ئەسڵ وایە (أَنَّ الشَّرَّ لَايُضَافُ إِلَى اللهِ)، بەڵام ئیمانمان هەیە بەوەی لە ویستی کەونی پەروەردگاردا شەڕی خەلق کردووە، بەڵام لە شەرعدا بۆمان ڕوونکراوەتەوە، کە اللَّه تعالى پێی ڕازی نییە.

٣) وە دەفەرموێت: (ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ)[٨٨]. واتە: اللَّه تعالى بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

٤) وە لە سورەتی [الفلق]دا دەفەرموێت: (مِن شَرِّ مَا خَلَقَ)[٨٩]. واتە: پەنا دەگرم بە اللَّه لە زیانی ئەوەی کە دروستی کردووە.

---

(٨٦) التوبة: ٥١.
(٨٧) الأنبياء: ٣٥.
(٨٨) الزمر: ٦٢.

٥) ياخود جارى وا هەيە شتانێک دەبينين لە قورئاندا كە اللَّهُ تعالى بكەرەكەی باس نەكردووە، بەڵام اللَّهُ تعالى خۆی خاليق و دروستكاری شەڕەكانە، جنۆكەكان وتيان: (وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا)[٩٠]. واتە: وە بەڕاستی نازانين ئايا خراپيی ويستراوە بۆ ئەوانەی كە لە سەر زەوين، ياخود پەروەردگاريان ڕێنموونيی ويستووە بۆيان.

بۆيە وەک ئەدەبێك شەڕ نادەينە پاڵ پەروەردگار؛ چونكە مرۆڤەكان بكەری شەڕن نەک پەروەردگار، بەڵام ويستی كەونی پەروەردگاری لەگەڵدايە.

بۆيە لەو كۆدەنگييانەی، كە سەلەفی و ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعە هەيانە، باوەڕبوونە بە قەدەر بە خێر و بەشەڕی، وە باوەڕبوونە بە پايەكانی قەدەر، كە زانستی پێشوەختەی پەروەردگار و نوسينی قەدەرەكانە لە (لوح المحفوظ)دا، ئەمەش بە واتای جەبر و بە زۆر ئەنجامدان نايەت، وەک ئەوەی جەبرييەكان لێی تێگەشتوون، پاشان ويستی اللَّهُ تعالى و خەلقی (اللَّهُ تعالى)يە، كە خۆمان و كاروكردەوەكانيشمان اللَّهُ تعالى خەلقی كردووە، بەو شێوەيەی ڕابوورد بەسەرماندا لە باسكردنيان.

---

(٨٩) الفلق: ٢.

(٩٠) الجن: ١٠.

بۆ جوان تێگشتن لە بابەتی قەدەر، دەتوانین بە نموونەیەک ڕوونی بکەینەوە، پەروەردگار زۆر لەوە گەورەترە ئێمە بە هێنانەوەی نموونە باسی بکەین، بەڵام بۆ تێگەشتنی بابەتەکە نموونەیەک دەهێنینەوە بۆ تێگەشتن لە عیلم و کیتابەتی ﷲ تعالی:

مامۆستایەک کۆمەڵێک خوێندکاری لەبەردەستدایە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی ساڵ ئەزموونی هەیە لەگەڵیان، دەزانێت ئەم خوێندکارانە تا چ ئاستێک توانایان هەیە، گەر ئەم مامۆستایە پێش تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ، بەپێی ئەزموون و زانستی خۆی کە دەزانێ ئاستی زانستی خوێندکارەکانی چەندە، لە وەرەقەیەکی سپیدا لای خۆی، بنوسێت موحەممەد لە کۆی ١٠٠ نمرە ١٠٠ دەهێنێت، ئەحمەد ٩٠ نمرە دەهێنێت، زەینەب ٨٠ دەهێنێت، زەید دەرناچێت و دەکەوێت، ئەم خوێندکارانەش هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن تاکو دەربچن، لە کۆتایی ساڵدا تاقیکردنەوە ئەنجام دەدەن، دواتر کە نمرەکان وەردەگرنەوە، مامۆستا دەبینێت ئەو پێشبینییانەی دایناوە، گەر دەقاودەقیش وانەبووبێت، زۆر نزیک بووە لێیەوە، چونکە ئەو مامۆستایان بووە و ئەزموونی هەیە لەگەڵیاندا، دەزانێت زەید دەکەوێت و دەرناچێت، ئایا لە کۆتاییدا بۆ زەید ڕەوایە بڵێت: بۆیە دەرنەچووم چونکە تۆ پێش تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ لای خۆت نوسیبووت کە من دەکەوم؟! بێگومان بۆی نییە وا بڵێت، چونکە ئەوە ستەم نییە لە زەید.

دەی بێگومان ﷲ تعالی پەروەردگار و دروستکەرمانە، پێش دروستکردنی ئاسمانەکان بە پەنجا هەزار ساڵ زانیویێتی ئێمە کەی لە دایک دەبین و کەی

دەمرین و چی دەکەین و چی ناکەین و..تاد، هەموو شتێکی زانیوە، هەمووشی لە پەرتووکێک لای خۆی نووسیوەتەوە، کە هیچ کەسێک نایزانێت، تەنانەت پێغەمبەران و -عَلَيهِمُ السَّلَام- فریشتەکانیش نایزانن، زانستیان بەو زانستەی ﷲ تعالی نییە، نازانن ئەندازەگیری (ﷲ)ی ڕەحمان چۆن چۆنییە، بۆیە دەبێت باوەڕی تەواو و دروستمان هەبێت بە قەدەری ﷲ تعالی؛ چونکە ئەوە نهێنی (ﷲ تعالی)یە، وە نابێت هەوڵ بدەین پەی پێبەرین، چونکە هەوڵدانەکان بۆ درککردن بە قەدەری ﷲ تعالی، هەوڵدانێکی نەزۆک و، کورتڕەو و، بێ ئەنجامن، دەرەنجامەکەشی کوفر و گومڕاییە؛ چونکە وتانێکە لەسەر بنەمای جەهل و نەزانین، ﷲ تعالی بە دوورمان بگرێت لە ڕێگەی چەوت و نەزانی، وە ڕێنموونیمان بکات بۆ ڕێگەی حەق و زانین، ئەو ڕێگەیەی کە خۆی پێی ڕازییە. ئامین!

٤- وَخَيْرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا [عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ]:(١)
أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ الفَارُوق، ثُمَّ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، ثُمَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ.(٢)
وَهُمُ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ الْمَهْدِيُّونَ ﷺ.(٣)

---

(١) وَخَيْرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا [عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ]: واته: باشترین کەسی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بریتین لە:

(٢) أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ، ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ الفَارُوق، ثُمَّ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، ثُمَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ. واته: (أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيق)، پاشان (عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ الفَارُوق)، پاشان (عُثْمَانُ بْنُ عَفَّان)، پاشان (عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِب) -اللَّه لێیان ڕازیبێت-.

(٣) وَهُمُ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ الْمَهْدِيُّونَ ﷺ. واته: وە ئەوان جێنشینە هیدایەتدراوەکانن -اللَّه لێیان ڕازیبێت-.

واجبە لەسەر هەمووان کە هیچ کەسێک نە لە هاوەڵان و نە لە جگە هاوەڵان، پێش نەخەن بەسەر ئیمامی ئەبو بەکری سدیق و عومەری کوڕی خەتتاب، چ لە فەزڵدا چ لە ڕێزدا، هەرکەسێک چ لە فەزڵدا چ لە ڕێزدا کەسێکی دیکە پێش بخات بەسەر ئەبو بەکری سدیق و عومەری کوڕی خەتتابدا؛ ئەوە کەسێکی

ڕافیزی کافره. وه هەرکەس تەنها عەلی پێش بخات بەسەر عوسماندا؛ ئەوە لای سەلەف شیعییەکی بیدعەچییە. بۆیە لای سەلەف و لە کۆندا بە کەسێک وتراوە شیعیی، کە لە فەزڵدا عەلی پێش بخات بەسەر عوسماندا. وە لە کۆندا بەو کەسانە ئەوترا مورجیئە، لە بابەتی ئیمامی عەلی و عوسماندا یان تەوەقوفیان ئەکرد، یان ئیمامی عەلییان پێش ئەخست بەسەر ئیمامی عوسماندا!

ئەو چوار پیاوە بەڕێزە، چوار پیاوی بەڕێز و چوار هاوەڵی گەورەی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ، پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ دەربارەیان و، دەربارەی هاوەڵەکانی دەفەرمووێت: "**فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ**"[٩١]. واتە: دەستبگرن بە مەنهەج و سوننەتی منەوە، وە بە مەنهەج و سوننەت و دینداری جێنشینە ڕێنمونیکار و هیدایەتدراوانەی دوای خۆم. دینداری کردن بە شێوەی هاوەڵان بە گشتی و بەتایبەتی ئەو چوار خەلیفەیە دینداریيەکی حەق و تەواوە، وە ئەو دینداریيەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕازییە و فەرمانی ئەوی لەسەرە، ئەمە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٩١) موسنەدی ئەحمەد: ١٧١٤٤.

٥- وَأَنَّ الْعَشَرَةَ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَشَهِدَ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ، عَلَى مَا شَهِدَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَوْلُهُ الْحَقُّ.(١)

---

(١) وَأَنَّ الْعَشَرَةَ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَشَهِدَ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ، عَلَى مَا شَهِدَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَوْلُهُ الْحَقُّ. واته: وه دواتر ئەو دە کەسەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ داون، لەسەر ئەوەی شایەتی بۆ داون و وتەکەشی حەق و ڕاستە.

جگە ئەو چوار هاوەڵە، ئەو شەشەشی ئەمێننەوە ئەوانەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە دونیادا شایەتی بەهەشتی بۆ داون و، پێیان ئەوترێ دە هاوەڵە مژدە پێدراوەکە؛ بۆیە سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەت کۆدەنگییان هەیە دەربارەی ئەو دە هاوەڵە کە مژدەی بەهەشتیان بۆ دراوە و، دان بەو وتەیە دەنێن کە ئەوانە بەهەشتین، ئەوانیش بریتین لە:

١- أبو بكر الصديق ﷺ.
٢- عمر بن خطاب ﷺ.
٣- عثمان بن عفان ﷺ.
٤- علي بن أبي طالب ﷺ.
٥- طلحة بن عبيدالله ﷺ.
٦- زبير بن عوام ﷺ.

٧- سعد بن أبي وقاص ﷺ.

٨- سعيد بن زيد ﷺ.

٩- عبدالرحمن بن عوف ﷺ.

١٠- أبو عبيدة الجراح ﷺ.

هەر دە کەسەکەیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە دونیادا شایەتی بەهەشتی بۆ داون.

## ٦- وَالتَّرَحُّمُ عَلَى جَمِيعِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ وَالْكَفُّ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَهُمْ.[١]

---

(١) **وَالتَّرَحُّمُ عَلَى جَمِيعِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ وَالْكَفُّ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَهُمْ**. واته: وه ڕەحمەت و ڕەزا ناردن بۆ تەواوی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وه خۆ گرتنەوه له قسەکردن دەربارەی ئەوەی ڕوویداوه له نێوانیان له کێشەکان.

پاراستنی زوبانمان له کێشەی نێوان هاوەڵان له سەلامەتی دینداریمانە؛ چونکه ﷲ تعالی دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ)[٩٢]. واته: موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایه ئەو باوەڕدارانەش که لەگەڵیدان بەرامبەر کافران توندوتیژن و له نێوان خۆیاندا بە بەزەیین، دەیان بینی هەمیشه له کوڕنووش و سەجده بردندان، داوای بەهرە و ڕەزامەندی ﷲ دەکەن، نیشانەیان لەناو چاوانیاندا دیارە بەهۆی زۆر سوژدە بردنیان.

پێش ئەوەی باسی فەزڵی هاوەڵان بکەین -ﷲ لێیان ڕازی بێت-، ئەبێ سەرەتا باسی فەزڵی پێغەمبەری خوا بکەین ﷺ؛ چونکه فەزڵی هاوەڵان لقێکە له

---

(٩٢) الفتح: ٢٩.

فەزڵی پێغەمبەرەکەیان، ئوممەت هەموو گومانیان نییە لە فەزڵی پێغەمبەرەکەیان، بەڵام هەندێک دەرگا هەیە کە کەسانێک کردوویانەتەوە -کە بەداخەوە پاڵدراون بۆ ئیسلام و خۆیان پاڵداوە بۆی-، بەتایبەت لە دوو دەرگاوە خەڵکانێک دەربارەی حەقی پێغەمبەری خوا ﷺ گومڕا بوون، ئەوانیش:

١- تەحریف و دەستکاری سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ و، لادان لە واتا و مەبەستەکانی فەرمایشتەکانی، هەر بۆیە ئەبینین لەم ڕێگەیەوە کەسانێک گومڕا و سەرلێشێواو بوون لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢- غولوکردن و زیادەڕەوی لە حەقی پێغەمبەری خوا ﷺ و، زیادەڕەویکردن لە پێگە و مەنزڵی، ئەویش بە بەرزکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئاستی اللَّهُ تعالی، لە کاتێکدا ئەو بەندە و پێغەمبەری خوایە ﷺ، یاخود هەندێک تایبەتمەندی هەیە کە تایبەتە بە اللَّهُ تعالی و تۆ بێیت بیدەیت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وەکوو (الإستِغَاثَة، الإستِعَانَة.. إلَخ)، لە کاتێکدا ئەمانە هەمووی بە بەتاڵ دراونەتە پاڵی.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو پێغەمبەرانی دیکە پلەی بەرزترە لای اللَّهُ تعالی، بێگومان پێغەمبەرانیش -عَلَى نَبِيِّنَا وَعَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام- فەزڵیان پلە پلەیە: (تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَـٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَيَّدْنَـٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ وَلَـٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا

فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ)[٩٣]. واته: ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکران -عَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام- ڕێزمان داوە بەهەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا لەو پێغەمبەرانە هەبووە ﷲ تعالى قسەی لەگەڵ کردووە بە بێ پەردە، وە هەندێکیانی بەرز کردۆتەوە چەند پلەیەک، وە دامان بە عیسای کوڕی مەریەم چەند بەڵگەیەک و موعجیزەیەکی ئاشکرا، وە پشتگیریمان کرد بە فریشتەی سرووش کە جبرییلە ﷺ ئەگەر ﷲ بیویستایە ئەو گەلانەی کە لە دوای پێغەمبەرەکانیان دەهاتن لەگەڵ یەکدا نە ئەجەنگین دوای ئەو نیشانە ڕۆشنانەی کە بۆیان هاتبوو بەڵام دووبەرەکییان تێکەوت، ئینجا هەیان بوو بڕوای هێنا و هەیان بوو بڕوای نەهێنا و کافر بوو، ئەگەر ﷲ بیویستایە یەکتریان نەدەکوشت و شەڕیان نەدەکرد بەڵام ئەوەی ﷲ بیەوێت دەیکات.

موسڵمان ئەبێت باوەڕی بە هەموو پێغەمبەران -عَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام- هەبێت، باوەڕ نەبوون بە یەک پێغەمبەر وەک باوەڕ نەبوونە بە هەموو پێغەمبەران.

هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەزڵیان گەورەترە بەسەر هاوەڵانی پێغەمبەرانی دیکە، هەتا بەسەر فەزڵی حەوارییەکانی عیساشدا ﷺ.

(٩٣) البقرة: ٢٥٣.

## هۆکارەکانی فەزڵی هاوەڵان:

بەپوختی سیانە، ئەوانیش:

١- هاوەڵێتییە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ٱللَّهُ تعالی دەفەرمووێت: (وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ)[٩٤]. واتە: وە ئەوانەی لەگەڵ ئەودان کە هاوەڵانن. ئەم مەعییەت و صوحبەتە بێگومان پلەی ئەوانی بەرز کردەوە، دوای ئەوان کەس ئەو مەعییەت و صوحبەتەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا نەما ﷺ، بەڵام لەبری مەعییەت و صوحبەت، (مُوَافَقَةٌ وَإِتِّبَاعٌ وَالطَّاعَةٌ)مان هەیە، واتە: هاوڕایی و شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی کردن. مرۆڤ واجبە لەسەری کە موافەقەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات و شوێنی بکەوێت و گوێڕایەڵی بکات، بەڵام هێشتە ناگاتەوە بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢- هۆکارێکی دیکە بریتییە لەوەی ئەوان (أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ)[٩٥] بوون، واتە: توووند بوون لەسەر کافران. وەک غیرەت و جوامێرییان بۆ دینی ٱللَّهُ تعالی، وە لابردنی بەربەستەکان لەسەر ڕێگەی سەرووەری تەوحید و ئیسلام، توند و تۆڵ و بە جەرگبوون بەرامبەر بە کافران.

٣- وە ئەوان مەقامی مەحەببەتیان هەبوو بۆ یەکدی، مەحەببەت و خۆشەویستییەکی بێ وێنە، ئەوەتا ٱللَّهُ تعالی باسیان ئەکات و

---

(٩٤) الفتح: ٢٩.

(٩٥) هەمان پەراوێزی پێشەوە.

دەفەرمووێت: (رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ)[٩٦]. واتە: بەڕەحم و میهرەبان بوون لە نێو خۆیاندا.

هاوەڵان ئەو دوانەیان بەدوای بەیەکەوە هەبوو، بۆیە هەر لە کۆنەوە دوژمنانی دین کار لەسەر ئەو دوو مەقامە ئەکەن، ئەیانەوێت ڕۆڵە و شوێنکەوتووانی ئەم دینە بکەن بە موسڵمانێکی پەمەیی، موسڵمانێک کە ئیسلامەتیەکەی ئیسلامەتییەک بێت کە کوفر لێی ڕازیبێت، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستی پێغەمبەری خوایان ﷺ خستبووە پێش هەموو خۆشەویستییەکانەوە، لە نیشتیمانی خۆیانەوە کۆچیان ئەکرد بۆ لای پێغمبەری خوا ﷺ، بۆ سەرختنی خۆی و دینەکەی.

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو خۆیاندا جیاواز بوون لە پلە بەرزیدا، هەندێکیان پلەیان لە هەندێکی دیکەیان بەرزترە، هاوەڵانی پێش هیجرەت پلەیان لە هاوەڵانی دوای هیجرەت بەرزترە، هاوەڵانی سەرەتای دین و غوربەتی ئیسلام لە ناو مەککە فەزڵیان زیاترە لە هاوەڵانی دوای غوربەت، ئەوانەی دوو هیجرەتیان کرد پلەیان بەرزترە لەوانەی یەک هیجرەتیان کرد، ئەوانەی پێش بەدر موسڵمان بوون پلەیان لەوانە بەرزترە کە دوای بەدر موسڵمان بوون، ئەوانەی پێش گۆڕینی قیبلە موسڵمان بوون پلەیان بەرزترە لەوانەی کە دوای گۆڕینی قیبلە موسڵمان بوون، ئەوانەی پێش ڕزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون پلەیان بەرزترە لەوانەی پاش ڕزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون. کەواتە هەروەک

---

(٩٦) هەمان پەراوێزی پێشەوە.

پلەوپایەی پێغەمبەران لە یەک ئاستدا نییە بەهەمان شێوەش پلەوپایەی هاوەڵان لە یەک ئاستدا نییە.

لەناو هاوەڵاندا پلەوپایەی ئەبو بەکری سدیق ﷺ لە هەموویان بەرزترە، یەکەم کەس بوو باوەڕی بە پێغەمبەری خوا هێنا ﷺ، بوو بە باشترین هاوەڵ و هاوڕێ تا کۆتایی ڕێ، پشتگیر و هاودەمی بوو. ئایەتی: (ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا)[٩٧]. واتە: یەکێك بوو لەو دوو کەسە کاتێك ئەو دووانە کە پێغەمبەری خوا و ئەبوبەکری سدیق بوون لە ئەشکەوتی سەوردا بوون ئەوکاتە بە هاوەڵەکەی دەوت: خەم مەخۆ بێگومان ﷻ لە گەڵمانە. وە ئایەتی: (وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ)[٩٨]. واتە: وە ئەو کەسەی قورئانی هێناوە و باوەڕیشی پێیەتی. دەربارەی ئەو دابەزی، یەکەم جێنشینی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، ئەبو بەکری هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ، خێرترینی ئوممەتی پێغەمبەری خوایە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەزڵی ئەوەندە گەورەیە کە ئیتتیفاق و ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامی لەسەرە، عالم و زاناترینی هاوەڵان بوو، شەرعناسترینی هاوەڵان بوو، لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ شایستەترین کەس بۆ خەلیفایەتی، ئەبو بەکری سدیق بوو ﷺ، بۆیە ئەبینین لەکاتی نەخۆشی سەرەمەرگی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(٩٧) التوبة: ٤٠.

(٩٨) الزمر: ٣٣.

دەفەرمووێت: ((مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ))[99]. واتە: بڕۆن بە دواى ئەبو بەکردا، با ئەو پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات. جگە لە ئەبو بەکری سدیق پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبووە کەس دوای خۆی جێنشینی بێت.

وە بێگومان هاوەڵی بەڕێز عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دووەم پلەدارترینی هاوەڵان بوو، کە موسڵمان بوونەکەی عیززەتی موسڵمانانی بەدوای خۆیدا هێنا، پیاوێکی ژیر و پڕ غیرەت بوو بۆ سەرخستنی دینی ﷲ، دووەم جێنشینی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، پێغمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "إِنِّي لَا أَدْرِي مَا بَقَائِي فِيكُمْ؛ فَاقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي، وَأَشَارَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ"[100]. واتە: من نازانم تا چەندی دیکە لەناوتاندا ئەمێنمەوە، بۆیە لە دوای من ئیقتیدا بکەن بە ئەبو بەکر و عومەڕەوە. ڕاوییەکەی ئەڵێ ئاماژەی بۆ ئەبو بەکر و عومەڕ کرد. بۆیە ئەبینین لەناو هاوەڵاندا کەس نەبووە فەزڵ بدەن بەسەر ئەبو بەکر و عومەڕدا.

پاشان عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ سێیەم پلەدارترینی هاوەڵان بوو، دووجار ببوو بە زاوای پێغەمبەری خوا ﷺ، سەرەتا کچێکی خۆی پێدا، ئەوەبوو وەفاتیکرد، پاشان کچێکی دیکەی پێدا، ئەویش وەفاتیکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووی: واللەی گەر کچێکی ترم هەبووایە ئەمدا پێت. تەواوی سەروەت و سامانەکەی خستە بەردەم پێغمبەری خوا ﷺ بۆ سەرخستنی دینی ﷲ،

---

(٩٩) سەحیحی بوخاری: ٦٦٤.

(١٠٠) جامیعی تورمزی: ٣٦٦٣.

بەشەرمترین پیاو بوو، بە چەشنێک فریشتەکانی اللَّهُ تعالی شەرمیان لێ ئەکرد، سێیەم جێنشینی پێغەمبەری خوابوو ﷺ، وە بە زوڵملێکراویش شەهیدکرا؛ خەواریجەکان لە ماڵی خۆیدا شەهیدیان کرد.

وە پاشان عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ چوارەم پلەدارترینی هاوەڵان بوو، ئامۆزا و زاوای پێغەمبەری خوابوو ﷺ، چوارەم جێنشین بوو، بێگومان فەزڵی ئیمامی عەلی زۆر گەورەیە، بەڵام بە کۆدەنگی زانایان فەزڵی ئیمامی عوسمان گەورەترە لە ئیمامی عەلی -اللَّهُ لە هەردووکیان ڕازی بێت-.

پاشان شەش هاوەڵەکەی دیکەی جگە لەم چوارە، لە پلەدارترینی هاوەڵانن، پەروەردگار لەمان و لە هاوەڵانی دیکە هەموو ڕازیبووە، وە دەربارەیان دەفەرمووێت: (وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ)[١٠١]. واتە: وە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچەران و یاریدەدەران ئەوانەش زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون، اللَّهُ لێیان ڕازییە ئەوانیش لە اللَّهُ ڕازین، وە اللَّهُ بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا، تێیدا دەمێننەوە بێ برانەوە، ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.

---

(١٠١) التوبة: ١٠٠.

بۆیە لە ئیمانێکی پاک و گەورە، پاراستنی دڵ و زوبانمانە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە شوێنکەوتنی ئاسەواریان و ئیقتیداکردن پێیان، لە دینێکی تەواوە، بۆ پاراستن لە ئاگری دۆزەخ.

بۆیە ئەم بابەتە کە بابەتی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە کاتی خۆیدا لە سەردەمی سەلەف بووە هۆکاری گومڕابوونی هەندێ گرووپ، بەوەی لاڕێ بوون دەربارەی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوەیە کە تەواوی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانی بەڕێزن، وە دڵ و دەمیان پارێزراوە دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هیچ ڕق و کینەیەکیان نییە دەرباری هاوەڵان.

## وَالْكَفُّ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَهُمْ.(١)

---

(١) وَالْكَفُّ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَهُمْ. واتە: وە ئەسڵیش وایە مرۆڤ دەمی بگرێتەوە دەربارەی ئەوەی لە نێوان هاوەڵاندا ڕویداوە. ئەمە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

**هۆکاری ناکۆکی نێوان هاوەڵان:**

هۆکاری ئەوەی ڕویداوە لە نێوانیان چەند حاڵەتێکە، ئەوانیش:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیداوە کە دوای خۆی خیلاف ئەکەوێتە نێوان هاوەڵان، بۆ ئەمە چەندین فەرموودەمان هەیە، وەکوو دەفەرمووێت: "**وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ**"[١٠٢]. واتە: من پارێزەری هاوەڵانی خۆمم، واتە تاکوو من مابم هاوەڵانم تووشی هیچ شتێک نابن، بەڵام کاتێک من ڕۆشتم ئەوە دێت بەسەر هاوەڵانمدا کە دێت بەسەریاندا لە ئیختیلاف. بەڵام ئەم ئیختیلافە کە ڕویدا (**لَا يَسلُبُوهُم فَضلَهُم**) واتە: بەهیچ شێوەیەک فەزڵی هاوەڵان دانامالێت.

---

(١٠٢) سەحیحی موسلیم: ٢٥٣١.

ئەوەی کە ڕویدا لە نێوانیان بەهۆی تەسلیم نەبوونیان بۆ بەڵگانی شەرع نەبوو، بەڵکوو لە تەنزیل و تەتبیقی هەندێکیان بوو بۆ بەڵگەکانی دین، وەک ئیختیلافی جوولەکە و گاور نەبوو، کە ئیختیلافی جوولەکە و گاور ئیختیلافی تەبدیل و تەحریف بوو، تەسلیم نەبوونیان بوو بۆ شەرعی پێغەمبەرەکەیان و مل نەدانیان بوو بۆ حەق، بەڵام خیلافی هاوەڵان لە تەنزیل و تەتبیقی بەڵگەکان بوو.

خیلافی هاوەڵان بە گشتی ئیجتیهادی بوو، وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێت: "إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ"[١٠٣]. واتە: گەر حاکمێک حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد، پاشان حوکمەکەی پێکای ئەوە دوو پاداشتی هەیە، وە گەر حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد، پاشان حوکمەکەی نەپێکا ئەوە هەر پاداشتێکی هەیە. ئەوانەشیان کە نەیانپێکاوە پاداشتێکیان بۆ هەیە بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەشی تووشیان بووە لە کێشە و شەڕ و ناخۆشی هەموویان لە بابی ئیجتیهادە و پەروەردگار ڕازی بووە لێیان، وە ئەو هاوەڵێتییە زۆرەی هەیانبووە بۆ پێغەمبەرەکەیان ئەو تۆزە هەڵەیەی کە هەندێکیان هەیانبووە ئەسڕێتەوە.

وە گەر هاتوو خیلافەکە فیقهی بوو، ئەوکات سەیری بەڵگەکانیان ئەکەین، کامیان بەهێزتربوو شوێن ئەوەیان ئەکەوین، ئەمە بۆ خیلاف، ئەمما ئیجماعیان

(١٠٣) سەحیحی بوخاری: ٧٣٥٢.

دینداریيە بۆ ئێمە، وە وتە و ئەسەرێکیان کە خیلاف نەبووبێ، ئەوەشیان دینداریتی پێوە ئەکرێت.

٢- ئیختیلافەکەیان بۆ پەند لێ وەرگرتنە، وەکو وتمان ئەسڵ دەستگرتنەوەیە لەوەی تووشیان بووە، وە تانەدان لە هەر هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا ﷺ، لارێبوونە لە مەنهەجی سەلەف، هەرکەس بکەوێتە ناو تانەدان لە هاوەڵان (فَهُوَ مُبتَدِعٌ ضَال)، ئەوە: موبتەدیعێکی لارێیە. وە ئەسڵ و بنەماکەشی ئەوەیە مرۆڤ پێی کافر نابێت، ئیللا کاتێک نەبێت کە بکەوێتە تانەدان لە تەواوی هاوەڵان، یاخود ڕقی لە دین و سوننەتەکەی ئەوان بووبێ، بێگومان ئەوە بەڵگەی کوفری کەسەکەیە، بەڵام تانەدان لە یەک هاوەڵ، دەرچوون ڕووئەدات لە بازنەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت. بە پێچەوانەی گرووپە کوفرییەکانەوە، لەوانە: ڕافیزە، کە ئەوان زۆر چاونەترسانە دەم بۆ هاوەڵان ئەبەن و تەکفیریان ئەکەن، بۆ ئەوەی گەر لەو ڕێیەوە هەرچی دینداری هاتبێت هەمووی بەتاڵ بکەنەوە و، ئەو دینە حەقەی کە هاوەڵان لەسەری بوون و هێناویانە، باوەڕیان پێی نەبێت.

بۆیە لەو بابەتە گرنگانەی کە پێویستە ئاگاداریان بین، بریتییە لە فەزڵدانی ئەبو بەکری سدیق، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب، پاشان عوسمانی کوڕی عەففان، پاشان عەلی کوڕی ئەبو تالیب، بەسەر تەواوی ئوممەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

لەناو سەلەفدا هەرکەس فەزڵی هەرکەسێک تەنانەت یەک کەسیش بێت بدات بەسەر ئەبو بەکری سدیق و پاشان عومەری کوڕی خەتتاب؛ ئەوە کەسێکی ڕافیزی کافر بووە، وە هەرکەسێکیش فەزڵی عەلی بدات بەسەر عوسماندا؛ پێیان وتووە شیعییەکی موبتەدیع.

بەڵام ئەبینیت لەم سەردەمەدا ئەم زاراوانە قڵپکراونەتەوە، بەوەی بە کەسانێک ئەوترێت شیعە کە لای سەلەف ئەوانە ڕافیزییەکی کافر بوون. وە بابەتی کافرێتی ڕافیزە لای سەلەف لەو ڕوانگەیە بوو، کە فەزڵی عەلیان ئەدا بەسەر ئەبو بەکری سدیق و عومەڕدا، بەڵام ئەمڕۆ کەسانێک کە خۆیان پاڵداوە بۆ لای ئیمامی عەلی کە بەهیچ جۆرێک لەوانەی پێشوو ناچن، دەیان و سەدان کوفریان هەیە، لە کاتێکدا ئەوانەی پێشوو وەکو ئەمانە نەبوون، بۆیە ئەمانە دینێکی دیکەیان هەیە لە جگە دینی ئیسلام، پەنا بە خوای رب العالمین!

٧- وَأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ كَمَا وَصَفَ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ، وَعَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَا كَيْفٍ.

(أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا)[١٠٤]. (لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ)[١٠٥].[١]

---

(١) وَأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ كَمَا وَصَفَ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ، وَعَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَا كَيْفٍ.

(أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا). (لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ)[١].

واته: وه اللَّهُ -عز وجل- لەسەر عەرشەکەیەتی و تێکەڵاوی دروستکراوەکانی نابێت، هەروەک چۆن خۆی وەسفی خۆیی کردووە لە پەرتووکەکەی، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەییەوە ﷺ وەسفی کردووە، بەبێ چۆنێتی بۆ دانان.

(اللَّهُ تعالى بەزانین و زانستی خۆی دەوری هەموو شتێکی داوە)، (هیچ شتێك بە وێنەی اللَّهُ نییە و ئەو بیسەری بینایە).

---

(١٠٤) الطلاق: ١٢.

(١٠٥) الشورى: ١١.

ئەبینین یەکێکی دیکە لە کۆدەنگییەکانی سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەت، جێگیرکردنی سیفەتی بەرزێتی و عولووی (الله تعالی)یە، بە شێوەیەک کە لائیق و شایستەیە بە زاتی خۆیەوە، وە بێگومان الله تعالی لەسەر عەرشە بە زاتی خۆی و، زانستەکەشی لە هەموو شوێنێکە.

بابەتی عولوو، بابەتێکە کە تەواوی بەڵگەکانی لەسەرە، کۆدەنگی زانایانی لەسەرە، چەندین ئایەت و فەرموودەی لەسەرە، خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەتدا سیفەتی عولووی بۆ خۆی جێگیر کردووە، وەکوو:

١- دەفەرمووێت: (وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ)[١٠٦]. واتە: وە هەر (الله تعالی)یە بڵند و پایە گەورە.

٢- وە کاتێک مرۆڤی باوەڕدار سەجدە دەبات بۆ الله تعالی: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى)[١٠٧]. واتە: بەپاکی یادی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە. یاخود مرۆڤ ئەڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى)، واتە: پاکی و بێگەردی بۆ اللهی بڵند.

٣- وە دەفەرمووێت: (وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ)[١٠٨]. واتە: وە هەر ئەوە دەست ڕۆیشتوو بەسەر بەندەکانیدا هەر ئەویش کاردروستی ئاگادارە.

---

(١٠٦) البقرة: ٢٥٥.
(١٠٧) الأعلى: ١.
(١٠٨) الأنعام: ١٨.

٤- وه ئەفەمووێت: (ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ)(١٠٩). واتە: ئایا دڵنیان لەو (اللّٰه)یەی لە ئاسمانە، کە بتانباتە خوارەوە بەناخی زەوییدا.

٥- وه دەفەرمووێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ)(١١٠). واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە و بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین. بێگومان نزوولی قورئان دەلیلە لەسەر علووی پەروەردگار، وە بێگومان نزوول و دابەزینی اللّٰه تعالی بەڵگەیە بۆ بەرزێنی و علووی اللّٰه تعالی، فەرموودەکان سەحیح و جێگیرن، وەکوو لە فەرموودەی ئەبو هوڕەیڕەدا بەڵگەی بەرزێتی (اللّٰه تعالی)ی تێدایە.

٦- وه بەرزبوونەوەی کرداریش بەڵگەیەکی ڕوونە، اللّٰه دەفەرمووێت: (إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ)(١١١). واتە: وتەی پاك و چاك تەنها بۆ لای ئەو سەردەکەوێ، وە وتەی پاك کردەوەی چاك بەرزی دەکاتەوە.

٧- وه دابەزینی فریشتەکان لە ئاسمانەوە بۆ زەوی بەڵگەی ئەوەیە کە پەروەردگارمان لە بەرزێتییە، وەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێت: (تَعْرُجُ

---

(١٠٩) الملك: ١٦.

(١١٠) الحجر: ٩.

(١١١) فاطر: ١٠.

ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ)[١١٢]. واته: فريشته و جبرييل سەر دەكەون بۆ لای ﷲ له ڕۆژێكدا كه ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە.

سیفەتی (بەرزێتی ﷲ تعالى بۆ سەر عەڕش بە زاتی خۆی) كۆدەنگی هاوەڵان و سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، لەوانە: شافیعی، مالیك، فوزەیلی كوڕی عیاز، سولەیمانی كوڕی حەڕب، ئیبو خوزەیمە و جگە لەوانیش بە دەق ئەو كۆدەنگییە ئەگوازنەوە.

بێگومان سیفەتی عولوو بەڵگەیەكی عەقڵی و شەرعیشە، تەنانەت ئەم سیفەتە بەرزەی پەروەردگاری ئێمە عاممە و كۆی میللەتە كوفرییەكانیش ئەم سیفەتەیان جێگیركردووە، یان لە فیترەتیاندا هەیە، ئیللا هەندێك لە گرووپ نەبێت كە شوێن فەلسەفە و ئەهلی كەلام كەوتن كە پێچەوانەی سروشت و فیترەت وەستانەوە، وە جەهمییەكانیش كە شوێنكەوتەی ئەوان بوون، دواتریش موعتەزیلەكان و دواتریش هەندێ لە ئەشعەرییەكان، وەكوو: جەعدی كوڕی درهەم، جەهمی كوڕی سەفوان، قازی عەبدولجەببار، جوەینی، غەزالی، ڕازی، ئامێدی..تاد، هەرچەندە هەندێك لە ئەشعەرییەكان لە پێشین و موتەقەددیمینەكانیان ئەم سیفەتەیان جێگیر كردووە، وە ڕەددی جەهمییەكان ئەدەنەوە كە ئینكاری و نكوولّی عولووی پەروەردگار ئەكەن، وەكو: ئیبنو كوللاب و، ئەبو حەسەنی ئەشعەریی و، قوتابییەكەی كە عەلی كوڕی مەهدی

---

(١١٢) المعارج: ٤.

تەبەرییە، وە ئەبو عەبباسی قەلانسی و، حارسی موحاسبی و، باقیللانی و، ئیبنو فورەک، ئەمانە لە هەندێ لە پەرتووکەکانیاندا سیفەتی عولوو جێگیر ئەکەن، بەڵام ئەوان پێیان وایە عولوو جێگیر ئەبێت بەتەنها بە نەقل، بەڵام عاممەی سەلەف سیفەتی عولوو جێگیر ئەکەن هەم بە نەقڵ، هەم بە ئەقڵیش.

بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە بابەتی عولوو بابەتێکی بڕوایە و کۆدەنگی هاوەڵان و سەلەفی لەسەرە، بەبێ هیچ ڕاجیاوازییەک.

**هەندێک بەڵگەی دیکە:**

پاشان هەندێکی دیکە لە بەڵگەکان بریتییە لە:

١- بەڵگەکانی عەرشی الله تعالی، کە جارێکی دیکە بەڵگەن لەسەر عولووی الله تعالی.

٢- وە بەڵگەی فیترەت و سروشتی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر ئەم بابەتە، تەنانەت بە منداڵێک ئەڵێیت: الله لە کوێیە، دەست بەرز ئەکاتەوە و سەر بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و ئەڵێ الله لە ئاسمانە.

٣- وە عەقڵیش پشتڕاستکەرەوەی ئەم بابەتەیە.

٤- وە سوفول(نزم)ی مەخلووقەکانیش بەڵگەیە، بەوەش مەخلوقەکان لە خوارەوەن و الله تعالی لەسەرەوەیە.

لە بیروباوەڕی دروستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، جێگیری سێ جۆر سیفەتی عولوو ئەکرێت بۆ الله تعالی، ئەوانیش:

١- **(عُلُوُّ الذَّات)**، واتە: بەرزبوونەوەی ﷲ تعالی بە خودی خۆی، پەروەردگارمان بەزاتی خۆی بەرزبۆتەوە بەسەر هەموو مەخلوقەکانییەوە و ئیستیوائی کردووە، ئیستیوایەک کە شایستەیە بە گەورەیی و بەرزی و توانا و دەسەڵاتی خۆیەوە.

٢- **(عُلُوُّ القَهرِ وَالقُدرَة)**، واتە: بەرزی دەسەڵات و توانا، پەروەردگارمان توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ شتێک نییە لە ژێر دەسەڵات و توانای ئەودا دەربچێت:

أ- (سُبْحَـٰنَهُۥ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ)[١١٣]. واتە: پاك و بێگەردە هەر ئەوە ﷲ تەنیای زاڵ و بە دەسەڵات.

ب- وە پەروەردگارمان لە سورەتی (الرحمن)دا دەفەرمووێت: (يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ)[١١٤]. واتە: ئەی کۆمەڵی جنۆکە و ئادەمی ئەگەر توانیتان دەرچن لە بەشەکانی ئاسمانەکان و زەوی ئەوە بڕۆن دەرچن ناشتوانن مەگەر بە دەسەڵاتێك، کە هەر ناشتوانن.

ت- وە دەفەرمووێت: (وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ)[١١٥]. واتە: وە هەر ئەوە دەست ڕۆیشتوو بەسەر بەندەکانیدا،

---

(١١٣) الزمر: ٤.
(١١٤) الرحمن: ٣٣.
(١١٥) الأنعام: ١٨.

هەر ئەویش کاردروستی ئاگاداره.

٣- (عُلُوُّ القَدَر)، واتە: بەرزی ڕێزی الله تعالی، ناو و سیفەتەکانی الله تعالی بەرزن و جوانن بەسەر هەموو شتێکەوە.

کەواتە ئەم سێ جۆرەی عولوو جێگیرە و دانی پێدا ئەنرێت، بە شێوەیەک کە شایستەبێت بە خودی خۆیەوە.

تەبعەن ئەم سێ جۆرەی عولوو و بەرزیتی الله تعالی جێگیربوو تاکو دەرکەوتنی جەهمییەکان و موعەتیلەکان، کە نکوڵی ئیستیواء و بەرزی (الله تعالی)یان کردووە، وە هەندێک گرووپیش کە لاڕێ و گومڕابوون لە بیروباوەڕی موسڵمانان، لەو گرووپانەش کە دروست بوون:

١) گرووپێکن پێیان وایە پەروەردگار نە داخیلی عالەمە و لە ناو عالەمە، نە خاریجی عالەمە و لە دەرەوەی عالەمە، تەبعەن ئەمانە نەفی هەموو شتێک ئەکەن لە الله تعالی کە: نەفی مەکان و، نەفی جیهەت و، نەفی حەدد ئەکەن!

ئەمەش بیروباوەڕی فەیلەسووفە یۆنانییەکان بوو، وە ئەوانەشی کە پەیڕەوکەری ئەوان بوون لە شوێنکەوتەکانیان، وەکو زۆرێک لە ئەشعەرییەکانی ئەم سەردەمە کە شوێنی فەلسەفەی ئەوان کەوتوون و بیروباوەڕیان دەربارەی ئەم سیفەتە وێنەی بیروباوەڕی ئەوانە، کە بیروباوەڕیان وایە پەروەردگار نە داخیلی

عالەمە نە خاریجی عالەمە، وە نەفی شوێن ئەکەن بۆ اللّٰه تعالی، وەک ئەبینین لە پەرتووکی [الوَاقِف]ی جورجانیدا هاتووە کە بێگومان ئەوە عومدەیە لای زۆرێک لە مامۆستاکانیان، وە بەهەمان شێوە ماتوریدییەکانیش وەک لە شەرحی [مقاصد التفتازاني]دا هاتووە، ئەوان پێیان وایە و دەڵێن: "إِنَّ اللهَ تَعَالَى لَا دَاخِلَ العَالَمِ وَلَا خَارِجَهُ". واتە: اللّٰه تعالی لە ناوەوەی عالەم نییە و لە دەرەوەشی نییە. "وَلَا مُتَّصِلَ وَلَا مُنفَصِلَ عَنهُ وَلَا فَوقَ وَلَا تَحتَ، وَلَا فَوقَ العَرشِ وَلَا تَحتَ العَرش". بیروباوەڕی ئەوان بەو شێوازەیە، وە ئەبینین کۆتا کەسی ماتوریدییەکان کە کەوسەرییە، ئەبینین بەوانەی کە بیروباوەڕی پێغەمبەری خوا و هاوەڵان و سەلەفی ساڵحیان هەیە دەربارەی عولووی اللّٰه تعالی، پێیان دەڵێن: ئەوانە عابیدی وەسەنن، واتە ئەهل سوننەت و جەماعەت بە بتپەرستن ناو ئەبەن، بەهەمان شێوە ئەبو مەنسووری ماتوریدیش بە هەمان شێوە بیروباوەڕی وایە کە اللّٰه تعالی مەکانی نییە.

٢) گرووپی گومڕای دووەم لەم بابەتەدا کە لاڕێبوون و خراپتر لاڕێبوون لە گرووپی یەکەم، بریتین لە: حولوولییەکان، ئەمانە بیروباوەڕیان وایە اللّٰه تعالی بە زات و خودی خۆی لە هەموو شوێنێکە، وە پێیان وایە اللّٰه ئەتوێتەوە لەناو مەخلووقاتدا، تاکوو ئەتوێتەوە لەناو شتە پیسەکانیشدا - تَعَالَى اللّٰه عَمَّا يَقُولُون- بەرزە ئەو زاتەی کە ئەوانە دەربارەی ئەو بوهاتانانە ئەکەن.

تەبعەن ئەسڵی بیروباوەڕی ئەمان ئەو بیروباوەڕەبوو کە لە مەجووسەکان وەرگیرابوو، کە لە وڵاتی فارس بوون، پاشانیش لە بوزی و هیندۆسییەکانی وڵاتی هیندستان وەریانگرتبوو، وە هەندێکیش لە فەیلەسوفەکانی یۆنان هەمان بیروباوڕیان هەبوو، بۆیە ئەسڵی (وَحدَةُ الوُجُود) ئەگەڕێتەوە بۆ هیندۆسی و بوزییەکان و ئەوانەشی کە کاریگەربوون پێیان، لەوانەی پاڵ ئەدران بۆ لای ئیسلام، لەکاتێکدا ئیسلام لەوان بەرییە، وەکوو: فاڕابی و، ئیبو سینا و، ئیبنو فاڕیز و، ئیبنو عەڕەبی و، ئیبنو سەبعین و، تلماسانی و، جگە لەوانیش لەوانەی عەقیدەی وەحدەتول وجودیان هەبوو، تەبعەن گومڕایی و سەرلێشێواوی ئەمانە زۆر زیاتربوو لە گومڕایی و سەرلێشێواوی گاور و جوولەکەکان؛ چونکە گاورەکان لە بیروباوەڕیاندا وایە لاهوت کە (ﷲ تعالی)یە تواوەتەوە لەگەڵ ناسوت کە عیسایە ، واتە بیروباوەڕی گاورەکان وایە، ﷲ تەنها لەناو عیسادا تواوەتەوە، بەڵام حولوولییەکان کە خۆیان بە موسڵمان ئەزانن، بیروباوەڕەکەیان حولوولی عاممە، واتە دەڵێن ﷲ لەناو هەموو شتێکدا تواوەتەوە، ئیتر خراپ و باش، پیس و پاک و ئاژەڵ و مرۆڤیش، کە پەنا بە ﷲ ئەوە بیروباوەڕێکی کوفرییە.

ئەم دوو گرووپە دوو گرووپی گومڕابوو و لاڕێبوون لە کۆمەڵی موسڵمانان.

عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ(١)

---

(١) عَلَى عَرْشِهِ بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ. پەروەردگارمان لەسەر عەڕشییەتی، لە قورئاندا حەوت ئایەتمان هەیە، پەروەردگار تێیاندا عەڕشی بۆخۆی جێگیر کردووە و، سیفەتی ئیستیوائی بۆخۆی جێگیر کردووە. تەبعەن ئیستیواء واتایەکی زیاترە لە عولوو، چونکە عولوو هەم بە عەقڵ هەم بە نەقڵ جێگیر بووە، بەڵام ئیستیواء بە نەقڵ جێگیر بووە! (وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ)[١١٦]. واتە: ئەویش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندین فەرموودەدا باسی عەڕشی کردووە.

**سیفەتەکانی عەڕش:**

وە لە سیفەتی عەڕش ئەوەیە:

١- **(قَوَائِم)**ی هەیە، واتە ڕاگری هەیە.

٢- وە کۆمەڵێک فریشتە هەڵیانگرتووە، وەکو ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَـٰنِيَةٌ)[١١٧]. واتە: وە لەو ڕۆژەدا

---

([١١٦]) التوبة: ١٢٩.

([١١٧]) الحاقة: ١٧.

هەشت فریشتە تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵدەگرێ لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە.

٣- وە عەرشی پەروەردگارمان لەسەر ئاوە (وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ)[١١٨]. واتە: عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو.

٤- وە لە سیفەتی هەڵگرانی عەرش کە لە [سنن أبي داود]دا هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموویت: "إِنَّ مَا بَيْنَ شَحْمَةِ أُذُنِهِ إِلَى عَاتِقِهِ مَسِيرَةُ سَبْعِمِائَةِ عَامٍ"[١١٩]. واتە: لە نەرمایی گوێچکی تاکوو سەرشانی حەوت سەد ساڵە ڕێیە.

٥- وە تەواف ئەکرێت بەدەوری عەرشدا، وەکو چۆن تەواف ئەکرێت بە دەوری کەعبەدا لەسەر زەوی، الله تعالی دەفەرمووێت: (ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ)[١٢٠]. واتە: ئەو فریشتانەی هەڵگری عەرشن و، ئەوانەشی بەدەوریدان بە ستایشی پەروەردگاریان تەسبیحات دەکەن. وە دەفەرمووێت: (وَتَرَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ)[١٢١]. واتە: وە فریشتەکان دەبینی چواردەوری عەرشیان داوە.

---

(١١٨) هود: ٧.
(١١٩) سونەنی أبو داوود: ٤٧٢٧.
(١٢٠) غافر: ٧.
(١٢١) الزمر: ٧٥.

بێگومان ئیستیوای ﷲ تعالی تایبەتترە لە عولووی ﷲ تعالی، وە واتای ئیستیواء خاسسە و زائیدە بەسەر عولودا، پاشان عولوو سیفەتێکی زاتییە، بەڵام ئیستیواء سیفەتێکی فیعلی پەروەردگارمانە، سیفەتی زاتیش لازمی (ﷲ تعالی)یە و (**لَا تَنفَكُّ عَلَى الذَّات**)، ئەمما سیفەتی کرداری (**عَلَى مَا يَشَاءُ الله، فَإن شَاءَ الإستِوَاء إستَوَى، إن لَم يَشَأ الإستِوَاء وَشَاءَ غَيرَه، لَم يَفعَل الإستِوَاء فَعَلَ غَيرَه**). بەو شێوازە کە زانایانمان باسیان کردووە، بێگومان پەروەردگارمان سیفەتی ئیستیوائی کردووە و سیفەتی ئیستیوائی سیفەتێی کردارییە.

ئەبێت ئاگامان لەوەبێت کە ئەڵێین ﷲ لەسەر عەرشەکەیەتی بە زاتی خۆی، نابێ وەکوو حولوولییەکان دەربارەی سیفەتی مەعییەت و ئەو ئایەتانە باوەڕمان وابێ ﷲ لە هەموو شوێنێکە، بەڵکوو باوەڕمان وایە کە بە بینین و بیستنی لەگەڵ مەخلووقاتدایە، ئەمەش ئیجماعی سەلەفە، (هُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ)[١٢٢]. واتە: وە لە هەرکوێ بن ﷲ لەگەڵتانە. سوفیانی سەوری و، عبداللەی کوڕی نافیع و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئیجماعی سەلەف نەقڵ ئەکەن لەسەر ئەوەی کە ﷲ تعالی لەو ئایەتەدا مەبەستی پێی (**بِعِلمِهِ**)یە، واتە: بە زاستەکەیەتی، ئەگینا بە زاتی خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی.

وە سەلەف بە بەردەوامی لە تابیعییەکان و تابیعی تابیعییەکانیش سیفەتی عەرشیان جێگیر کردووە بۆ ﷲ تعالی، وە جیابوونی (ﷲ تعالی)یان لە مەخلوقاتەکانی جێگیرکردووە، و هیچ ناکۆکی و ڕاجیاوازییەک دەربارەی ئەمە

---

([١٢٢]) الحديد: ٤.

لەناو هاوەڵاندا نەبووە، وەکو ئەوزاعی نەقڵی ئەکات و ئەڵێ: **"كُنَّا وَالتَّابِعُونَ مُتَوَافِرُونَ نَقُولَ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى فَوقَ عَرشِهِ، وَنُؤمِنُ بِمَا وَرَدَت فِيهِ السُّنَّةُ مِن صِفَاتِهِ"**. واتە: ئێمە و هەموو تابیعییەکان ئەمان وت: پەروەردگارمان لەسەر عەرشەکەی خۆیەتی، وە باوەڕمان بە تەواوی ئەو سیفەتانە هەیە کە لە تەواوی سوننەت و فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەری خوادا هاتووە.

کەواتە مەعییەتی ﷲ تعالی لەو ئایەتانەی کە هاتووە، وەکوو ئایەتی: (مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَـٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَمَا كَانُوا)[١٢٣]. واتە: چپەی هیچ سێ کەسێك نییە کە ﷲ چوارەمیان نەبێ، وە چپەی هیچ پێنج کەسێك نییە کە ئەو شەشەمیان نەبێت، وە نە کەمتر لەو ژمارە و نە زۆرتر نییە، مەگەر (ﷲ)یان لەگەڵدایە لە هەر جێگایەك دابن.

ئەوە بریتییە لە عیلم و ئیحاتە و زانستی پەروەردگار، بەوەی زانستی بە هەموو شوێنێک هەیە و هەمووی ئەبینێت، وە هەموو شتێک ئەبیستێت، بۆیە نابێت مەعییەت و عولوو تێکەڵ بکرێت، ئەوانەی تێکەڵی ئەکەن؛ بێگومان ئەکەونە نێو گومڕایی و سەرلێشێواوی و سەرگەردانییەوە.

---

(١٢٣) المجادلة: ٧.

## مەعییەتی اللە:

وە مەعییەت و لەگەڵبوونی اللە تعالی بۆ دروستکراوەکانی دوو جۆرە:

١- **(المَعِيَّةُ العَامَّة)**، واتە: لەگەڵبوونی گشتی، لەگەڵ تەواوی دروستکراوەکانی بە موسڵمان و کافرانەوە بەوەی زانستی پێیانە و دەیانبینێت و دەیانبیستێت، ڕووکەش و ناواخنیشیان.

٢- **(المَعِيَّةُ الخَاصَّة)**، واتە: لەگەڵبوونی تایبەتی، کە ئەمە تایبەتە بە ئیمانداران، وە پەیوەستە بە ڕێژەی گوێڕایەڵی بەندە بۆ اللە تعالی، تاکوو بەندە گوێڕاڵی اللە تعالی بێت؛ لەگەڵبوونی اللە بۆ ئەو زیاد ئەبێت، وەک اللە تعالی دەفەرمووێت: (إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ)[١٢٤]. واتە: بەڕاستی اللە لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە لە تاوان، هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن. یاخود دەفەرمووێت: (إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ)[١٢٥]. واتە: مەترسن بەڕاستی من لەگەڵتانام دەبیستم و دەبینم. وە ئەم جۆرە مەعییەتەش بریتییە لە ئیعانە و یارمەتیدان، وە ویقایە و پارێزگاری لێکردن، بۆیە ئەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکری سدیق ﷺ لە ئەشکەوتەکەدا بوون، ئایەت دابەزی و اللە تعالی

---

(١٢٤) النحل: ١٢٨.

(١٢٥) طه: ٤٦.

لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ فەرمووی: (لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا)[١٢٦].
واتە: خەم مەخۆ بێگومان اللَّهُ لە گەڵمانە.

تەنانەت لە کەلامی عەرەبدا مەعییەت، بەواتای تێکەڵبوونی دوو شت نایەت بەیەکەوە بە زات و خود، بۆیە ئەبینین اللَّهُ تعالی دەفەرموویت: (مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ)[١٢٧]. واتە: **موحەممەد** ﷺ پێغەمبەری خوایە ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێباوەڕان توندوتیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین. یان (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَكُونُوا مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ)[١٢٨]. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە تۆڵەی اللَّهُ وە لەگەڵ ڕاستگۆیاندابن و لە ڕیزی ئەواندابن. واتە لەسەر ڕێگای ئەوانبە.

کەواتە: ئەمە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، کە باوەڕیان وایە: "**كَمَا وَصَفَ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ، وَعَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَا كَيْفٍ**". واتە: هەروەک چۆن اللَّهُ تعالی ئەو سیفەتەی بۆ خۆی جێگیرکردووە لە پەرتووکەکەیدا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە فەرموودەکانیدا بۆی جێگیرکردووە، بەبێ چۆنێتی بۆ دانان.

کەواتە ئەبێ باوەڕمان وابێ هەر سیفەتێک اللَّهُ تعالی لە قورئان یان پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودە سەحیحەکاندا جێگیریان کردووە بۆ اللَّهُ تعالی

---

(١٢٦) التوبة: ٤٠.
(١٢٧) الفتح: ٢٩.
(١٢٨) التوبة: ١١٩.

ئێمه جێگیری بکەین، وه هەر سیفەتێک ﷲ تعالى نەفی کردووه بۆخۆی ئێمەش نەفی بکەین، وه ئەوەشی ئەوان هیچیان نەفەرمووە دەربارەی، ئێمەش بوەستین و هیچ نەڵێین، وه (بِلَا كَيْفٍ).

تەبعەن دەربارەی سیفەتی ﷲ تعالى پرسیاری چۆنێتییەکەی ناکرێت، بۆ؟ لەبەرەوەی وەڵامەکەی لای کەسی پرسیارلێکراو نادیارە و نەیبینیوە و نازانێ، کەیفییەتی سیفەتی ﷲ تعالى بەس خۆی ئەزانێ چۆنە، ئەمەش واتای ئەوە نییە کە هیچ سیفەتێکی ﷲ تعالى کەیفییەتی نەبێت، بەڵکوو کەیفییەت و چۆنێتی هەیە، بەڵام ئێمە نایزانین و پێمان نەوتراوە، چونکە چۆنێتییەکەی (لَا يَعلَمُهَا إِلَّا الله سُبحَانَهُ وَتَعَالَى)، هیچ کەسێ نایزانێ تەنها ﷲ خۆی نەبێت، بۆیە ئەبینین سەلەف فەرمانیان کردووە بە ڕواندنی دەقەکانی سیفات چۆن هاتووە، ئاوا واتا بکرێت (بِلَفظِهَا وَمَعنَاهَا)، بەڵام (بِلَا كَيف)، واته: بەبێ چۆنێتی بۆ دانان، هەروەک پرسیارکراوە لە مەکحوول و زوهری و جگە لەوانیش دەربارەی ئەو فەرموودانەی لە باسی سیفەتی (ﷲ تعالى)دا هاتوون، وتوویانە: (أُمِرُّوهَا كَمَا جَاءَت)، واته: وەریبگرن و واتای بکەن، هەروەک هاتووە، بەبێ چۆنێتی بۆ دانان. هەروەها پرسیاریش لە ئیمامی مالیک کرا و وترا: (ٱلرَّحْمَـٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ) كَيفَ إستَوَى؟ واته: چۆن ئیستوای کرد؟ ئەویش وتی: "الإِستوَاءُ غَيرُ مَجهُول، وَالكَيفُ غَيرُ مَعقُول، وَالإِقرَارُ بِهِ إِيمَانٌ، وَالجُحُودُ بِهِ كُفُر". واته: واتای ئیسیوا ڕوونە و نەزانراو نییە، بەڵام چۆنێتی بۆ دانانی درکپێکراو نییە و مرۆڤەکان ناتوانن درکی پێبکەن، دانپێدانی ئیستوائی ﷲ تعالى ئیمانە، وه

نکووڵی کردنی کوفره.

بۆیە ئەوە بیروباوەڕی سەلەف و زانایانمانە، بە خیلاف و پێچەوانەی ئەهلی بیدەع و گومڕایی لە ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان! کە بێگومان ئەبینین ئەشعەرییەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە شوێنکەوتەی ئیمامی شافیعی و هاوەڵانی شافیعی ئەکەن، وە شوێنکەوتەی ئیمامی مالیک و هاوەڵانی مالیکن لە فڕوعدا، نەک ئوسووڵ، چونکە مالیک و شافیعی لەسەر عەقیدەی هاوەڵان و پێش خۆیان بوون، سیفەتی عولوو و ئیستوائیان جێگیرکردووە، وە تەواوی سیفەتەکانی دیکەشیان جێگیرکردوە، لەوانە: (وَجَه، يَدَين، نُزُول، غَضَب، رِضَا، رَحمَة..)، بەڵام ئەبینین ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان بەم جۆرەنین و گومڕابوون لە ڕێبازی هاوەڵان.

وە ئەم دوو گروپە کە خۆیان بە ئەهلی سوننە ئەزانن، ئەهلی سوننە بەرین لەوان و ئەوان بەهیچ شێوەیەک ئەهلی سوننە نین، وە ئەوان ئەو ڕاجیاوازییەی لە نێوانیاندا هەیە، تەنها ڕاجیاوازییەکی لەفزییە!

ماتوردییەکان هەمان بیروباوەڕی ئەشعەرییەکانیان هەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە ماتوردییەکان دەمارگیرترن لەسەر عەقیدەی بەتاڵی خۆیان، بەڵام ئەشعەرییەکان وەک ئەوان دەمارگیرنین، بۆیە ئەبینین هەندێک لە سەرانی ئەشعەرییەکان، وەک باس ئەکرێت و هاتووە، گەڕاونەتەوە لە کۆتایی تەمەنیان، لە هەندێک لەو عەقیدەیەی کە هەیانبووە، وەک ئەبینین (ڕازی)یان لە ڕیسالەکەیدا بەناوی [ذَمُّ

ذَاتِ الدُنيَا]دا هاتووە، وە بەهەمان شێوە جوەینی لە پەرتووکی [النِّظَامِيَّة]دا، لە هەندێک لەو عەقیدە بەتاڵەی هەیبووە لەپێشوودا لە تەئویل و تەحریفی سیفەتی ﷲ تعالی پەشیمان بۆتەوە، وە غەزالیش لە پەرتووکی [إِلجَامُ العَوَامِ عَن عِلمِ الكَلَام]دا، لە هەندێک لەو عەقیدە پووچ و بەتاڵەی لەسەری بوو پەشیمان بوویەوە، کە ئەشعەرییەکانی ئێستە لەسەرینە، بەڵام لەناو ماتوریدییەکاندا دەگمەن ئەبینین گەڕانەوەیان تێدابووبێ، بە خیلاف و پێچەوانەی ئەشعەرییەکانەوە کە هەندێکیان لە هەندێک قسەیان گەڕاونەتەوە و پەشیمان بوونەتەوە!

(أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا)[١٢٩]. واتە: ﷲ تعالی زانستی بە هەموو شتێک هەیە و زانستی ﷲ تعالی چواردەوری هەموو شتێکی داوە. بەڵام بەهەمان شێوە (لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ)[١٣٠]. واتە: ﷲ تعالی لە هیچ شتێک ناچێت و هیچ لەو ناچێت، وە خاوەنی سیفەتی بیستن و بینینە. دەبینین ڕازییەین بابەتی (إِحَاطَة)ی (ﷲ تعالی)یان هێناوە، ئیحاتەی ﷲ تعالی بە هەموو شتێک، وە نەفی شەبیهی پەروەردگار.

لەم بابەتەدا بابەتی (حَدّ) باس ئەکرێت، پەروەردگارمان کە لە سەروو حەوت ئاسمانەکەوەیە، سەلەفی ساڵح سیفەتی (حەدد) جێگیر ئەکەن، واتە: (بَائِنٌ مِن خَلقِهِ، وَمُنفَصِلٌ عَنهُ). واتە: پەروەردگارمان جیایە لە دروستکراوەکانی و

---

(١٢٩) الطلاق: ١٢.

(١٣٠) الشورى: ١١.

بەهیچ جۆرێک تێکەڵی دروستکراوەکانی نەبووە. حەدد بەم واتەیەیە، واتە (جیایەتی ﷲ تعالی و تێکەڵنەبوونی لەگەڵ دروستکراوەکانی)، کە ئەمە کۆدەنگی تەواوی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، بە پێچەوانەی جەهمییەکان کە باوەڕیان بە بوونی خوایەکی جیابوو لە دروستکراوەکانی نییە کە لەسەر عەرشەکەی بێت.

تەبعەن گەر نەفیکردنی وشەی حەدد جێگیر بووبێ لەهەندێک لە ئەهلی سوننەوە، ئەوە مەبەستیان دوو شتە:

١- یان مەبەستیان پەی نەبردنی زانستی دروستکراوەکانە بە ﷲ تعالی و سیفەتەکانی، بێگومان (وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا)[١٣١]. واتە: هیچ کەسێک ناتوانێت پەی بە پەروەردگار بەرێت.

٢- یان مەبەستیان چۆنێتی دانان بۆ سیفەتی حەددی ﷲ تعالی بووە، بەوەی خوایەک ئیستوای کردووە و لەسەر عەرشەکەیەتی و چۆنێتیکەی نازانین.

بەڵام حەددێک بەواتای (مُنفَصِلٌ)ی و جیایی لە دروستکراوەکانی، ئەمە بیروباوەڕی هاوەڵان و سەلەفی ساڵح بووە، کە لە ئیبنو مەندە و جگە لەوانیش هاتووە، وەک ئیمامی "دەشتی" لە [إثبات الحد]دا هێناویەتی، کە وتوویانە: "لَا دِينَ لِمَن لَا يَرى للهِ الحَدّ؛ لِأَنَّهُ يُسقِطُ مِن بَينِهِ وَبَينَ اللهِ حَاجِزَة وَالحِجَاب". واتە: دینی نییە ئەو کەسەی پێی وانەبێ ﷲ جیا نییە لە

---

[١٣١] طه: ١١٠.

دروستکراوەکان؛ چونکە بەمە پەردە و نێوانی خۆی و ﷲ تعالى ناهێڵێت.

ئیمامی "دەشتی" ئەڵێت: "مَن قَالَ لَيسَ للهِ حَدٌّ، يَعنِي بِذلِكَ أَنَّ اللهَ فِي كلِّ مَكَان، فَقَد إِرتَدَّ عَن دِينِ الإسلَامِ ولَحِقَ بِالمُشرِكِينَ، وَكَفَرَ بِاللهِ وَبِآيَاتِهِ". واتە: هەرکەسێک بڵێت ﷲ جیا نییە لە دروستکراوەکانی، مەبەستی بەوە بریتی بێت لەوەی ﷲ لە هەموو شوێنێکە، ئەوە هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام و بە موسڵمان حیساب ناکرێت، وە شوێن ئەهلی شیرک کەوتووە و، بێگومان کافر بووە بە ﷲ و ئایەتەکانی.

کەواتە لە بیروباوەڕی هاوەڵان و سەلەف و ئەهلی سوننەت و جەماعەت وایە کە ﷲ تعالى لەسەر عەرشە و عولووی کردووە و ئیستیوائی کردووە بۆ سەر عەرش و جیایە لە دروستکراوەکانی، وە پەردە و حیجاب هەیە لە نێوان ﷲ کە خالیقە لەگەڵ ئەوانی دیکە کە دروستکراون، وە سیفەتی عولوو و ئیستیواء جێگیرە بۆ ﷲ تعالى، وە تەواوی ئەو سیفەتانەی کە خۆی فەرموویەتی لە قورئان یان فەرموودە قودسییەکاندا، یان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی لە فەرموودە سەحیحەکان، بەبێ پرسیارکردن لە چۆنێتی سیفەتەکە، وە زانستی ﷲ تعالى هەموو شتێکی گرتۆتەوە، وە لە هیچ شتێک ناچێت و هیچ شتێکیش لەو ناچێت، وە زاتێکە تەواوی دەنگەکان ئەبیستێت و هەموو شتێکیش ئەبینێت، ئەمەی باسکرا کۆدەنگی سەلەف و ئەهلی سوننەت و جەماعەتە دەربارەی مەعییەت و عولوو و ئیستیوائی ﷲ تعالى، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتە.

٨- وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُرَى فِي الْآخِرَةِ، يَرَاهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ بِأَبْصَارِهِمْ. وَيَسْمَعُونَ كَلَامَهُ كَيْفَ شَاءَ وَكَمَا شَاءَ.(١)

---

(١) **وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُرَى فِي الْآخِرَةِ، يَرَاهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ بِأَبْصَارِهِمْ. وَيَسْمَعُونَ كَلَامَهُ كَيْفَ شَاءَ وَكَمَا شَاءَ.** واته: وە ﷲ تبارك و تعالى ئەبينرێت لە قيامەتدا، ئەهلى بەهەشت ﷲ تعالى ئەبينن بە چاوى سەريان و، گوێيان لە دەنگى ﷲ تعالى ئەبێت، چۆنى بيەوێت و چى بوێت.

بێگومان يەكێک لە بيروباوەڕەكانى ئەهلى سوننەت و جەماعەت بينينى (ﷲ تعالى)يە بەچاوى سەر لە ڕۆژى قيامەتدا، ئەمە ئايەت و وفەرموودەى سەحيح و كۆدەنگى هاوەڵان و سەلەف و ئەهلى سوننەت و جەماعەتى لەسەرە، هەروەک:

١- ﷲ تعالى دەفەرمووێت: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾)[١٣٢].
واته: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن ﴿٢٢﴾ تەماشاى پەروەردگاريان دەكەن ﴿٢٣﴾.

(نَّاضِرَةٌ) ڕوخسارى جوان و گەشاوەيە كە تەماشاى پەروەردگاريان

---

(١٣٢) القيامة: ٢٢ و ٢٣.

ئەکەن، بۆیە هیچ ڕاجیاوازییەک نییە دەربارەی بینینی ﷲ تعالى لە لایەن بەندەکانییەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

بۆیە ئیبنو عەبباس و، حەسەنی بەسری و، موجاهید و، عیکریمە و، ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید و زۆرێکی دیکە لە سەلەف بەم جۆرە تەفسیریان کردووە.

٢- وە دەفەرمووێت: (لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ). واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە پاداشتی چاکتر و زیاتریان هەیە.

تەفسیری (وَزِيَادَةٌ) لە خودی پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: "(ٱلْحُسْنَىٰ) يَعنِي: الجَنَّة، (وَزِيَادَةٌ) يَعنِي: الرُّؤيَة". [لە فەرموودەی سوهەیبەوە هاتووە لە (صحيح مسلم) و (المسند لأحمد)]. واتە: بۆ چاکەکار و ئیمانداران بەهەشتێک هەیە و زیاتر لە بەهەشت، کە بریتییە لە بینینی ﷲ تعالى.

٣- ﷲ تعالى کافرەکان مەحرووم دەکات لە بینینی خۆی، وەک لە ئایەتێک لە سوورەتی [المطففين]دا دەفەرمووێت: (كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ)[١٣٣]. واتە: نەخێر بەڕاستی ئەوان لەو ڕۆژەدا، بێ بەشن لە بینینی پەروەردگاریان.

---

(١٣٣) المطففين: ١٥.

ئەم ئايەتە هەندێ لە سەلەف، وەک: ئيبنو عويەينە و، ئيبنو موبارەك و، ماليك و، شافيعی و، وەكيع و، ئەحمەد و، حەسەنی بەسری و، هەندێكی ديكەش لە سەلەف دەڵێن: مادام كافران حەجب بكرێن و پەردەيەک لە نێوان ئەوان و (ﷲ تعالی)دا هەبێت، ئەوە بێگومان بينينی ﷲ تعالی تايبەتە بە ئيمانداران.

٤- وە ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَـٰمٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا)[١٣٤]. واتە: ڕۆژێ باوەڕداران دەگەنە خزمەتی ئەو، بەخێر هاتنيان بە سەلامە، وە ﷲ پاداشتی چاكی بۆ ئامادەكردوون.

كۆدەنگی ئەهلی لوغە وەكو (الثعلب)و جگە لەوانيش دەڵێن: (لِقَاء) كاتێک ئەبێت كە: (مُصَاحَبَة وَمُعَايَنَة وَنَظَر)ی لەگەڵدا بێت و بەچاويش بێت، وە بەڵگەكانی ديكەش زۆرن.

٥- لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خواش ﷺ لە [الصحيحين]دا هاتووە لە فەرموودەكەی جابر و جەريری كوڕی عبداللەی بەجەلی كە ئەڵێ: دانيشتين لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، سەيری مانگی ئەكرد لە شەوی ١٤ دا، فەرمووی: "إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ عِيَانًا[١٣٥] كَمَا تَرَوْنَ هَذَا، لَا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ[١٣٦]". واتە: بێگومان پەروەردگارتان ئەبينن

(١٣٤) الأحزاب: ٤٤.
(١٣٥) سەحيحی بوخاری: ٧٤٣٥.
(١٣٦) سەحيحی بوخاری: ٧٤٣٦.

بەچاوەکانی سەرتان وەکو چۆن ئەو مانگە ئەبینن، وە هیچ ناڕەحەتییەکتان تووش نابێت لە بینینی پەروەردگاردا.

تەبعەن ئەم فەرموودەیە کە هاتووە تەشبیهـ و چواندی حاڵی بینینە بە بینین، نەک بینراو بە بینراو، ئەمەش بێگومان کۆدەنگی تەواوی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و موسڵمانانە لە بابەتی بینینی (اللهُ تعالی)دا بەچاوی سەر.

بابەتێکی دیکەی پەیوەندیدار بە بینینەوە، بریتییە لە بینینی پێغەمبەری خوا بۆ اللهُ تعالی، ئایا پێغمبەری خوا ﷺ (اللهُ تعالی)ی بینی لە ئاسمانەکان، کاتێک میعراجی پێکرا؟

سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەم بابەتەدا خیلافێک لە ناویاندا هەیە، ئەویش ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوی سەر پەروەردگاری بینی؟ یان بە چاوی دڵ پەروەردگاری بینی؟

زۆربەی سەلەف لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەچاوی سەر پەروەدگاری نەبینیوە، بەڵکوو (رَأَى رَبَّهُ بِفُؤَادِهِ). واتە: پەروەردگاری بە دڵ بینیوە، نەوەک بە چاوی سەری. ئەم بۆچوونە لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە و، زۆرێک لە سەلەف لەسەر ئەم بۆچوونەن، کە ئەڵێ پەروەردگاری بینیوە بە دڵ، نەک بە چاوی سەر، ئەمەش بەم بەڵگانە:

١- لە فەرموودەکاندا هاتووە دەفەرمووێت: "حِجَابُهُ النُّورُ "، وَفِي رِوَايَةِ أَبِي بَكْرٍ: "النَّارُ لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ

خَلْقِهِ"[١٣٧]. واتە: پەردەیەک لە نێوان پەروەدگار و مەخلووقەکاندا هەیە، گەر بێتوو ئەو پەردەیە لاببردرێت ئەوە بەهۆی نوری ڕوخساری پەروەردگارەوە ئەو مەخلووقاتانە ئەسوتێن.

٢- یاخود لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە، دەفەرمووێت: "رَأَيْتُ نُورًا"[١٣٨]. واتە: تەنها نورێکم بینی.

٣- یاخود: "نُورٌ، أَنَّى أَرَاهُ"[١٣٩]. واتە: ئەوەی بینینم نورێک بوو.

هەرچەند وتەی دووەمیش هەیە کە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردگاری بەچاوی سەر بینیوە، وەک لە ئەسەرێکدا لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتکراوە ئەڵێ: "الخُلَّةُ لِإبرَاهِيم، وَالكَلَامُ لِموسَى، وَرُأيَةُ لِمحَمَّدٍ ﷺ". واتە: زۆرخۆشەویستن و خوللە بۆ ئیبراهیم بوو ﷺ، وە قسەکردنی ﷲ لەگەڵ مەخلووقدا بۆ موسابوو ﷺ، وە بینینیش بۆ موحەممەد بوو ﷺ لە شەوی میعراجدا.

بەڵام کۆدەنگی لەسەر ئەوەیە کە ئەکرێت ئیماندار پەروەردگاری ببینێت لە خەودا.

وە بابەتی ئەوەی کە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردگاری خۆی بینیوە بە چاوی سەر یان دڵ: زۆربەی سەلەف لەسەر ئەوەن بە دڵ بینیویەتی، ئەمەش بەڵگەیە کە بەدڵنیاییەوە بە چاوی سەر لە قیامەتدا پەروەردگار ئەبینرێت.

---

[١٣٧] سەحیحی موسلیم: ١٧٩.

[١٣٨] سەحیحی موسلیم: ١٧٨.

[١٣٩] سەحیحی موسلیم: ١٧٨.

ئەوانەی کە لە ڕێبازی سەلەف و ئەهلی سوننەت لایانداوە، بە هۆی هەندێک گومانەوە لایانداوە، لەوانە:

١- جەهمییەکان و موعتەزیلەکان: هەندێکیان کە ئەسڵەن باوەڕیان بە سیفەتی ﷲ تعالی نییە، کە ئەمە جەهمییەکانن، شتێکیش سیفەتی نەبێت؛ ناگونجێت ببینرێت!

هەندێکی دیکەیان ئایەتێک بووە بە گومان لایان، ئەویش ئایەتی: (لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ)[١٤٠]. واتە: چاوەکان درک بە پەروەردگار ناکەن، بەڵام ئەو درکیش بە چاوەکان ئەکات.

تەبعەن لێرەدا پەروەردگار نەفی ڕوئیەت و بینین ناکات، بەڵکوو نەفی ئیدراک و پەی پێبردن ئەکات، ئەم دووانەش جیاوازییان هەیە، بەوەی مەرج نییە ئەوەی ئەیبینین ئیتر تەواو درک بە حەقیقەتەکەی بکەین، زۆرجار زۆر شت هەیە مەخلووقیشە ئێمە بەچاو ئەیانبینین، بەڵام درک بە حەقیقەتەکەی ناکەین، گەر سەربەرز بکەینەوە بۆ ئاسمان، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان ئەبینین، بەڵام درک بە حەقیەتەکەیان ناکەین.

گومانێکی دیکە لەم بابەتەدا لەلایەن لادەر و گومڕاکانەوە، کە بنەما و ئەسڵێکی ئەوانە بریتییە لەوەی دەڵێن: شتێک ئەبینرێت کە لاشە و جیسم بێت، گەر جیسم بدرێتە پاڵ پەروەردگار ئەوە شوبهاندنی خالیقە بە مەخلووقەوە، ئەمە و هەندێ گومانی دیکەی بێ بنەما.

---

(١٤٠) الأنعام: ١٠٣.

بێگومان بابەتی بینینی ﷲ تعالى بابەتێکی بڕاوەیە لای موسڵمانان، ئەوە لە چەند شوێنێکیشدا لە قورئاندا هاتووە کە موسا ﷺ داوای بینینی ﷲ تعالى کردووە، وەک ئەڵێ: (وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَـٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَـٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ)[١٤١]. واتە: وە کاتێ موسا گەیشتە ژوانگە بۆ لای ئێمە و پەروەردگار وتووێژی لەگەڵدا کرد وتی: ئەی پەروەردگارم خۆتم نیشان بدە تا بتبینم، پەروەردگار فەرمووی: تۆ لە دونیادا من نابینی بەڵام سەیری لای شاخەکە بکە جا ئەگەر ئەو شاخە لە شوێنی خۆیدا نەجوڵا ئەوە دوای کەمێك تۆش دەمبینی، جا کاتێ پەروەردگاری خۆی دەرخست بۆ شاخەکە، شاخەکەی وردکرد و لەگەڵ زەویدا تەختی کرد و، موساش بەبێ هۆشی کەوت بەڕوودا، جا وەختێ هۆشی بەخۆیدا هاتەوە و چاك بوویەوە فەرمووی: پاکی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار بە پەشیمانی گەڕامەوە بۆ لات و، من یەکەمی بڕوادارانم.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بینینی ﷲ تعالى، ئەم ئایەتەش موعتەزیلە و جەهمییەکان ئەیکەن بە بەڵگە لەسەر نەبینینی پەروەردگار، بەڵام بە پێچەوانەوە بەڵگەیە لەسەر بینینی پەروەردگار، چونکە موسا ﷺ داوای بینینی ﷲ تعالى ئەکات، ئەمە زانست و عیلمی موسایە بەوەی ﷲ تعالى ئەبینرێت، وە داوای شتێکی موستەحیل ناکات، بەڵام دیارە لە دونیادا هیچ کەسێک ناتوانێت

---

([١٤١]) الأعراف: ١٤٣.

پەروەردگار ببینێت، بەڵکوو ئەو بینینە بۆ قیامەتە، پاشانیش پەروەردگار لۆمەی موسا ناکات لەسەر ئەو داوایەی کە ئەیکات، بەڵکوو لەسەر ئەوە لۆمەی ئەکات کە توانای بینینەکەی نییە، شاخێک بەو بەهێزییەوە توانای بینینی (ﷲ تعالى)ی نەبێت، ئەوە مرۆڤەکان ئەولاترن بەوەی ئەو توانایەیان نەبێت. وە (لَن تَرَىٰنِي) بەڵگە نییە لەسەر موستەحیل و ئەستەم بوونی ئەو شتە، بەڵکوو **(يَدُلُّ عَلَى جَوَازِهِ وَعَدَمِ الإذنِ بِهِ)**. واتە: بەڵگەیە لەسەر دروستێتی بینینی، بەڵام ﷲ تعالى مۆڵەتی نەدا بەوەی ببینرێت. (ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِي). چۆن شاخێک پەروەردگاری بینیوە، ئاوهاش دروستە مرۆڤانێک پەروەردگاریان ببینن، بەڵام لە دونیادا نا، بەڵکوو لە قیامەتدا. پاشانیش (فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ) بۆ شاخێک لە دونیادا خۆی دەربخات، ئەولاترە بۆ مرۆڤ لە قیامەتدا خۆی دەربخات، بۆیە لە قیامەتیشدا خۆی تەجەللا ئەکات و خۆی پیشان ئەدات بۆ بەندەکانی.

کەواتە کۆدەنگی سەلەف و ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەیە کە پەروەردگار بە چاوی سەر لە قیامەتدا ئەبینرێت، بەپێچەوانەی جەهمی و موعتەزیلەکان، کە ئەوان باوەڕیان بە بینینی پەروەدگار نییە.

٢- ئەشعەرییەکان: کۆنەکانیان لە ئەبو حەسەنی ئەشعەری و هاوەڵەکانی پێیان وابوو کە پەروەردگار ئەبینرێت، بەڵکوو خودی ئەبو حەسەنی ئەشعەری کۆدەنگی نەقڵ ئەکات لەسەر ئەوەی پەروەردگار بە چاوی سەر ئەبینرێت، بەڵام ئەشعەرییەکانی سەردەم زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە ئەو

بینینه بینینی عیلمه، وه زیادەی کەشفی قەلبی و نەفسییه، نەک ڕوئیه و بینینی چاو، ئەوانیش: ئەبو ئیسحاقی ئیسفڕاینی و ڕازی و جگه لەوانیش، ئەوان ئەشڵێن گەر بشبینرێت، ئەوه له جیهەت و چاوەوه نییه، بێگومان ئەوەش بیروباوەڕێکی بەتاڵه و بیروباوەڕی جەهمییەکانه لەم بابەتەدا.

٣- گرووپێکی دیکەش هەن که لادەر و گومڕان و بیروباوەڕێکی کوفرییان هەیه، ئەوانیش حولوولی و ئیتتیحادییەکانن، ئەمانه پێیان وایه هەر له دونیادا ئەتوانرێت پەروەردگار به چاوەکانی سەر ببینرێت، ئەمەش بۆچوونی (إبنُ عَرَبِي وَإبنُ فَارِض)بووه، که ئیبنو فاریز له شیعرێکیدا له دیوانەکەیدا ئەڵێ:

وَإذَا سَألتُكَ أَن أَراكَ حَقِيقَةً          فاسمَح وَلَا تَجعَل جَوَابِي لَن تَرَىٰ

واته:

گەر داوام لێکردی بتبینم به حەقیقەت

داواکەم قەبووڵ بکه و، وەڵامم مەدەرەوه بڵێی ناتوانیت!

بێگومان حولوولی و ئیتتیحادییەکان زیادەڕەوییەکەیان توندتره، پێگه و مەنزیلەتی خۆیان له موسا به گەورەتر ئەزانن، موسا عليه السلام به گوێی خۆی گوێی له دەنگی پەروەردگار بووه و قسەی لەگەڵ کردووه، بەڵام نەیتوانییەوه ببینێت، گەر وەڵامی کەسێکی بدایەتەوه له دونیادا، ئەوه وەڵامی موسای ئەدایەوه ﷺ.

کەواته بابەتی بینینی الله تعالی وەکو ڕازییەین دەڵێن: "وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُرَى فِي الْآخِرَةِ، يَرَاهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ بِأَبْصَارِهِمْ. وَيَسْمَعُونَ كَلَامَهُ كَيْفَ شَاءَ وَكَمَا

شَاءَ". واته: بێگومان الله تعالى له قیامەتدا ئەبینرێت بەچاوی سەر لەلایەن بەهەشتییەکانەوە. وە گوێیان لە دەنگی پەروەردگار ئەبێت و هەرچۆنێک بیەوێت و بەهەرشێوەیەک بیەوێت. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "أَمَا إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لَا تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ"[١٤٢]. واته: بەئاگابن ڕادەوەستێنرێن بەرامبەر پەروەردگارتان، وە پەروەردگار ئەبینن وەک چۆن ئەو مانگە ئەبینن، وە تووشی هیچ ناڕەحەتییەکیش نابن لە بینینیدا.

هەرکەسێک بیروباوەڕی وابێت پەروەردگار نابینرێت؛ کافربووە بە الله تعالى و قورئان و، فەرموودەی بەدرۆ خستۆتەوە و، باوەڕی بە خوایەک نییە ببینرێت.

وە پەروەردگارمان لە قیامەتدا قسە لەگەڵ بەندەکانی ئەکات و ئەوان گوێیان لە دەنگی پەروەردگاریان ئەبێت، وە لە نێوان پەروەردگار و بەندەکانیدا هیچ وەرگێڕێک نامێنێت، بەچاوەکانی سەر سەیری پەروەردگار ئەکەن و، بەگوێیەکانی سەریان گوێیان لە دەنگی پەروەردگار ئەبێ کە بە پیت و وشە قسە دەفەرمووێت. هەرکەسێک پێی وابێت الله تعالى قسە ناکات و، ڕەددی دەنگی الله تعالى بداتەوە کە بە پیت و وشە قسە ئەکات؛ ئەوە کافرە و قورئان و سوننەتی ڕەت داوەتەوە و باوەڕی بە خوایەک نییە کە قسە ئەکات بە دەنگ و پیت و وشەی هەیە، کە قسەی پێ دەفەرمووێت لەگەڵ بەندەکانیدا.

(١٤٢) سەحیحی موسلیم: ٦٣٣.

٩- وَالْجَنَّةُ [حَقٌّ]، وَالنَّارُ حَقٌّ؛ وَهُمَا مَخْلُوقَانِ، لَا يَفْنَيَانِ أَبَدًا.
وَالْجَنَّةُ ثَوَابٌ لِأَوْلِيَائِهِ، وَالنَّارُ عِقَابٌ لِأَهْلِ مَعْصِيَتِهِ، إِلَّا مَنْ رَحِمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ.[١]

---

(١) وَالْجَنَّةُ [حَقٌّ]، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَهُمَا مَخْلُوقَانِ لَا يَفْنَيَانِ أَبَدًا.

وَالْجَنَّةُ ثَوَابٌ لِأَوْلِيَائِهِ، وَالنَّارُ عِقَابٌ لِأَهْلِ مَعْصِيَتِهِ إِلَّا مَنْ رَحِمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ. واته: وه بەهەشت حەقە و، دۆزەخ حەقە، وە هەردووكیان دوو دروستكراوی (الله تعالی)ن و تیاناچن.

وه بەهەشت پاداشتە بۆ دۆستەكانی و، دۆزەخیش سزایە بۆ سەرپێچیكارانی، ئیللا ئەوانە نەبێت كە الله تعالی ڕحمیان پێ ئەكات.

لە عەقیدە و بیروباوەڕی سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەت وایە، بیروباوەڕمان وایە بەهەشت و دۆزەخ حەقن و، ئێستە بوونیان هەیە و ڕۆژێک بەسەریاندا نایێت كە لەناو بچن، وە بەهەشت پاداشتە كە الله تعالی ئامادەی كردووە بۆ دۆست و وەلییەكانی خۆی، دۆزەخیش سزایە بۆ سەرپێچیكاران.

تەبعەن الله تعالی لە قورئانی پیرۆزدا زۆرجار باسی بەهەشت و دۆزەخی كردووە، وە دەیان بەڵگە هەیە دەربارەی ئەوەی ئێستە بوونیان هەیە، وەكوو:

١- ﷲ تعالى دەفەرموویت: (وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ)[١٤٣]. واته: پێشبڕکێ بکەن بۆ لێبوردنێکی گەورە لەلایەن پەروەرگارتانەوە، وە بۆ بەهەشتێک کە پانییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە کە ئامادەکراوە بۆ لە ﷲ ترسان.

٢- وە دەفەرموویت: (وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ)[١٤٤]. واته: ئەی موحەممەد ﷺ مژدە بدە بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە باشەکانیان کردووە، کە بێگومان بۆ ئەوان بەهەشتانێک هەیە کە جۆگەی ئاو زۆر بەژێریاندا دەڕوات.

٣- وە ئەفەرموویت: (وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ)[١٤٥]. واته: وە خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە ئامادەکراوە بۆ کافران.

٤- وە دەفەرموویت: (فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ)[١٤٦]. واته: دەی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنییەکەی خەڵک و بەردە.

ئیمانی هیچ کەسێک دانامەزرێ؛ تاکوو باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ نەبێت، کە بوونیان هەیە و ئێستە ئامادەن.

---

(١٤٣) آل عمران: ١٣٣.

(١٤٤) البقرة: ٢٥.

(١٤٥) آل عمران: ١٣١.

(١٤٦) البقرة: ٢٤.

بەهەشتەکەی اللە تعالی پاداشتە بۆ موەحیدان و چاکەکاران لە موسڵمانان، دۆزەخەکەشی سزایە بۆ سەرپێچیکاران و ئەوانەی شایستەی سزان، جا هەرکەس نکوولّی بوونی بەهەشت و دۆزەخ بکات؛ ئەوە نکوولّی بوونی شتێکی کردووە لە دیندا کە بەڵگە نەویستە، بۆیە هەرکەس کافر بێت بە بەهەشت و دۆزەح؛ ئیمانی نییە، وەکو لە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی سامتدا هاتووە ﷺ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: "مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنَ الْعَمَلِ". رَوَاهُ البُخَارِي وَمُسلِم[١٤٧]. واتە: هەرکەسێک شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە اللە، وە شایەتی بدات کە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی (اللە تعالی)یە، وە عیسا عليه السلام بەندە و نێردراوی (اللە تعالی)یە، بە وشەیەکی اللە تعالی دروست بوو کە فەرمووی: ببە، ئیتر بوو، وە ڕۆحێکە لە ڕۆحە دروستکراوەکانی اللە تعالی، وە بەهەشت حەقە و، دۆزەخیش حەقە، هەرکەس ئەمە بیروباوەڕی بێت ئەوە اللە تعالی ئەیخاتە بەهەشتەوە، هەرچەند کاروکردەوەی کامڵیشی نەبێت.

جا هەرکەس باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ نەبێت باوەڕدار و ئیماندار نییە، وە پێشینانی ئەم ئوممەتە باوەڕیان وابووە کە حەقن و ئێستە بوونیان هەیە.

---

(١٤٧) (سەحیحی بوخاری: ٣٤٣٥)، (سەحیحی موسلیم : ٢٨)، لەفزەکە هی بوخارییە.

## وَهُمَا مَخْلُوقَانِ(١)

(١) **وَهُمَا مَخْلُوقَانِ.** واته: ﷲ تعالى دروستی کردوون. جا بیروباوەڕی دروست دەربارەی بەهەشت و دۆزەخ بریتییە لەوەی ﷲ تعالى دروستیانی کردووە، پێش ئەوەی ئێمە و کاروکردەوەکانیشمان بوونیان هەبێت، وەکوو ﷲ تعالى:

١- دەفەرمووێت: (أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ)[١٤٨]. واته: ئامادە کراوە بۆ لە ﷲ ترسان.

٢- وە دەفەرمووێت: (أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِ)[١٤٩]. واته: ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بە ﷲ و پێغەمبەرانی.

٣- وە ئەفەرمووێت: (وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا)[١٥٠]. واته: ئێمە ئاگری هەڵگیرساومان ئامادەکردووە بۆ کەسێ باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێ.

وە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ:

١- دەفەرمووێت: "دخلت الجنة فرأيت قصرا ورأيت كوثر، واطلعت في الجنة فرأيت أكثر أهلها كذا، واطلعت في النار فرأيت كذا وكذا". واته:

(١٤٨) آل عمران: ١٣٣.

(١٤٩) الحديد: ٢١.

(١٥٠) الفرقان: ١١.

چوومە بەهەشتەوە و باڵەخانە و ڕووبار و حەوزم بینی، وە بەسەریدا گەڕام و نیشانمدرا کە خەڵکەکەی ئاوا بوون، وە دۆزەخیشم نیشاندرا و بینینم خەڵکەکەی ئاوا و ئاوا بوون.

بۆیە هەرکەسێک باوەڕی وانەبێ ئێستە بەهەشت و دۆزەخ بوونی هەیە، ئەوە ئایەت و فەرموودەی ڕەتکردۆتەوە.

٢- وە دەفەرمووێت: "اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ، فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، واطلعت النار فرأيت أكثر أهلها النساء"[١٥١]. واتە: بەهەشتم نیشاندار، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی هەژارەکانن، وە دۆزەخیشم نیشاندرا، بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی ئافرەتانن.

کەواتە شتێک پیشانی پێغەمبەری خوا ﷺ دراوە کە بوونی هەیە و حەقیقەتە.

٣- وە لە [صحيحين]دا هاتووە و بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی بەهەشت و دۆزەخ بوونیان هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "وَاشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا فَقَالَتْ: يَا رَبِّ، أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ، نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ" [١٥٢]. واتە: دۆزەخ شەکوا و شکایەتی برد بۆ لای ﷲ و وتی: ئەی پەروەردگار هەندێکم هەندێکم ئەخوات، بۆیە ﷲ تعالى مۆڵەتی دوو نەفەس و هەناسەی پێ

(١٥١) سەحیحی بوخاری: ٦٤٤٩.
(١٥٢) سەحیحی بوخاری: ٥٣٦ و ٥٣٧.

ئەدات، ئەوانیش هەناسەیەک لە زستان و، هەناسەیەک لە هاوین. "**فَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْحَرِّ، وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الزَّمْهَرِيرِ**"[١٥٣]. واتە: ئەو گەرما توندەی لە هاویندا هەیە و، ئەو سەرما توندەی لە زستاندا هەیە لە دوزەخەوەیە.

٤- وە دەفەرمووێت: "**لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الْجَنَّةَ قَالَ لِجِبْرِيلَ: اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا**". **رَوَاهُ أَحمَدَ وَأَبُو دَاوُد**[١٥٤]. واتە: کاتێک پەروەردگار بەهەشتی دروستکرد بە جبریلی فەرموو: بڕۆ سەیری بکە.

بەڵگەکان زۆرن، بۆیە بەهەشت و دۆزەخ ئێستە بوونی هەیە، ئەمەش کۆدەنگی سەلەفی ساڵح و موسڵمانانە، کە لێرەدا ڕازییەین ئەیگوازنەوە بۆمان.

ئەوانەی نکووڵی بوونی بەهەشت و دۆزەخ ئەکەن لە ئێستادا، بریتیین لە جەهمییەکان و قەدەرییەکان و هەندێک لە موعتەزیلەکان، ئەوانە باوەڕیان وایە کاتێک دونیا تێکە ئەچێت و ڕۆژی قیامەت دێت، ئەوکات بەهەشت و دۆزەخ دروست ئەکرێن، ئەمەش بە هەندێ شوبوهات و گومان، لەوانە دەڵێن: پەروەردگار فەرموویەتی: (كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ)[١٥٥]. واتە: هەموو شتێك لەناو دەچێ جگە لە ڕوخساری پیرۆزی ﷲ تعالی. بەڵام لەڕاستیدا ئەم ئایەتە ناکرێتە بەڵگە بۆ ئەوەی ﷲ تعالی بەهەشت و دۆزەخەکەی لەناوبەرێت، بەڵێ

---

([١٥٣]) (سەحیحی بوخاری: ٣٢٦٠) و (سەحیحی موسلیم : ٦١٧)، لەفزەکە هی بوخارییە.

([١٥٤]) (موسنەدی ئەحمەد: ٨٣٩٨ ، ٨٦٤٨ ، ٨٨٦١)، (سونەنی أبو داود: ٤٧٤٤)، لەفزەکە هی ئەبو داوودە.

([١٥٥]) القصص: ٨٨.

کۆمەڵێک شت هەن بە تێکچوون و هاتنی ڕۆژی قیامەتیش ﷲ تعالى هەر ئەیانهێڵێتەوە، وەکوو ﷲ تعالى دەفەرموویت: (وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَـٰوَاتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ)[١٥٦]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە فوو دەکرێ بە شەیپوردا، جا هەرچی کەس لە ئاسمانەکان و زەویدایە دەترسێ و ڕادەچڵەکێ، هەموو دەمرن جگە لەو کەسانەی ﷲ بیەوێ. لەوانە: بەهەشت و حۆرییەکانی ناوی و، دۆزەخ و، ئەو شتانەی کە ﷲ تعالى ویستی وایە بوونیان بمێنێت.

پاشان لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وایە کە بەهەشت و دۆزەخ فەنایان بەسەردا نایەت.

(١٥٦) النمل: ٨٧.

## لَا يَفْنَيَانِ أَبَدًا(١)

---

(١) **لَا يَفْنَيَانِ أَبَدًا.** واتە: بەهەشت و دۆزەخی ألله تعالى فەنا و فەوتانیان بەسەردا نایەت بۆ دانیشتوانی. هەرکەس باوەڕی وابێ ڕۆژێک دێت کۆتاییان بەسەردا دێت؛ ئەوە کەسێکی جەهمیی و کافرە.

بەهەشت لەسەرووی ئاسمانی حەوتەمە و عەرشی ألله تعالى سەقفەکەیەتی، دۆزەخیش لە ژێر تەبەقی حەوتەمی زەوییە، وەکو زۆرێک لە سەلەف وایان فەرمووە، وە هەندێکی وتر وتوویانە بەس پەروەردگار ئەزانێت شوێنەکەی کوێیە.

بۆیە ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە ئیتر نایەتە دەرەوە لێی، وە ئەوەشی بچێتە دۆزەخ لە ئەهلی شیرک و کوفری گەورە، ئەوە ئیتر نایەتە دەرەوە لێی، بەڵام تاوانباران لە ئەهلی تەوحید و ئیمان بە هەمیشەیی نامێننەوە تێیدا، گەر بڕۆنە ناوییەوە. ئەم دوانە پاداشت و سزای (ألله تعالى)ن بۆ بەندەکانی، وەکوو:

١- ألله تعالى دەربارەی ئەهلی بەهەشت دەفەرموێت: (خَـٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ)[١٥٧]. واتە: بەهەمیشەیی تێیدا ئەمێننەوە، ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

---

(١٥٧) النساء: ١٣.

٢- وه دەفەرموویت: (لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ)(١٥٨). واته: هەرگیز تەواو نابێ و قەدەغەش ناكرێ.

٣- وه دەربارەی ئەهلی دۆزەخ دەفەرموویت: (لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ)(١٥٩). واته: له بەهەشتدا هەرگیز مردن ناچەژن جگە لە مردنی یەكەم جار، وە ﷲ لە سزای دۆزەخ پاراستوونی.

٤- وه دەفەرموویت: (إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا)(١٦٠). واته: بەڕاستی ﷲ نەفرینی لە كافران كردووە و ئاگری هەڵگیرساوی بۆ ئامادە كردوون.

٥- وه دەفەرموویت: (أُولَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ)(١٦١). واته: ئەوانە هاوەڵ و هاودەمی ئاگرن تێیدا ئەمێننەوە بەهەمیشە و هەتا هەتایی.

چەندین بەڵگەمان هەیە كە بەهەشتی ﷲ تعالى هەتا هەتاییە و، مردن نامێنێت دوای زیندووبوونەوەی مرۆڤەكان، ئەمەش كۆدەنگی تەواوی هاوەڵان و تابیعییەكان و تابیعی تابیعییەكان و دوای ئەوانیشە لە موسڵمانان، بەوەی كە هەموو لەسەر ئەوەن كە بەهەشت و دۆزەخ هەمیشەیین و، تیاچوونیان بەسەردا

(١٥٨) الواقعة: ٣٣.
(١٥٩) الدخان: ٥٦.
(١٦٠) الأحزاب: ٦٤.
(١٦١) البقرة: ٣٩.

نایەت، ئەمەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

تەبعەن جەهمییەکان و موعتەزیلەکان باوەڕیان وایە فەوتان بەسەر دۆزەخدا دێت، ئەمەش بیروباوەڕی موسڵمان و ئەهلی سوننەت و جەماعەت نییە.

شوێنی بەهەشتیش وەک وتمان سەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانە، وەکوو اللَّهُ تعالی دەفەرموویت: (عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾)[١٦٢]. واتە: لای درەختی سیدرەتولمونتەها ﴿١٤﴾ کە لای ئەوەوەیە بەهەشتی نیشتەجێ بوون ﴿١٥﴾). وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەربارەی دوعاکردن بۆچوونە بەهەشت دەفەرموویت: "فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ؛ فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ أُرَاهُ: فَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ"[١٦٣]. واتە: داوای فیردەوسی لێبکەن، لەبەرەوەی ناوەڕاستی بەهەشت و بەرزترینی بەهەشتە، لەسەرووشی عەرشی (اللَّهُ تعالی)یە، لەوێوە ئاو و کانییەکانی بەهەشت سەرچاوە ئەگرن.

بەڵام دەبارەی دۆزەخ خیلاف هەیە لە نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا، چونکە فەرموودەیەکی ڕاشکاومان نییە لەو بارەیەوە، بۆیە خیلاف هەیە، هەندێک لە زانایان دەڵێن لە ژێر حەوت تەبەقی زەویدایە، هەندێکی دیکە دەڵێن بەس اللَّهُ تعالی ئەیزانێ و شوێنەکەی جێگیر نییە، ئەمەش بە بەڵگەی فەرموودەی: "يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ، لَها سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَام، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ

(١٦٢) النجم: ١٤ و ١٥.
(١٦٣) سەحیحی بوخاری: ٢٧٩٠.

سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا"[١٦٤]. واته: له ڕۆژی دواییدا دۆزەخ ئەهێنن، حەفتا هەزار ڕەشمەی هەیە، هەر ڕەشمەیەکی حەفتا هەزار فریشتە هەڵیانگرتووە.

بەڵام بەڵگەی تریشمان هەیە کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەیهێننەوە بەوەی دۆزەخ لە ژێر زەویدایە، کە فەرموودەکەی بەڕائە ﷺ، دەربارەی کەسی کافر کە ڕۆحی ئەکێشرێت و ئەبردرێت بۆ ئاسمان، بەڵام دەرگای لێ ناکرێتەوە: "فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِي سِجِّينٍ، فِي الْأَرْضِ السُّفْلَى، فَتُطْرَحُ رُوحُهُ طَرْحًا"[١٦٥]. واته ﷻ تعالى دەفەرمووێت: ناوی بنووسن لە پەرتووکی سیججین، لە تەبەقەی حەوتەمی زەوی، ئیتر ڕۆحی فڕێ ئەدرێت بۆ ئەوێ.

کەواتە دۆزەخ گومانی تێدا نییە کە بوونی هەیە، بەڵام دەربارەی شوێنەکەی، خیلاف هەیە لەنێو ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا.

---

([١٦٤]) جامیعی تورمزی: ٢٥٧٣.

([١٦٥]) موسنەدی ئەحمەد: ١٨٥٣٤.

## وَالْجَنَّةُ ثَوَابٌ لِأَوْلِيَائِهِ.(١)

---

(١) **وَالْجَنَّةُ ثَوَابٌ لِأَوْلِيَائِهِ.** واته: بەهەشت پاداشتی دۆست و وەلییەکانی (اللَّه تعالى)یە. **(لَا يَدخُلُهَا إلاَّ المُؤمِن).** واته: ئیماندار نەبێت کەس ناچێتە ناوی. ئەوانەی ئەچنە بەهەشت ئەبێ ئیللا ئیماندار بن و ئەهلی کردار و عەمەل بن، ئەهلی شیرک ناچنە بەهەشتەوە، وەکوو:

١- اللَّه تعالى دەفەرموێت: (إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ)[١٦٦]. واته: بەڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆ اللَّه دابنێ، ئەوە بێگومان اللَّه بەهەشتی لێ حەرام کردووە.

٢- وە دەفەرموێت: (لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ)[١٦٧]. واته: ئەوانە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێنەوە و ناچنە بەهەشتەوە تاکوو حوشتر نەچێت بە کونی دەرزی درووماندا.

٣- وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: **"الْجَنَّةَ لَا يَدْخُلُهَا إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ"**[١٦٨]. واته: ئیماندار نەبێت، کەس ناچێتە بەهەشتەوە.

---

(١٦٦) المائدة: ٧٢.

(١٦٧) الأعراف: ٣٠.

(١٦٨) سەحیحی بوخاری: ٦٥٢٨.

وه دوزەخیش سزای ئەهلی سەرپێچیکارانە، گەر موسڵمانبوون؛ ئەوە بە کاتیی ئەچنە دۆزەخ و دواتر ئەچنە بەهەشتەوە، بەڵام ئەهلی کوفر بە هەمیشە تێیدا دەمێننەوە.

إِلَّا مَنْ رَحِمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ.[١]

---

(١) **إِلَّا مَنْ رَحِمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ.** واتە: تەنها ئەوە نەبێت کە ﷲ ڕەحمی پێ ئەکات. ئەم بەشە ڕەددە بۆ موعتەزیلەکان و خەواریجەکان؛ چونکە موعتەزیلەکان ئەیانوت ئەوەی موسڵمان بێت و ئەهلی کەبائیر بێت، ئەوە بە هیچ شێوەیەک دۆزەخی نابێت و، ئەچێتە بەهەشتەوە، وە باوەڕیان وایە گەر بێتوو کەسێک لە ئەهلی کەبائیر بچێتە ئاگرەوە، ئەوە بە هەمیشە تێیدا ئەمێنێتەوە.

بەڵام عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وایە کە ئەکرێ مرۆڤ موسڵمان بێت و پەروەردگار بیخاتە ئاگری دۆزەخەوە، لەبەر تاوانی گەورە کە ئەنجامی داوە، بەڵام بۆ هەمیشە ناچێتە دۆزەخ، بەڵکوو بۆ ماوەیەک تێیدا ئەمێنێتەوە و پاشان ﷲ تعالى ئەیخاتە بەهەشتەوە، بەڵام ئەوانەی کە لەسەر کوفر و شیرکی گەورە مردوون، ئەوانە بە هەمیشەیی تێیدا ئەمێننەوە بێ ئەوەی بێنە دەرەوە بۆ ساتێکیش.

## ١٠- وَالصِّرَاطُ حَقٌّ.(١)

(١) وَالصِّرَاطُ حَقٌّ. واته: پردی سیڕات حەق و ڕاستە.

پردی سیڕات ئەو پردەی کە بەسەر دۆزەخدا درێژ ئەکرێت و مرۆڤەکان تێپەڕ ئەبن بەسەریدا حەقە، کە هەریەکەو بە خێراییەک ئەڕوات، وە چرا هەیە لەسەر پردەکە، هەرکەس بەگوێرەی کردەوەکانی بەرپێی ڕۆشن ئەبێتەوە.

بێگومان لە عەقیدە و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە کۆدەنگی سەلەف و ئەووەڵینی ئوممەتە، بریتییە لەوەی کە باوەڕیان بە سیڕات هەیە، ئەوەش لەو ئایەتەوەیە کە لە سورەتی مەریەمدا هاتووە و، اللّٰه تعالی دەفەرمووێت: (وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا)[١٦٩]. واتە: کەس نییە لە ئێوە نەڕوات و تێنەپەڕێت بەسەر دۆزەخدا، ئەو تێپەڕینەش بڕیارێکی بڕاوەیە لە پەروەردگارتەوە.

ئیمام (إِبنُ مَسعُود، جَابِر، الحَسَن)و جگە لەوانیش لە ئەهلی تەفسیر لە سەلەف، تەفسیری (وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا)یان کردووە بە: تێپەڕین بەسەر سیڕاتدا. وە هیچ کەسێک نییە بچێتە بەهەشتەوە، ئیللا ئەبێ بەسەر پردی سیڕاتدا تێپەڕ ببێت.

---

(١٦٩) مريم: ٧١.

وە لە [صحيحين]دا لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "وَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَنَا وَأُمَّتِي أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُهَا، وَلَا يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ إِلَّا الرُّسُلُ)". واتە: سیرات لەسەر پشتی دۆزەخ دائەنرێت، من و ئوممەتەکەم یەکەم کەسانێکین پێیدا تێپەڕ ئەبین، لەو ڕۆژەدا کەس قسە ناکات ئیللا پێغەمبەران نەبێت -عَلَى نَبِيِّنَا وَعَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام-، وە بانگەواز و دوعا و داوای پێغەمبەران لەو ڕۆژەدا ((اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ))[١٧٠] ئەبێت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ داوا و دوعاکەی: "اللَّهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي"[١٧١]یە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندین فەرموودەدا دەربارەی سیرات باسی بۆ کردووین، یەک لەوان دەفەرمووێت: "أَدَقُّ مِنَ الشَّعْرَةِ وَأَحَدُّ مِنَ السَّيْفِ"[١٧٢]. واتە: باریکترە لە موو، وە تیژترە لە شمشێر.

فەرموودەیەکیش هاتووە لە سەلمانەوە کە مەوقوفە، هەندێکیش دەڵێن مەرفوعە، وێنەی ئەوەیە کە ئەڵێ: تیژترە لە شمشێر. والله أعلم.

پێغەمبەری خوا ﷺ باسی چۆنییەتی پەڕینەوەی بەندەی کردووە بەسەر سیراتدا، دەربارەی ئیماندار دەفەرمووێت: "الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ، وَكَالْبَرْقِ، وَكَالرِّيحِ، وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَنَاجٍ

---

(١٧٠) (سەحیحی بوخاری: ٧٤٣٧ ، ٧٤٣٨) و (سەحیحی موسلیم: ١٨٢)، لەفزەکە هی بوخارییە.

(١٧١) سەحیحی موسلیم: ٢٠٢.

(١٧٢) سەحیحی موسلیم: ١٨٣.

مَخْدُوشٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، يُسْحَبُ سَحْبًا"[١٧٣]. واته: باوەڕدار هەیە وەکو چاوتروکان ئەپەڕێتەوە، وە هەیە وەکو هەورە بروسکەیەک ئەپەڕێتەوە، وە هەیە وەکو با ئەپەڕێتەوە، وە هەیە وەکو سوارچاکی ئەسپ و ئاژەڵ ئەپەڕێتەوە، جا هەیە ڕزگاری ئەبێت بە سەلامەتی، وە هەیە ڕزگاری ئەبێت بەڵام بە برینداری، وە هەیانە ئەکەوێتە ئاگری دۆزەخەوە، تاکوو یەک یەک هەموویان تێپەڕ ئەبن.

وە یەکەمین کەسانێک تێپەڕ ئەبن بەسەر پردی سیڕاتدا ئوممەتی پێغەمبەری خوان ﷺ، وەکوو لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە کە لە [صحیحین]دا هاتووە، وە (فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ)[١٧٤] کە لە [صحیح مسلم]دا هاتووە یەکەمین تاقمن لەناو ئوممەتی ئیسلام.

وە تەنها ئەهلی ئیمانیش بەسەر پردی سیڕاتدا تێپەڕ ئەبێت، بە هیچ شێوەیەک پردی سیڕات کافر و موشریکەکان ناگرێتەوە، پێش پردی سیڕات ئەوانە فڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە، ئەوانەی بەسەر پردی سیڕاتدا تێپەڕ ئەبن ئەوانەن کە ئەهلی ئیمانن، جا ئەوانیش بەپێی کاروکردەوەکانیان تێپەڕ ئەبن لەسەر پردی سیڕات، وە لە ئەهلی ئیمانیش هەیە تێپەڕ نابێ بەسەر پردی سیڕاتدا و ئەکەوێتە خوارەوە، لەناو دۆزەخدا ئەبێت تاکوو پاک ئەبێتەوە لە تاوان، ئەوکات ئەڕواتە بەهەشتەوە.

---

(١٧٣) سەحیحی بوخاری: ٧٤٣٩ و ٧٤٤٠.
(١٧٤) سەحیحی موسلیم: ٣١٥.

ئەمە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە کە کۆدەنگی سەلەفی ساڵحە، ئەویش ئەوەیە پردێکە حەقیقەتی هەیە و ئەهلی ئیمان بەسەریدا تێپەڕ ئەبێت و، کافر و موشریک ناچێتە سەری و، ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم ئوممەتە کە پێیدا تێپەڕ ئەبێت.

هەندێک گرووپمان هەیە کە نکوولّی ئەم پردی سیڕاتە ئەکەن، ئەوانیش: خەواریجەکان و موعتەزیلەکانن، موعتەزیلەکان پێیان وایە ئەوەی بچێتە دۆزەخەوە ئیتر نایەتە دەرەوەی لێی، وە چوونە بەهەشتیش ڕاستەخۆییە نەک گواستنەوەیی بێت، واتە ناچێتە دۆزەخ و دواتر بێتە دەرەوە لێی و بچێتە بەهەشت، یان ڕاستەوخۆ ئەڕواتە بەهەشت، یان ڕاستەوخۆ ئەڕواتە دۆزەخ.

## ١١- وَالْمِيزَانُ حَقٌّ لَهُ كِفَّتَانِ، تُوزَنُ فِيهِ أَعْمَالُ الْعِبَادِ حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا حَقٌّ.(١)

---

(١) وَالْمِيزَانُ حَقٌّ لَهُ كِفَّتَانِ، تُوزَنُ فِيهِ أَعْمَالُ الْعِبَادِ حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا حَقٌّ.
واتە: تەرازوو حەق و ڕاستە، کە (دوو تا و زمانێک)ی هەیە، کرداری بەندەکانی تێدا ئەکێشرێت بە چاک و خراپییەوە.

بەڵگەی قورئان و فەرموودە و کۆدەنگی سەلەف بڕاوەتەوە کە کرداری بەندەکان و، بەندەکان خۆشیان ئەکێشرێن لەسەر تەرازووی ڕۆژی قیامەت، ئەمە کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، بە پێجەوانەی موعتەزیلەکان کە دەڵێن میزان عیبارەت و ئاماژەیە بۆ عەدلی ﷲ تعالی، وە پێچەوانەی زاهیرییە جەهمییەکان کە نکووڵی لەوە دەکەن تەرازوو دوو تا و زمانێکی هەبێت، لەکاتێکدا چەندین ئایەتمان هەیە کە ﷲ تعالی باسی تەرازوو ئەکات، وەکوو:

١- دەفەرمووێت: (وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُولَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ)[١٧٥]. واتە: کێشانەی ڕاست بۆ کردەوەکانتان لەو ڕۆژەدا دەبێ و گومانی تێدا نییە، جا هەر کەس کێشراوی چاکەکانی قورس بێت؛ ئەوە ئەوانەن ڕزگار و گەیشتوو بە ئامانج.

---

(١٧٥) الأعراف: ٨.

٢- وه دەفەرمووێت: (وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ)[١٧٦]. واته: وه ئێمه تەرازووەکانی دادپەروەری دادەنێین له ڕۆژی قیامەتدا که کردەوەی پیّ دەکێشرێت.

٣- وه پێغەمبەری خوا ﷺ له فەرموودەیەکدا که له [صحيحين]دا هاتووه دەفەرمووێت: "كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ"[١٧٧]. واته: دوو وشه هەن زۆر خۆشەوستن لای (ﷻ)ی ڕەحمان، وه سووکن لەسەر زوبان، وه قورسن لەسەر تەرازوو، بریتین له (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).

تەرازوو جێگیر بووه له فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، له فەرموودەی: (مُعَاذ، أَبِي دَردَاء، عَبدُاللهِ بنُ عَمرُو، عَائِشَة، سَلمَان)، وه به مەوقوفیش له (أَنَس، حُذَيفَةُ بنُ اليَمَان)ەوه هاتووه.

وه ئیجماع نەقڵکراوه لەسەر واجبێتی باوەڕ هەبوون به تەرازوو، وەکو (إبن بطة)و جگه لەویش نەقڵیانکردووه.

کۆمەڵێک تاقم و گرووپی گومڕا هەن که نکووڵی تەرازوو ئەکەن، لەوانه: موعتەزیلەکان و جەهمییەکان.

---

[١٧٦] الأنبياء: ٤٧.

[١٧٧] (سەحیحی بوخاری: ٧٥٦٣)، (سەحیحی موسلیم: ٢٦٩٤)، لەفزەکه هی بوخارییه.

حیکمەتیش لە تەرازوویش -واللّٰه أعلم- بریتییە لەوەی کە مرۆڤەکان خۆیان خودی خۆیان بناسن و بزانن کاروکردەوەکانیان چەندێکە، وە بە ئەندازەی کاروکردەوەکانیان اللّٰه تعالى پلە و مەقامیان پێ ئەبەخشێت لە بەهەشتدا. بۆیە (فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُ)[١٧٨]. واتە: ئینجا هەر کەسێ کێشراوی چاکەکانی قورس بێت. (وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُ)[١٧٩]. واتە: وە هەر کەسێ کێشراوی چاکەکانی سووك بێت.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەرازوو شتێکی مەحسووس و هەستپێکراوە و شتێکی مەعنەوی و خەیاڵی نییە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندین فەرموودەدا باسی سیفەتی ئەو تەرازووەی بۆ کردووین، کە دوو تا و زمانێکی هەیە، وەکوو هەندێ لە سەلەفی ساڵح باسیان بۆ کردووین کە دەڵێن: "**وَأَنَّ لِلمِيزَانِ لِسَاناً**". واتە: بەدڵنیاییەوە تەرازوو زمانێکی هەیە. ئەمە وەکو ئیبنو عەبباس و جگە لەویش هێناویانە.

وە وەزن و کێشی کردارەکان و خاوەنەکانیشیان ئەپێورێت، وەکوو لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە لە [صحیحین]دا هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، اقْرَءُوا: (فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا)[١٨٠]**.[١٨١]". واتە:

---

(١٧٨) المؤمنون: ١٠٢.

(١٧٩) المؤمنون: ١٠٣.

(١٨٠) الكهف: ١٠٥.

پیاوی وەها قەڵەو دێنن لە ڕۆژی قیامەتدا کە کێشی باڵی مێشوولەیەکی نییە، ئایەتی ﷲ بخوێننەوە کە ئەفەرمووێت: کەواتە لە ڕۆژی دواییدا هیچ نرخ و ڕێزێکیان بۆ دانانێین.

وە لە فەرموودەکەی ئیمام عەلیشدا هاتووە، کە فەرموودەکە لە [مسند إمام أحمد]دا هاتووە: کاتێک ئیبنو مەسعوود سەرەکەوێت بەسەر دارەکەدا، هەندێک لە پۆشاکەکەی هەڵدایەوە و هەندێ لە قاچی دەرکەوت، کە قاچەکانی لاواز و زەعیف بوون، هەندێ لەوانەی لەوێبوون ئەوەیان بینی پێکەنین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "مِمَّ تَضْحَكُونَ؟ قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مِنْ دِقَّةِ سَاقَيْهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَهُمَا أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ أُحُدٍ"[١٨٢]. واتە: بەچی پێ ئەکەنن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە باریکی قاچی ئیبن مەسعوود پێکەنین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە، ئەو قاچانەی لە تەرازووی قیامەتدا لە شاخی ئوحوود قورسترە.

بۆیە بێگومان ئەو تەرازووە حەقە و هەستپێکراوە و، خۆمان و کاروکردەوەکانیشمان ئەکێشرێن لە ڕۆژی قیامەت.

---

([١٨١])مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، (سەحیحی بوخاری : ٤٧٢٩)، (سەحیحی موسلیم : ٢٧٨٥).

([١٨٢]) موسنەدی ئەحمەد: ٣٩٩١.

## ١٢- وَالْحَوْضُ الْمُكْرَمُ بِهِ نَبِيُّنَا حَقٌّ.(١)

(١٢) وَالْحَوْضُ الْمُكْرَمُ بِهِ نَبِيُّنَا حَقٌّ. واته: وه حهوزی كهوسهر كه پێغهمبهرمان ﷺ بههۆیهوه ڕێزی لێگیراوه حهق و ڕاسته.

له كۆدهنگی بیروباوهڕی ئههلی سوننهت و جهماعهت و سهلهفی سالْح وایه كه حهوزی كهوسهر حهقه و بوونی ههیه، وه فهرموودهكانی حهوز فهرموودهی موتهواتیرن، وه سوورهتێكی قورئانیش دربارهی هاتووه، كه بێگومان ئههلی كوفر و بیدعه بێبهش ئهبن له خواردنهوه لێی، ههركهسێكیش یهک قومی لێ بخواتهوه بۆ ههمیشه تینووی نابێت، ئهمهش كۆدهنگی و ئههلی سوونهت و جهماعهته.

بهڵام ڕاجیاوازی ههیه لهناو زانایان دهربارهی ئهوهی شوێنی حهوز له كوێدایه، ئایا پێش سیڕاته؟ یان دوای سیڕاته؟ ههندێک له زانایان وتوویانه دوای سیڕاته، پێش چوونه بهههشت، وه ههندێكی دیكه وتوویانه پێش سیڕاته، زۆرینهی زانایان لهسهر ئهوهن كه پێش سیڕاته؛ چونكه دوای ئهوهی مرۆڤهكان لێی ئهخۆنهوه ئیتر بهرهو سیڕات ئهبردرێن، بهڵام -والله أعلم- به بهڵگهیهكی سهحیح له خودی پێغهمبهری خواوه ﷺ جێگیر نهبووه، بهڵام یهقین و باوهڕێكی جێگیرمان ههیه بهو حهوزهی كه له مهحشهردایه و ئههلی ئیمان لێی ئهخۆنهوه، بهڵام ئهوهی ههیه ههندێ قهرینهیه كه وا ئهكات ڕاست وابێ پێش سیڕات بێت،

ئەویش لەبەر زۆر تینوێتی خەڵکی لەو ڕۆژەدا، وە خاڵێکی دیکەش کە قەرینەیەکی بەهێزە، بریتییە لەوەی ئەو حەوزە ئەهلی بیدعە لێی ناخۆنەوە و دوور ئەخرێنەوە، وە پردی سیراتیش تەنها ئەهلی ئیمانی پێدا تێپەڕ ئەبێت و ئەهلی بیدعەی پێدا تێپەڕ نابێ، گەر لە دوای پردی سیرات بێت، ئەوە ئەهلی بیدعە هەر لێشی نزیک نابنەوە، لە کاتێکدا ئەهلی بیدعە لێی نزیک ئەبنەوە، بەڵام لەلایەن فریشتەکانەوە دوور ئەخرێنەوە، بۆیە لەپێش پردی سیراتەوەیە.

وە دەربارەی جێگیربوونی حەوزی کەوسەر، لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکەی ٥٠ فەموودەمان هەیە، وە هەندێ لە ئەهلی حەدیس دەڵێن ٨٠ فەموودەمان هەیە، وە فەرموودەکان گەیشتوون بە ئاستی موتەواتیر، هیچ خیلافێک لە نێوان موسڵماناندا نییە دەربارەی بوونی حەوزی کەوسەر و ڕێزلێنانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو حەوزە.

دەربارەی سیفەتی حەوزی کەوسەریش لە [صحيحين]دا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: "وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ"[١٨٣]. واتە: لە هەر چوار لاوە وەکو یەک وایە. واتە: "عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ"[١٨٤]. واتە: پانییەکەی وەکو درێژییەکەی وایە. وە "حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ"[١٨٥]. واتە: هەرلایەکی بەئەندازەی یەک مانگە ڕێیە. واتە هەر لایەکی ئەوەندە درێژە مرۆڤ بە ئەندازەی مانگێک ڕێ بکات ئەوکات پێی ئەگات، ئەوندە گەورەیە، وە ئاوەکەی لە شیر سپیترە، لە

---

(١٨٣) سەحیحی موسلیم: ٢٢٩٢.

(١٨٤) سەحیحی موسلیم: ٢٣٠٠.

(١٨٥) (سەحیحی بوخاری: ٦٥٧٩)، (سەحیحی موسلیم : ٢٢٩٢)، لەفزەکە هی موسلیمە.

هەنگوین شیرینترە، هەرکەس قومێکی لێ بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت، وەکوو دەفەرمووێت: "أحْلى مِن العَسَلِ، وأطيَبُ رِيحًا مِن المِسْكِ"(١٨٦). واتە: لە هەنگوین شیرینترە، وە لە میسک بۆن خۆشترە. وە قاپ و پەرداخی لەسەرە، وەکوو دەفەرمووێت: "وَإِنَّ فِيهِ مِنَ الْأَبَارِيقِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ"(١٨٧). واتە: بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان پەرداخی هەیە. پەرداخەکانیش زیو و ئاڵتوونن، وە یەکەم کەسانێک کە لێی ئەخۆنەوە موهاجیرەکانن.

ئێمە وەکو موسڵمان باوەڕمان بەو فەزڵانە هەیە، وە کەسانێکیش هەن بێبەش ئەکرێن لەو فەزڵە گەورەیە، ئەوانیش کەسانێکن کە دوورکەوتوونەتەوە لە مەنهەجی پێغەمبەری خوا و، بیدعە و داهێنانیان داهێناوە و ئەنجامیان داوە، بۆیە کاتێک بەرەو حەوزەکە دێن بۆ ئاو خواردنەوە، فریشتەکان نایەڵن و ڕێیان پێ ئەگرن و دووریان ئەخەنەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێت: "إِنَّهُمْ مِنِّي"(١٨٨). واتە: ئەوانە لە منن و ئوممەتی منن. بەڵام فریشتەکان پێی دەڵێن: "إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ"(١٨٩). واتە: تۆ نازانیت دوای تۆ چییان داهێنا. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "أَصْحَابِي

(١٨٦) موسنەدی ئەحمەد: ٦١٦٢.
(١٨٧)(سەحیحی بوخاری: ٦٥٧٩)، (سەحیحی موسلیم: ٢٣٠٣)، لەفزەکە هی موسلیمە.
(١٨٨) سەحیحی بوخاری: ٦٥٨٣ و ٦٥٨٤ و ٦٥٨٥.
(١٨٩) سەحیحی بوخاری: ٤٦٢٥.

أَصْحَابِي"[١٩٠].[١٩١]. واته: هاوەڵەکانم، هاوەڵەکانم، ئەوانە هاوەڵی منن. فریشتەکان دەڵێن پێی: "إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا بَدَّلُوا بَعْدَكَ"[١٩٢]. واتە: نازانیت لە دوای تۆ چییان گۆڕی. بەڵام مەبەست پێی هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا نییە ﷺ ئەوانەی کە گەیشتوون بە پێغەمبەری خوا و باوەڕیان پێی هێناوە، بەڵکوو مەبەست پێی ئەوانەیە کە باوەڕیان بە ﷻ و پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە و بیدعەیان ئەنجامداوە و شوێن مەنهەجی جگە لە هاوەڵان و سەلەفی ساڵح کەوتوون.

---

(١٩٠) سەحیحی بوخاری: ٣٣٤٩.

(١٩١) بزانە ڕەحمەتت لێبێ! بە چەند لەفزێک وتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە، ئەوانیش:

١) بە (يَا رَبِّ أَصْحَابِي) هاتووە کە لە: (موسنەدی ئەحمەد: ٢٠٩٦) و (سەحیحی بوخاری: ٢٧٤٠) و (سەحیحی موسلیم: ٢٨٦٠) و (جامیعی تورمزی: ٢٤٣٤)دا هاتووە.

٢) وە بە (يَا رَبِّ أُصَيْحَابِي) هاتووە کە لە: (سەحیحی بوخاری: ٦٥٢٦)دا هاتووە.

٣) وە بە (رَبِّ أَصْحَابِي) هاتووە کە لە: (جامیعی تورمزی : ٣١٦٧) و (موجتەبای نەسائی: ٢٠٨٧)دا هاتووە.

٤) وە بە (أَصْحَابِي أَصْحَابِي) هاتووە کە لە: (سەحیحی بوخاری: ٣٣٤٩)دا هاتووە.

٥) وە بە (أَصْحَابِي) هاتووە کە لە: (موسنەدی ئەحمەد: ٢٢٨١ ، ٢٢٨٢) و (سەحیحی بوخاری: ٣٤٤٧)دا هاتووە.

٦) وە بە (أَيْ رَبِّ) هاتووە کە لە: (موسنەدی ئەحمەد: ٢٣٢٧)دا هاتووە.

٧) وە بە (إِنَّهُمْ مِنِّي) هاتووە کە لە: (سەحیحی بوخاری: ٦٥٨٣ ، ٦٥٨٤ ، ٦٥٨٥)دا هاتووە.

(١٩٢) سەحیحی بوخاری: ٧٠٥٠ و ٧٠٥١.

وه ئەو حەوزەش "مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً؛ لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهَا أَبَدًا"[١٩٣]. واته: هەركەسێک قومێکی لێ بخواتەوە، ئیتر دوای ئەوە قەت تینووی نابێت.

ئەوەشی لێی بخواتەوە ئاگریش نابینیت و سزاش نادرێت.

وه بێگومان هەموو پێغەمبەران -عَلَيهِمُ السَّلَام- حەوزیان هەیە، وەکو پێغمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوْضًا، وَإِنَّهُمْ يَتَبَاهَوْنَ أَيُّهُمْ أَكْثَرُ وَارِدَةً، وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ وَارِدَةً"[١٩٤]. هەموو پێغەمبەرێک حەوزی خۆی هەیە و، شانازی ئەکەن کە زۆرترین خەڵک لە حەوزەکەی ئەوان بخواتەوە، وە من ئومێدم وایە زۆرترین کەس لەو حەوزەی من بخواتەوە.

کەواتە جێگیر بووە کە پێغەمبەرانی تریش -عَلَيهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام- حەوزیان هەیە، بەڵام حەوزی پێغەمبەری خوا لە هەموویان گەورەترە. (الْحَوْضُ الْمُكْرَمُ)، کەرامەت و ڕێزێکە نراوە لە پێغەمبەرمان ﷺ، وە ئەوانەشی نکوولّی ئەم حەوزەیان کردووە جەهمی و موعتەزیلەکانن و، گرووپێکیش لە خەواریجەکان نکوولّی ئەم حەوزە ئەکەن.

ﷲ تعالی بمانگێڕێت لەو کەسانەی کە ڕێزی خۆی بەسەریاندا ئەڕژێنێت بەوەی لە حەوزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەخۆنەوە، وە لەسەر پردی سیڕات بە ئاسانی تێپەڕ ببین، آمین.

---

(١٩٣) جامیعی تورمزی: ٢٤٤٤.

(١٩٤) جامیعی تورمزی: ٢٤٤٣.

١٣- وَالشَّفَاعَةُ حَقٌّ.(١)

١٤- وَأَنَّ نَاسَاً مِنْ أَهْلِ التَّوحِيدِ يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ بِالشَّفَاعَةِ حَقٌّ.(٢)

---

(١) وَالشَّفَاعَةُ حَقٌّ. واته: شەفاعەت حەق و ڕاستە.

(٢) وَأَنَّ نَاسَاً مِنْ أَهْلِ التَّوحِيدِ يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ بِالشَّفَاعَةِ حَقٌّ. واته: وە خەڵێک لە ئەهلی تەوحید دەرەچن لە ئاگری دۆزەخ بەهۆی شەفاعەتەوە، کە حەقە.

تکاکردن بۆ دەرکردنی ئەهلی تەوحید لە ئاگردا حەقە و کۆدەنگی و ئیجماعی ئەهلی سوننەیە، وە شەفاعەتیش تەنها بۆ ئەهلی تەوحید و نوێژە، کە گیرۆدەی تاوانی گەورەبوون و پێیەوە مردوون، ئەهلی شیرک و کوفر لە کافرە ئەسڵییەکان لە جوولەکە و جگە لەوانیش، وە لە کافرەکانی تریش لە جەهمییەکان و جگە لەوانیش، هیچیان شەفاعەت نایانگرێتەوە، ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَـٰعَةُ ٱلشَّـٰفِعِينَ)[١٩٥]. واته: ئیتر تکای تکاکاران هیچ قازانجێکیان پێ ناگەیەنێت.

---

([١٩٥]) المدثر: ٤٨.

## شەفاعەتە تایبەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ:

چەند جۆرێک شەفاعەتمان هەیە تایبەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەوانە:

١- شەفاعەتی گەورە (شَفَاعَةُ العُظمَى)، کە بۆ دەستپێکردنی حەشر و حیساب ئەیکات.

٢- شەفاعەت بۆ کردنەوەی دەرگای بەهەشت.

٣- شەفاعەت بۆ کەسانێک لە ئوممەتەکەی کە بەبێ حیساب بچنە بەهەشتەوە.

شەفاعەتی دەرهێنانی ئەهلی تەوحید لەناو ئاگر تەنها تایبەتی پێغەمبەری خوا نییە ﷺ، بەڵکوو پێغەمبەرانی دیکە و فریشتەکان و پیاوچاکان و شەهیدەکانیش شەفاعەت ئەکەن.

شەفاعەتیش تەنها تایبەت نییە بە دەرهێنان لە ئاگر، بەڵکوو بۆ بەرزکردنەوەی پلەی بەهەشتییەکانیش ئەکرێت.

بێگومان داواکردنی شەفاعەتیش لە دونیادا تەنها لە اللَّهُ تعالی داوا دەکرێت، وە داواکردنی شەفاعەت لە جگە اللَّهُ لە غایب و نادیارەکان و لە شتێک کە لە توانی جگە لە (اللَّهُ تعالی)دا نییە شیرکی گەورەیە، بەڵام داواکردنی لێخۆشوونی اللَّهُ لێت لە پیاوچاکێک، کێشەی نییە و هەندێ لە سەلەفیش کردوویانە.

شەفاعەتیش بەڵگەی ئایەت و فەرموودەی لەسەرە، اللَّهُ تعالی دەفەرمووێت: (وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَـٰوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَـٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ

لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ)[١٩٦]. واتە: چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکاندا هەن تکا و شەفاعەتیان هیچ سوودی نییە، مەگەر دوای ئەوەی کە ٱللَّه مۆڵەت بدات بۆ کەسێك کە خۆی بیەوێ و ڕازی بێ.

بۆیە هیچ ڕاجیاوازییەک نییە لەنێو هاوەڵان و تابیعییەکان و تابیعی تابیعییەکان دەربارەی جێگیربوونی شەفاعەت، بەڵام بە چەند مەرجێک وەکو ئەهلی سوننەت و جەماعەت باسیانکردووە، ئەوانیش:

١- ٱللَّه تعالى ڕازیبێت لە کەسی تکاکار، بۆیە کەسێک کە ٱللَّه تعالى لێی تووڕەیە، توانای دەفعکردنی تووڕەیی (ٱللَّه تعالى)ی نییە لە نەفسی خۆی، چ جای بێت ببێت بە تکاکار بۆ جگە لە خۆی و، تووڕەیی ٱللَّه تعالى لە جگە خۆی دوور بخاتەوە، وەکوو ٱللَّه تعالى دەفەرمووێت: (وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَـٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا)[١٩٧]. واتە: چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکاندا هەن تکا و شەفاعەتیان هیچ سوودی نییە.

٢- وە ٱللَّه تعالى ڕازیبێت لە کەسی تکابۆکراو و شەفاعەت بۆکراو، ٱللَّه تعالى ڕازی نییە لە کەسێک بە شیرکەوە مردبێت، وەکو خۆی دەفەرمووێت: (وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ

---

([١٩٦]) النجم: ٢٦.

([١٩٧]) هەمان پەراوێزی پێشەوە.

مُشْفِقُونَ)[١٩٨]. واتە: فریشتەکان تکا ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە ﷲ ڕازی بێت تکای بۆ بکرێ، وە فریشتەکان لە ترسی ﷲ زۆر دەترسن.

٣- وە ﷲ تعالی مۆڵەت بدات بە تکاکار، تاکوو تکاکەی بکات، وە لە تەواوی موڵکی ﷲ تعالی و ئەدەب بەرامبەری، بریتییە لەوەی هیچ کەسێک ناتوانێت شەفاعەت بکات تاکوو ئەو مۆڵەتی نەدات.

شەفاعەتیش چەند جۆرێکەوە، بەگوێرەی تکاکار ئەکرێت بەچەند جۆرێکەوە، وە بەگوێرەی تکا بۆکراو ئەکرێت بەچەند جۆرێکەوە، وە بەگوێرەی شوێنی تکاکردنەکەش ئەکرێت بە چەند جۆرێکەوە.

**سەرەتا تکاکارەکان کێن؟**

بێگومان لە بەدیهێنراوەکاندا پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەمینی کەسەکانە بە شەفاعەتکردن، کە کۆمەڵێک شەفاعەتیش هەن تایبەتن بەو و هیچ کەس بەشداری ناکات، لەوانە:

١- شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەهلی مەوقیف، ئەوانەی کە لە ساحەی قیامەتدا چاوەڕێی حەشر ئەکەن، بە کافر و موسڵمان و ئوممەتی خۆی و جگە لە خۆی، وەکو لە فەرموودە درێژەکەی باسی شەفاعەتدا هاتووە: خەڵکی لە ساحەی مەحشەردا ئەچنە خزمەتی باوکمان ئادەم ﷺ و پێی دەڵێن: ئەی ئادەم تۆ باوکی مرۆڤایەتیت و ﷲ تعالی بەدەستی خۆی

---

(١٩٨) الأنبياء: ٢٨.

دروستی کردوویت و ڕۆحی کردووه به بەرتدا، وه فریشتەکان سەجدەی ڕێزیان بۆ بردوویت، شەفاعەتمان بۆ بکە "أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟" واته: نازانیت لە چ حاڵێکداین؟ "أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟". واته: نابینیت گەشووین بە چی؟ پێغەمبەر ئادەمیش ﷺ دەفەرمووێت: اللَّهُ تعالی زۆر تووڕەیە ئەمڕۆ، تووڕەبوونێک کە پێشتر هەرگیز ئاوها تووڕە نەبووە، من ڕێگریم لێکرا لە خواردنی دارێک، بەڵام سەپێچیم کرد و لەو دارەم خوارد، "نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي". واته: تەنها خۆم تەنها خۆم، بڕۆن بۆلای جگە لە من، خەڵکی ساحەی مەحشەریش ئەچن بۆ لای پێغەمبەر نوح ﷺ، نوحیش ئیزنیان ئەدا و ئەیاننێرێت بۆ لای ئیبڕاهیم ﷺ و، ئەویش ئەیاننێرێت بۆ لای موسا و، موساش ﷺ ئەیاننێرێت بۆ لای عیسا و، عیساش ﷺ بەهەمان شێوە ئیزنیان ئەدات و، دەفەرمووێت: "اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ)). واته: بچن بۆ لای موحەممەد ﷺ، ئەچن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی دەڵێن: "أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَخَاتَمُ الْأَنْبِيَاءِ". واته: تۆ نێردراو و پێغەمبەری خوایت و کۆتای پێغەمبەرانیت، "وقدْ غَفَرَ اللَّهُ لكَ ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِكَ وما تَأَخَّرَ ". واته: اللَّهُ تعالی لە تاوانەکانی پێش و دوایشت خۆشبووە؛ بۆیە "اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ". واته: تکامان بۆ بکە لە پەروەردگارت لەم نارەحەتییەی ساحەی مەحشەر ڕزگارمان بێت، "أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟". واته: ئایا نازانیت چیمان بەسەرهاتووە و گەشتووین بە چی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێت: "فَأَنْطَلِقُ، فَآتِي تَحْتَ الْعَرْشِ". واته: ئەچمە ژێر عەرشەوە، "فَأَقَعُ

سَاجِدًا لِرَبِّي". واتە: ئەکەوم بەسەجدەدا بۆ پەروەردگارم، "ثُمَّ يَفْتَحُ اللّٰهُ عَلَيَّ". واتە: پەروەردگارم دەرگایەکم بەسەردا ئەکاتەوە، ﷲ کۆمەڵێک حەمد و سەنا و سوپاسم فێرەکات کە لەوەو پێش نەمزانیوە و بەردەوام لە سەجدەدا ئەبم، "ثُمّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهِ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ"(١٩٩). واتە: پاشان پێم ئەوترێت ئەی موحەممەد، سەرت بەرزکەرەوە، داوابکە پێت ئەدرێت، شەفاعەت بکە شەفاعەتەکەت گیرا ئەبێت، منیش سەر بەرز ئەکەمەوە و شەفاعەت ئەکەم بۆ ئەهلی مەحشەر؛ تاکوو ﷲ تعالی حەشریان بکات. ئەم شەفاعەتە تایبەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەشێکیشە لە مەقامی مەحموود و سووپاسکراوە، کە تەواوی بەدیهێنراوەکان لە جنۆکە و مرۆڤەکان سووپاسی ئەکەن، بۆیە ئەمە بەشێکە لە مەقامی مەحموود؛ چونکە مەقامی مەحموود، مەقام و پێگەیەکە ﷲ تعالی نایدات بە هیچ کەسێک جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش بریتییە لەوەی ﷲ تعالی پێغەمبەرەکەی ﷺ بەرز ئەکاتەوە و دایدەنێت لەسەر عەرشەکەی خۆی.

٢- شەفاعەتکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەهلی تەوحید لەناو ئاگری دۆزەخ کە دەربهێنرێن، ئەم شەفاعەتە تەنها تایبەتی پێغەمبەری خوا نییە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کەسە کە ئەم شەفاعەتە ئەکات، دوای ئەو پێغەمبەران و فریشتەکان و پیاوچاکان و شەهیدەکان و منداڵان بۆ دایک و

---

(١٩٩) سەحیحی موسلیم: ١٩٤.

باوکیان گەر پێش ئەوان مردبێتن، ئەیکەن، ئەمانەش تەنها بۆ کەسانێکە کە ئەهلی تەوحیدبن، کە تاوانی گەورەیان ئەنجامداوە و تەوبەیان نەکردووە و پێیەوە گەیشتوونەتەوە بە الله تعالی.

٣- شەفاعەتێکی دیکە لەو شەفاعەتانەی کە تایبەتی پێغەمبەری خوان ﷺ و تایبەتی هیچ کەسێکی دیکە نییە، بریتییە لە شەفاعەت بۆ ئەبو تاڵیبی مامی، ئەویش شەفاعەتی ئاسانکردن و سووککردنی سزایە لەسەر ئەبو تاڵیب، ئەمەش تەنها لە پێغەمبەری خوا ﷺ و تەنها بۆ ئەبو تاڵیب قەبووڵە، ئەویش لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردووە و ئەبو تاڵیبیش زۆر یارمەتی پێغەمبەری خوا و ئیسلام و موسڵمانانی داوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پشتی ئەوەوە دەعوەی تەوحیدی ئەکرد و کافرەکانی قوڕەیشیش نەیانەتوانی بە ئاسانی ئازاری پێغەمبەری خوا بدەن ﷺ، بەڵام کاتێک ئەبو تاڵیب وەفاتی کرد، کافرەکان دەستیان کردەوە بە دژایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکرا و زیاتر، تاکوو پیلانی کوشتیان بۆ دەرکرد و هەوڵیاندا بیکوژن، بۆیە جمهوری سەلەف لەسەر ئەوەن کە ئەم شەفاعەتە تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ و هیچ کەسێکی دیکە ئەم شەفاعەتەی بۆ نییە و نایگرێتەوە.

جگە لە پێغەمبەری خواش ﷺ، ئیمانداران و فریشتەکان و پیاوچاکان و شەهیدەکان شەفاعەت ئەکەن، وە هێندەی کاریگەری بەهێزی ئیمانی شەفاعەتکاران، شەفاعەتەکەیان فراوان ئەبێت، پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: "يَدْخُلُ الْجَنَّةَ بِشَفَاعَةِ رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَكْثَرُ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، قَالُوا: يَا رَسُولَ

اللَّهِ سِوَاكَ؟ سِوَايَ، فَلَمَّا قَامَ، قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا ابْنُ أَبِي الْجَذْعَاءِ"[٢٠٠]. واته: به ئەندازەی هۆزی بەنی تەمیم خەڵک به شەفاعەتی پیاوێک له ئوممەتەکەم ئەچنه بەهەشتەوە، هاوەڵان وتیان: واته: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسه جگه له خۆتە؟ فەرمووی: بەڵێ جگه له منه، جا کاتێک هەستا، وتم: ئەو کەسه کێیه؟ وتیان: ئەو کەسه (إبن أبي الجذعاء)ه.

کەواته کەسێک ئەتوانێت شەفاعەت بکات بۆ خەڵکانێکی زۆر زۆر له خزم و بێگانەی خۆی، وه جاری واش هەیه ئەو کەسەی شەفاعەتی بۆ ئەکرێت یەک کەسه، بەڵام شەفاعەتکارەکان زۆرن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "مَا مِنْ مَيِّتٍ تُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ؛ إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ"[٢٠١]. واته: هیچ کەسێک نییه له موسڵمانان به تاوانەوە ڕۆشتبێت و ١٠٠ کەس له ئەهلی تەوحید نوێژی لەسەر بکەن، له ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: "أَرْبَعُونَ رَجُلًا لَا يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا". واته: چل کەس که هیچیان هاوەڵیان بۆ ﷲ تعالی بڕیار نەدابێت و موەحیدبن، داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ ئەو مردووە، ﷲ تعالی ئەو شەفاعەتەیان لێگیرا ئەکات.

بێگومان شەفاعەت له ژیانی بەرزەخدا بوونی هەیه، وەکو شەفاعەتی نوێژخوێنان لەسەر مردووی موسڵمان.

---

(٢٠٠) جامیعی تورمزی: ٢٤٣٨.

(٢٠١) سەحیحی موسلیم: ٩٤٧.

وه شەفاعەتیش لە قیامەتدا هەیە، لەوانە شەفاعەتی گەورە (العُظْمَى) هی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە شەفاعەت لەکاتی حیساب و دەستپێکردنەکەیدا، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم ئەچنە ناو بەهەشتەوە "بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلَا عَذَابٍ، مَعَ كُلِّ أَلْفٍ سَبْعِينَ أَلْفًا"[٢٠٢]. واتە: بەبێ حیساب و سزا، لەگەڵ هەر هەزارێکیاندا حەفتا هەزاری تر ئەچنە بەهەشتەوە. وەکو لە [سنن الترمذي][٢٠٣]دا هاتووە و ئیبنو ماجەش[٢٠٤] ڕیوایەتی کردووە.

شەفاعەت لەسەر پردی سیڕاتدا، کەسانێک هەن شایستەن فڕێ بدرێنە ناو دۆزەخەوە، بەڵام بە شەفاعەتی شەفاعەتکاران ڕزگاریان ئەبێت، کە لێرەدا شەفاعەتی ئەڕحام دەرەکەوێت، واتە گەر منداڵێک پێش دایک و باوکی و پێش باڵغبوونی بمرێت، لەسەر پردی سیڕاتدا ئەبێت بە شەفاعەتکاری دایک و باوکی موسڵمانی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَ لَهَا ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، كَانُوا حِجَابًا مِنَ النَّارِ"[٢٠٥]. واتە: هیچ ئافرەتێک نییە کەسێ منداڵی بمرێت، ئیللا لە قیامەتدا ئەبن بە پەردەیەک لە نێوانی ئەوان و ئاگری دۆزەخ. وە دەفەرمووێت: "صِغَارُهُمْ دَعَامِيصُ الْجَنَّةِ"[٢٠٦]. واتە: ئەو منداڵانەی پێش

---

(٢٠٢) موسنەدی ئەحمەد: ٢٣٣٠٣.
(٢٠٣) جامیعی تورمزی: ٢٤٣٧.
(٢٠٤) سونەنی ئیبن ماجە: ٤٢٨٦.
(٢٠٥) سەحیحی بوخاری: ١٢٤٩ و ١٢٥٠.
(٢٠٦) سەحیحی موسلیم: ٢٦٣٥.

باڵغبوون ئەمرن، ئەبن بە بەربەست و حیجاب بۆ دایک و باوکیان، وە دایک و باوکیان ئەخەنە ناو بەهەشتەوە.

شەفاعەت بۆ تاوانباری ئیماندار لە ناو ئاگری دۆزەخ، وە شەفاعەت بۆ کرانەوەی دەرگای بەهەشت، وەک باسکرا. وە شەفاعەت لەناو بەهەشتیشتدا هەیە، بۆ ئەوانەی پلەیان نزمە و حەزەکەن پلەیان بەرز بکرێتەوە، الله تعالی دەفەرمووێت: (وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَـٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ)[٢٠٧]. واتە: وە ئەوانەی بڕوایان هێناوە و نەوەکانیشیان دوایان کەوتوون بە باوەڕدارێتی، نەوەکانیان لە بەهەشتدا دەگەیەنین پێیان.

کەواتە بابەتی شەفاعەت بڕاوەتەوە و، کۆدەنگی سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لەسەرە، هەندێ گرووپی گومڕا نەبێت کە باوەڕیان پێی نییە، لەوانە: موعتەزیلەکان و خەواریجەکان، لای ئەوان کەسانێک گەر بە تاوانی گەورەوە مردن ئیتر شەفاعەت نایانگرێتەوە، وە پێیان وایە هەرکەس بچێتە ناو دۆزەخ ئیتر نایەتە دەرەوە، بێگومان ئەمەش عەقیدەیەکی بەتاڵ و پووچە.

---

(٢٠٧) الطور: ٢١.

## ١٥ - وَعَذَابُ القَبْرِ حَقٌّ.[١]

---

(١) وَعَذَابُ القَبْرِ حَقٌّ. واته: وه سزای گۆڕ حەق و ڕاستە.

بێگومان مرۆڤ کاتێک ئەمرێت، تاکوو زیندوو ئەبێتەوە ژیانێک ئەژی، کە ژیانی ناوەندە لەنێوانی ژیانی دونیا و قیامەتدایە و، پێی ئەوترێت (بەرزەخ).

**بەرزەخ حەقە:**

ئەم بەرزەخەش حەقە، وەکوو:

- ١- اللَّهُ تعالی دەفەرموێت: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾[٢٠٨]. واتە: لەهەر شوێنێك بن مردن پێتان دەگات با لەناو قەڵا و کۆشکی بەرز و قایمیشدابن. بێگومان هەموومان ڕۆژێک دێت مردن یەخەمان بگرێت.
- ٢- وە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ﴾[٢٠٩]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بە دووڕووەکان بڵێ هەڵهاتن سوودتان پێ ناگەیەنێ ئەگەر لە مردن هەڵبێن. بێگومان ڕاکردن لە مردن سوود بە کەس ناگەیەنێت.

---

(٢٠٨) النساء: ٧٨.

(٢٠٩) الأحزاب: ١٦.

٣- وه دەفەرمووێت: (إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ)[٢١٠]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن.

بێگومان جێگیربووە کە ﷲ تعالی فریشتەیەکی ڕاسپاردووە بە کێشانی ڕۆحەکان، کە پێی ئەوترێت (مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ)، وەکو ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ)[٢١١]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ فریشتەی گیان کێشان کە کێشانی گیانی ئێوەی پێ سپێراوە، دەتان مرێنێ.

وە لە فەرموودەکەی بەڕائدا هاتووە -ﷲ لێی ڕازیبێت-، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: **"ثُمَّ يَجِيءُ مَلَكُ الْمَوْتِ عَلَيْهِ السَّلَامُ حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ"**[٢١٢]. واتە: فریشتەی گیان کێشان دێتە لای سەرییەوە و تاکوو ڕۆحەکە ئەکێشێت و، ڕۆحەکە ئەداتە دەست ئەوانەی کە لەگەڵیدان لە فریشتەکانی تر.

## کێشانی گیانی مرۆڤی موسڵمان:

بێگومان کاتێک مرۆڤی موسڵمان ڕۆحی ئەکێشرێت چەند حاڵەتێکە، هەیانە ﷲ تعالی ڕاستەوخۆ بەرەو بەهەشت ئەیبات، ڕۆحەکەی لەناو نازونیعمەتی ﷲ تعالی دایە، وە پلەو پێگە و جێگەی ڕۆحەکان بەگوێرەی ئیمانەکەیەتی، پێغەمبەران نزیکترن لە ﷲ تعالی تاکوو کەسانی ئاسایی، وە ئەسڵ لە ڕۆحی

---

(٢١٠) الزمر: ٣٠.

(٢١١) السجدة: ١١.

(٢١٢) موسنەدی ئەحمەد: ١٨٥٣٤.

کەسی موسڵمانیش وایە موعەللـەقە بە بەهەشتەوە، وەکو چۆن بەرووبوومێک بە دارێکەوەیە، ئاوهاش ڕۆحی مرۆڤی موسڵمان ئەسڵ وایە وابەستەیە بە بەهەشتەوە.

وە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کە ڕۆحی شەهیدەکان لە بەروبووم و ڕووبارەکانی بەهەشت ئەخۆن و ئەخۆنەوە، وەکو ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داوود و جگە لەوانیش ئەیگێڕنەوە، بەڵام ئەمە تایبەتی شەهیدەکان نییە بە تەنها، بەڵکوو ئیماندارانیش ئەگرێتەوە، وە ئەگونجێ لە ئیمانداران هەبێت پلەی لە شەهیدەکان بەرزتر بێت، وەکو پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و هەندێک وەلی و دۆستەکانی ﷲ تعالی.

وە کەسانێکیش هەن ڕاوستەوخۆ سزا ئەدرێن با ئەهلی تەوحیدیش بن، ئەوانە ڕۆحەکانیان لەناو سزادا ئەبێت چونک ﷲ تعالی ویستی لەسەر هەیە، ئەوانیش کەسانێک کە لەناو تاوانی گەورەدا بوون، با ئەهلی ئیمانیش بن، ئەوانە لە ژیانی بەرزەخدا لە سزادا ئەبن تاکوو هەستانی قیامەت.

بۆیە سزاکەی کاتییە، بەڵام حەقە، وەکو ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ)[٢١٣]. واتە: وە لە بەردەمیاندا بەرزەخێك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە.

---

(٢١٣) المؤمنون: ١٠٠.

وە ﷲ تعالی لە باسی فیرعەون و قەومەکەیدا دەفەرمووێت: (ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ)[٢١٤]. بەیانیان و ئێواران سزا ئەدرێن. کە ئەوەش بەڵگەیەک بەهێزە بۆ ئەم بابەتە.

لە ناو گۆڕدا پێش ژیانی بەرزەخ، (فِتْنَةُ القَبْر) هەیە، کە مەبەست پێی: پرسیارەکانی ناو گۆڕە، کاتێک ﷲ تعالی دوو فریشتە ئەنێرێت تاکوو پرسیار لە مردووەکە بکەن لەسەر سێ شت، ئەوانیش:

١) (مَنْ رَبُّكَ)، واتە: پەروەردگارت کێیە؟ پەروەردگار و پەرستراوت کێ بووە؟

٢) (وَمَا دِينُكَ)، واتە: دینت چییە؟ لەسەر چ ڕێباز و بەرنامەیەک بوویت؟

٣) (وَمَنْ نَبِيُّكَ)[٢١٥]، واتە: پێغەمبەرت کێیە؟ پێشەوا و پێغەمبەرت کێ بووە؟

ئەوەی لەسەر تەوحید بێت بێگومان تەنها ﷲ تعالی پەروەردگار و پەرستراوی حەقیتی، وە دینی ئیسلام تاکە دین و بەرنامە و ڕێبازێتی، وە موحەممەد ﷺ تاکە پێغەمبەر و پێشەوا و سەرۆک و ڕابەرێتی، و هیچ کەسێک نییە لە ئەهلی ئیمان، ئیللا ئەم وەڵامەی پێیە، ئەوانەی ئەهلی کوفرن و ئەهلی تەوحید نین ئەم وەڵامەیان پێ نییە، چونکە تاکە پەرستراوی حەقیان ﷲ تعالی

---

(٢١٤) غافر: ٤٦.

(٢١٥) جامیعی تورمزی : ٣١٢٠.

نەبووە و، شەریکیان بۆ بڕیار داوە، وە تاکە دین و ڕێبازیان دینی ئیسلام نەبووە و، دین و بەرنامە و ڕێبازی تریان تێکەڵ کردووە، وە تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەوا و ڕابەریان نەبووە، دەیان کەسی تریان کردووە بە ڕابەر و پێشەوای خۆیان.

بۆیە سزای گۆڕ حەققە، ئەوەتا:

ﷲ تعالى دەفەرموویت: (ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ)[٢١٦]. بەیانیان و ئێواران دەبردرێنە دیاری ئاگری دۆزەخ، ڕۆژێکیش قیامەت هەڵدەستێت (فەرمان دەدرێ) دارو دەستەی فیرعەون بخەنە سەختترین سزاوە.

١- وە دەفەرموویت: (وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ)[٢١٧]. واتە: بەڕاستی بۆ ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە و کافر بوون، سزایەك هەیە پێش سزای ڕۆژی دوایی. وەکو لە (إبن عباس و برَّاء)و جگە لەوانەوە هاتووە -ﷲ لێیان ڕازیبێت- کە دەڵێن: **"أَنَّهُ عَذَابُ القَبر"**. واتە: بریتییە لە سزای گۆڕ.

٢- وە دەفەرموویت: (أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ)[٢١٨]. واتە: شانازیتان بە زۆریی سەروەت و سامانەوە، ئێوەی بێ ئاگا کردووە. ئەمەش بەهەمان شێوە

---

(٢١٦) غافر: ٤٦.

(٢١٧) الطور: ٤٧.

(٢١٨) التكاثر: ١.

لەسەر سزای گۆڕ هاتووە، وەک لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﷺ هاتووە، ئەڵێ: "كُنَّا نَشُكُّ فِي عَذَابِ القَبْرِ، حَتَّى نَزَلَتْ هذِهِ الآيَة: (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ))[٢١٩]" واتە: ئێمە شکوگومانمان هەبوو لە سزای گۆڕ، تاکوو ئەم ئایەتە دابەزی: (أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ).

٣- وە دەفەرمووێت: (وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ)[٢٢٠]. واتە: وە بەڕاستی ئێمە سزای دونیایان پێ دەچێژین جگە لە سزای هەرە گەورەی دۆزەخ تا بگەڕێنەوە بۆ لای ﷲ. لە موجاهیدەوە هاتووە کە وتوویەتی: "أَنَّهُ عَذَابُ القَبر". واتە: بریتییە لە سزای گۆڕ.

بەڵگەکان زۆرن، لە حەدیسی پێغەمبەری خواشدا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: "إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ"[٢٢١]. واتە: ئەو دوانە سزا ئەدرێن، بەهۆی دوو شتی گەورەوەش سزا نادرێن -کە لای خەڵک گەورەیە-، ئەویش بەهۆی نەمیمە و خۆ نەپاراستنە لە میز.

---

(٢١٩) (جامیعی تورمزی: ٣٣٥٥)، (جامع البيان: بە: ٢٤، لا: ٦٠٠)]، لەفزەکە هی تەبەرییە.

(٢٢٠) السجدة: ٢١.

(٢٢١) سەحیحی بوخاری: ٢١٨.

## ١٦- وَمُنكَرٌ وَ نَكِيرٌ حَقٌّ.(١)

---

(١) وَمُنكَرٌ وَنَكِيرٌ حَقٌّ. واته: مونكەر و نەكير حەق و ڕاستن.

مونكەر و نەكير ئەو دوو فريشتەيەن كە دێن پرسيار لە خەڵک ئەكەن لەناو گۆڕەكەيان (عَن رَبِّهِ وَدِينِهِ وَنَبِيِّهِ). واتە: دەربارەی پەروەردگار و دين و پێغەمبەرەكەيان. (اللَّهُ تعالى)ش دەفەرمووێت: (يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ)[٢٢٢]. واتە: ئەوانەی كە بڕوايان هێناوە اللَّهُ تعالى دامەزراويان دەكات بە وتەی چەسپاو و بەجێ كە وتەی شايەتمانە لە ژيانی دونيادا و لەڕۆژی دوايشدا، وە اللَّهُ ستەمكارانيش گومڕا دەكات. مەبەست بە (ٱلْءَاخِرَةِ) بريتييە لە: ناو گۆڕ، وەكوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: "بێگومان ئەو فريشتانە پرسيارتان لێ ئەكەن دەربارەی ئەو سێ شتە".

بێگومان ئەمەش عەقيدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

---

([٢٢٢]) إبراهيم : ٢٧.

## ١٧- وَالكِرَامُ الكَاتِبُونَ حَقٌّ.[(١)]

(١) وَالكِرَامُ الكَاتِبُونَ حَقٌّ. واته: فریشته بەڕێزە نووسەرەکان، ئەوانەی لەسەر شانی بەندەکانن و چاکە و خراپەیان ئەنووسن، حەق و ڕاستن.

بێگومان باوەڕهێنان بە فریشتەکان لە ئوسووڵ و بنەماکانی ئیمانە، وە بەتایبەتیش لێرەدا ئیمان بە فریشتەکانی سەرشانی هێناوە، کە گرووپانێک هەبوون نکووڵی (كِرَامًا كَـٰتِبِينَ)یان کردووە، لەکاتێکدا ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ)[(٢٢٣)]. واتە: هەر وتەیەك لە دەمی دەرچێ چاودێرێکی بەسەرەوەیە و دەینووسێ. جا ئەو فریشتەیەی کە چاکەکە ئەنووسێت دەستبەجێ چاکەکە ئەنووسێت، ئەو فریشتەیەی خراپەکە ئەنووسێت دەستبەجێ نایننووسێت و ماوەیەک چاوەڕێ ئەکات، وەک لە حەدیس و ئەسەرەکاندا هاتووە، چاوەڕێ ئەکات تا بزانێت تەوبە ئەکات یان نا، تەوبەی کرد؛ ئەسڕێتەوە، تەوبەی نەکرد؛ ئەینووسێت.

پەروەردگار بەر شەفاعەتی پێغەمبەری خوامان بخات ﷺ، وە وامان لێبکات وەڵامی ئەو دوو فریشتەیە بدەینەوە و وەڵامی چەسپاومان پێبێت، وە تاکە پەرستراوی حەقمان ﷲ تعالی بێت، وە تاکە دین و بەرنامە و ڕێبازمان ئیسلام بێت، وە تاکە پێشەوا و پێغەمبەرمان پێغەمبەری خوا بێت، اللهم آمین.

---

(٢٢٣) ق: ١٨.

## ١٨- وَالْبَعْثُ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ حَقٌّ.(١)

(١) وَالْبَعْثُ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ حَقٌّ. واتە: زیندووبوونەوەی دوای مردن ڕاست و حەققە.

یەکێکی دیکە لەو کۆدەنگییانەی سەلەفی ساڵح و ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتییە لە زیندووبوونەوەی دوای مردن، ئەوەی باوەڕی پێی نەبێت؛ ئیمانی نییە.

بێگومان هیچ کەسێک نکوولّی زیندووبوونەوەی دوای مردنی نەکردووە، ئیللا موتەکەبیر و خۆبەگەورەزان نەبێت؛ چونکە بێگومان زیندووبوونەوەی دروستکراوەکان لای ﷲ تعالی ئاسانترە لە زیندووکردنەوەیان لەدوای مردنیان، ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ)[٢٢٤]. واتە: وە نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیرچۆتەوە ئەو کافرە کە دەڵێ: کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون؟ ﷲ تعالی لە وەڵامیاندا دەفەرمووێت: (قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ)[٢٢٥]. واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ ئەو زاتە

---

(٢٢٤) یس: ٧٨.

(٢٢٥) یس: ٧٩.

زيندوويان دەكاتەوە كە لە يەكەم جارەوە بەديهێناون و ئەو بە هەموو دروستكراوێك زانا و ئاگايە.

كەواتە تەنها موتەكەبير و خۆبەگەورەزانان نكوولْى ئەوەيان كردووە، تەنانەت ئيبليس باوەڕى بە ڕۆژى زيندووبوونەوە هەبووە و وتوويەتى: (قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ)[٢٢٦]. واتە: ئيبليس وتى: ئەى پەروەردگارم دەى مۆڵەتم بدە تا ڕۆژێ مردووان زيندوو دەكرێنەوە.

بێگومان پەروەدگارێک کە بەتوانا بێت مەخلووقەكان لە نەبوونەوە بێنێتە بوون، جارێكى تريش ئەتوانێت دروستيان بكاتەوە، ﷲ تعالى دەفەرموويت: (مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ)[٢٢٧]. واتە: دروستكردنى هەمووتان لە سەرەتاوە و، زيندووكردنەوەتان وەكوو دروست كردن و زيندووكردنەوەى تەنها كەسێك وايە.

وە ﷲ تعالى لە چەندين شوێنى قورئاندا سوێند ئەخوات و دەفەرموويت: (بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ)[٢٢٨]. واتە: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان زيندوو دەكرێنەوە. يان (بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ)[٢٢٩]. واتە: سوێند بە پەروەردگارم ئەو

---

(٢٢٦) الحجر: ٣٦.
(٢٢٧) لقمان: ٢٨.
(٢٢٨) التغابن: ٧.
(٢٢٩) سبأ: ٣.

قیامەتەتان بۆ دێ. یان (قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ)[٢٣٠]. واتە: پێیان بڵێ: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان ئەوە ڕاستە.

پاشان ئیمان و باوەڕ بە ڕۆژی قیامەت یەکێکە لە ڕووکن و پایەکانی ئیمان، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەدیسەکەی جبریل ﷺ دەفەرمووێت، کاتێک پرسیاری لێکرد: "مَا الْإِيمَانُ؟" واتە: ئیمان چییە؟ فەرمووی: "أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَلِقَائِهِ". لە ڕیوایەتکی تردا: "وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ"[٢٣١]. واتە: بریتییە لە باوەڕهێنان بە ﷲ تعالى و فریشتەکان و پێغەمبەران و گەیشتنەوە پێی. یان باوەڕیان بوون بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە.

ﷲ تعالى دەفەرمووێت: (زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟). واتە: کافران وایان دەزانی کە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو ناکرێنەوە. تەبعەن لە ئیمان و عەقیدەی دەستەیەک لە کافرەکان وایە کە زیندوو نابنەوە، ئەمەش هەموو کافرێک نا، بەڵکوو دەستەیەک لە کافرەکان، (قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ). واتە: پێیان بڵێ: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان زیندوو دەکرێنەوە. (وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ)[٢٣٢]. واتە: وە ئەمەش بۆ ﷲ ئاسانە.

---

([٢٣٠]) یونس: ٥٣.
([٢٣١]) سەحیحی بوخاری: ٤٧٧٧.
([٢٣٢]) التغابن: ٧.

**ئەوانەی دژایەتی زیندووبوونەوەیان کردووە:**

ئەوانەی کە دژایەتی زیندووبوونەوەیان کردووە بە درێژایی مێژوو دوو دەستەبوون، ئەوانیش:

١- کۆمۆنیستەکانی ئەم سەردەمە: ئەوانەی کە ئەسڵەن نکوولّی خالیقێک ئەکەن کە سەرەتا مەخلووقاتی بەدیهێنابێ، ئەوانە گەر نکوولّی خالیق و دروستکارێک بکەن، بە دڵنیاییشەوە نکوولّی ئەوەش ئەکەن کە زیندووبوونەوە هەبێت.

٢- دەهرییەکان: ئەمانە بڕوایان بە ئەسڵی خەلق هەیە، کە اللَّهُ تعالی دروستی کردووە، بەڵام باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نییە.

ئەوانە باوەڕیان نییە کە مەخلووقات زیندووبکرێتەوە، ئەوانیش دەڵێن: (وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ)[٢٣٣]. واتە: اللَّهُ زاتێکە بەدیهێنانی دەستپێکردووە لە دوای مردنی دووبارە دروستی دەکاتەوە و، ئەم دروستکردنەوەی دووەم لای اللَّهُ ئاسانترە.

(٢٣٣) الروم: ٢٧.

## بەڵگەکانی زیندووبوونەوە:

بەڵگەکان دەربارەی زیندووبوونەوە زۆرن، گەر تێڕابمێنیین لە قورئان، ئەبینین اللَّهُ تعالى بە چوار جۆر بە پوختی بەڵگەکانی زیندووبوونەوە ئەخاتە بەرچاومان تاکوو تێبگەین، ئەوانیش:

١- سەرەتا لە جۆری بەڵگەکان بریتییە لە (دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی): اللَّهُ تعالى دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی ئەکاتە حوججە و بەڵگە بۆ زیندووبوونەوەی مەخلووقات لە قیامەتدا، اللَّهُ تعالى دەفەرمووێت: (أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ)[٢٣٤]. واتە: ئایا ئەوانە نەیان زانیوە بەڕاستی ئەو پەروەردگارەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە، وە لە دروست کردنیاندا ناتوانا و دەستە پاچە نەبووە و بەتوانایە مردووانیش زیندوو بکاتەوە.

٢- پاشان (دروستکردنی مرۆڤەکان لەسەرەتاوە): بەڵگەیەکی بەقوەتە لەسەر زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت، لە نەبوونەوە بیانهێنێتە بوون زۆر ئاسانترە دووبارە بیانژێنێتەوە.

٣- (بووژاندنەوەی زەوی و گژوگیا دوای پووکانەوەیان): اللَّهُ تعالى دەفەرمووێت: (وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا

---

(٢٣٤) الأحقاف: ٣٣.

ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحْيَاهَا لَمُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰٓ)[٢٣٥]. واته: له نیشانەکانی دەسەڵاتی الله تعالى بریتییه لەوەی زەوی دەبینی وشك و ماته کەچی کاتێ بارانمان باراند بەسەریدا به ڕوانی ڕووەك دەکەوێته جوڵه و دەبوژێتەوه و بەرز دەبێتەوه، بێگومان ئەوەی زەوی وشك دەبووژێنێتەوه زیندووکەرەوەی مردووەکانیشه.

٤- له بەڵگەکانی زیندووبوونەوه (زیندووکردنەوەی هەندێ له مردووەکانه له دونیادا): الله تعالى چیرۆکەکانیانی له قورئادا باس کردووه، وەکو دەفەرمووێت: (فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ)[٢٣٦]. واته: یەکسەر خوای گەوره سەد ساڵ مراندی، پاشان زیندووی کردەوه.

بێگومان کۆتایی هاتنی دونیا به فوو (نەفخ)ێک ئەبێت و زیندووبوونەوەش هەر به نەفخێکی سووڕ ئەبێت به فەرمانی الله لەلایەن ئیسڕافیلی فریشەی بەڕێزی الله تعالى، الله تعالى دەفەرمووێت: (وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَـٰوَاتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ)[٢٣٧]. واته: کاتێ فووکرا به کەڕەنادا یەکسەر هەموو ئەوانەی له ئاسمانەکان و زەویدان دەمرن، مەگەر کەسانێک الله بیەوێ نەمرن. ئەمه نەفخەی یەکەمه، که تەواوی مەخلووقات ئەمرن و نامێنن،

(٢٣٥) فصلت: ٣٩.
(٢٣٦) البقرة: ٢٥٩.
(٢٣٧) الزمر: ٦٨.

(وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ)[٢٣٨]. واته: وه جارێكی دیكه فوو دەكرێ به كەرەنادا ئینجا ئەوان كوتوپڕ له گۆڕەكان دێنه دەرەوه و بەپەله دەڕۆن بۆ لای پەروەردگاریان. (فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ)[٢٣٩]. واته: ئینجا كاتێ فوو دەكرێ به كەرەنادا لەو ڕۆژەدا هیچ خزمایەتییەك نامێنێ له نێوانیاندا، وه پرسیاری یەكتری ناكەن كەس لەكەس ناپرسێ. (وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ)[٢٤٠]. واته: ئینجا فوو دەكرێ به شەیپووردا ئەوه ڕۆژی بەدی هاتنی هەڕەشەكانه. (فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ)[٢٤١]. واته: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیه هەر یەک نەعرەت و شریخەیه (یەک فووه). (فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ)[٢٤٢]. واته: ئیتر كتوپڕ وان له دەشتێكی سپی كاكی به كاكیدا. له چەندین شوێندا ﷲ تعالی باسی ئەو نەفخەیه ئەكات كه مەخلووقات زیندوو ئەكاتەوه، لەكاتێكدا به نەفخەیەک كۆتایی پێهاتووه.

---

(٢٣٨) یس: ٥١.
(٢٣٩) المؤمنون: ١٠١.
(٢٤٠) ق: ٢٠.
(٢٤١) النازعات: ١٣.
(٢٤٢) النازعات: ١٤.

١٩- وَأَهْلُ الْكَبَائِرِ فِي مَشِيئَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.(١)

٢٠- وَلَا نُكَفِّرُ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِذُنُوبِهِمْ، وَنَكِلُ أَسْرَارَهُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.(٢)

---

(١) **وَأَهْلُ الْكَبَائِرِ فِي مَشِيئَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.** واته: ئەهلی تاوانە گەورەکان لە ژێر مەشیئەت و ویستی (اللّٰه تعالی)دان.

(٢) **وَلَا نُكَفِّرُ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِذُنُوبِهِمْ، وَنَكِلُ أَسْرَارَهُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.** واته: وە تەکفیری ئەهلی قیبلە ناکەین بەهۆی تاوانەکانیان کە ئەنجامیان داوە، نهێنییەکانیشیان بەجێ ئەهێڵین بۆ اللّٰه تعالی.

لە بیروباوەڕ و کۆدەنگی تەواوی ئەهلی سوننەت بریتییە لەوەی ئەهلی تاوانە گەورەکان و ئەهلی قیبلە کە ئەهلی تەوحید و نوێژ و موسڵمانن، لەژێر ویستی (اللّٰه تعالی)دان، تەکفیریش ناکرێن بەهۆی تاوانی گەورەوە، بە پێچەوانەی خەواریج و موعتەزیلەکان، کە خەواریج و موعتەزیلەکان نەک بە تاوانی گەورە، بەڵکوو بە موجەڕەد پاڵپشتی نەکردن و هاوڕا نەبوون لەگەڵیاندا تەکفیرت ئەکەن، بۆیە لە کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وایە کە کەسانی تاوانباری موسڵمانی یەکخواپەرست کافر نابێت، وە اللّٰه تعالی کەسانی تاوانباری خاوەن تاوانی گەورەی بە بەندە هەڵبژێردراوەکانی ناوبردووە، وەکوو لە [سوورەتی

فاطر]دا دەفەرموویّت: (ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا). واتە: لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بە کەسانیّ کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمان بژاردن. ٱللَّهُ تعالی باسی بەندەکانی ئەکات کە ئەهلی تەوحید و نویّژن و تاوانباریشن، کە لە ناویاندا (فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقُۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ)(٢٤٣). واتە: ئینجا هەندیّکیان ستەمکارن لەخودی خۆیان و هەندیّکیان مام ناوەندین و هەندیّکی تریان بە فەرمانی ٱللَّهُ پیّشکەوتوون بەهۆی چاکەکانیانەوە. ٱللَّهُ تعالی بەندەکانی کرد بە سیّ جۆرەوە، کە موسڵمانن و لەناو دائیرە و بازنەی ئیسلامدان، دەرنەچوون لیّی بە تاوانە گەورەکانیان.

وە ئەبینین ٱللَّهُ تعالی دەربارەی دوو گرووپی موسڵمان کە لە یەکتریان کوشتووە و شەڕەکەن بەیەکەوە، دەفەرموویّت: (وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا)(٢٤٤). واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئیماندارانی دژ بەیەکتر جەنگیان کرد ئەوە لە نیّوانیاندا ئاشتەوایی بکەن. (إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ)(٢٤٥). واتە: بیّگومان تەنها باوەڕداران بران، کەواتە لە نیّوان دوو براتاندا گەر ئاژاوە هەبوو ئاشتەوایی بکەن.

---

(٢٤٣) فاطر: ٣٢.
(٢٤٤) الحجرات: ٩.
(٢٤٥) الحجرات: ١٠.

وە ئەبینین اللَّهُ تعالی لە قورئاندا تاوانەکانی کردۆتە دوو جۆر، ئەوانیش:

١- تاوانی گەورە.

٢- تاوانی بچووک.

وەکوو دەفەرموویت: (إِن تَجْتَنِبُوا كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا)[٢٤٦]. واتە: ئەگەر دوور بکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی کە لێتان قەدەغە کراوە ئەوە تاوانە بچووکەکانتان بۆ دەپۆشین وە دەتانخەینە شوێنێکی چاک و ڕێزدارەوە.

بۆیە بێگومان ئەوە کۆدەنگی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە کە خاوەنی تاوانی گەورە بەهۆی تاوانی گەورەوە لە دین دەرناچێت و کافر نابێت و لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە، مادام ئەو کەبیرەیە کوفر و شیرکی گەورە نەبێت، یاخود هەڵوەشێنەرەوە و هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوە نەبێت، یاخود تەرکی نوێژ نەبێت بە کوللی، یاخود بەحەڵاڵی نەزانیبێت، بەپێچەوانەی خەواریجەکان و موعتەزیلەکان، کە ئەوان بەبێ (مُكَفِّر) تەکفیر ئەکەن، واتە: تەکفیر ئەکەن بەبێ ئەوەی شتێک کوفر بێت و مرۆڤ پێی کافر ببێت!

بۆیە ئەهلی کەبائیر لەژێر ویستی اللَّهُ تعالی دان، اللَّهُ تعالی بۆی هەیە بیانخاتە دۆزەخەوە تاکوو پاک ئەبنەوە و دواتر بیانخاتە بەهەشتەوە، یاخود ئەگونجێ ڕاستەوخۆ بیانخاتە بەهەشتەوە.

---

(٢٤٦) النساء: ٣١.

پاشان تاوان زەرەر ئەگەیەنێت بە ئیمان، بەپێچەوانەی مورجیئە کۆنەکان کە ئەیانوت: "لَا يَضُرُ مَعَ الإِيمَانِ ذَنْبٌ" واتە: لەگەڵ ئیمان تاوان زەرەری نییە. وە پێیان وابوو هەموو تاوانێک (مَغْفُور)ە و بوردراوە، مادام ئیمان بوونی هەیە، بەڵام لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وا نییە، بۆی هەیە تاوان هەبێت خاوەنەکەی سزا بدرێت، گەر ئەهلی کەبائیر بێت، بەوەی لە ئاگری دۆزەخدا ئەسوتێنرێن، بەڵام عاقیبەت و سەرەنجامیان بەهەشتە.

ئەمەش یەکێکی دیکە بوو لە کۆدەنگییەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، کە (وَلَا نُكَفِّرُ أَهْلَ الْقِبْلَةِ بِذُنُوبِهِمْ)، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ تەکفیری نوێژنەکەر (تَارِكُ الصَّلَاة)، کە مەعلوومە لای سەلەف کۆدەنگی هەبوو لەسەر کافرییتی، ئەهلی نوێژ ئەهلی قیبلەیە، بۆیە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکرێت، مادام نوێژنەکەرە تەکفیر ئەکرێت.

## وَنَكِلُ أَسْرَارَهُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.[(١)]

---

(١) وَنَكِلُ أَسْرَارَهُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. واته: نهێنی و حاڵیان ئەگێڕینەوە بۆ لای الله تعالی.

له ئیسلامدا حوکم به ڕووکەش ئەدرێت هەم بۆ ئیمان و هەم بۆ کوفریش، جا ئەوەی زاهیر و ئاشکرای دەرخست، ئەوە حوکم بەو ئاشکرایە ئەدرێت، ئەم قاعیدەیە بۆ کوفریشە، هەرکەس بە یەقین شیرک و کوفری گەورەی هەڵبژارد؛ ئەوە حوکمی کافر و موشریک ئەیگرێتەوە و هیچ عوزرێکی بۆ نییە، هەرکەسێکیش بە یەقین هەڵگری تەوحید و ئیسلام بوو، وە هیچ شیرک وکوفرێکی زاهیری لێ نەبینرا؛ ئەوە موسڵمانە و زاهیری حیساب ئەکرێ. جا بۆیە چۆن بەم شێوەیە حیسابی موسڵمانی بۆ ئەکرێت، بەهەمان شێوەش ئەگەر شیرک و کوفری گەورەی هەڵبژارد؛ ئەوە حیسابی موشریک و کافری بۆ ئەکرێت، بە پێچەوانەی موعتەزیلە و جەڕجیسییەکان، جەڕجیسییەکانی میراتگری موعتەزیلەکان، هەڵگری ئەو فیکرەن کە عوزر بە جەهل هەیە، ئەوەش مەنهەجێکی بەتاڵە، کە لە ئەسڵدا موعتەزیلەکان دایانهێنا و، پاشان جەڕجیسییەکان زیندوویان کردەوە، خەڵکانێکیش لەمڕۆدا هەڵگری فیکری داوودی کوڕی جەڕجیسن، کە ئیمانیان بە عوزر بە جەهل هەیە بۆ کەسانێک کە هەڵگری کوفر و شیرک و هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامن.

**(نَكِلُ أَسْرَارَهُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)**. مادام به ڕووكەش ئەهلی تەوحیده و بەریبووه له شیرک و موشریکان، ئەوه ناوەوه و نهێنییەکانی بۆ (اللَّهُ تعالی)یه، ئێمه له نهێنییەکان و ناو دڵەکان ناکۆڵینەوه، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: **"لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ قُلُوبَ النَّاسِ"**[٢٤٧]. واته: فەرمانم پێ نەکراوه که لەناو دڵی خەڵکی بکۆڵمەوه. واته ئەوەی تەوحیدی (اللَّهُ تعالی)ی هەبوو، وه هاوەڵی بۆ بڕیار نەدا؛ ئەوه زاهیر لای ئێمه موسڵمانه، گەر به حەقیقەتیش ئەهلی کوفر و شیرک نەبووبێ ئەوه حەقه لای اللَّهُ تعالی **"أَن لَا يُعَذِّبَ مَن لَا يُشرِك بِهِ شَيئًا"**. واته: سزای ئەو کەسه نەدات که هاوەڵی بۆ اللَّهُ تعالی بڕیار نەدابێت. وەک له فەرموودەکەی موعازدا هاتووه، که پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەی دا حەقی بەندەکان لای اللَّهُ تعالی ئەوەیه که سزای ئەو کەسانه نەدات که کوفر و شیرک ئەنجام نادەن، به جگه له کوفر و شیرک ئەگەڕێنەوه بۆ لای اللَّهُ تعالی.

---

(٢٤٧) سەحیحی بوخاری: ٤٣٥١.

٢١- وَنُقِيمُ فَرْضَ الْجِهَادِ وَالْحَجِّ مَعَ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، فِي كُلِّ دَهْرٍ وَ زَمَانٍ.[١]

٢٢- وَلَا نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى الْأَئِمَّةِ وَلَا الْقِتَالَ فِي الْفِتْنَةِ، وَنَسْمَعُ وَنُطِيعُ لِمَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمْرَنَا، وَلَا نَنْزِعُ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ.[٢]

---

(١) **وَنُقِيمُ فَرْضَ الْجِهَادِ وَالْحَجِّ مَعَ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ فِي كُلِّ دَهْرٍ وَزَمَانٍ.** واته: ڕاگری فەرزەی حەج و جیهاد ئەبین لەگەڵ پێشەوا و گەورەی موسڵمانان لە هەموو ڕۆژگار و سەردەمێکدا.

(٢) **وَلَا نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى الْأَئِمَّةِ وَلَا الْقِتَالَ فِي الْفِتْنَةِ، وَنَسْمَعُ وَنُطِيعُ لِمَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمْرَنَا، وَلَا نَنْزِعُ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ.** واتە: وە ڕاپەڕین دژی پێشەواكان ناكەین، چەک هەڵناگرین لە ڕۆژگاری شەڕ و ئاژاوەدا، گوێبیست و گوێڕایەڵ ئەبین بۆ ئەوانەی الله تعالی كردوونی بە پێشەوا و كاربەدەستمان، وە كێبڕكێی دەسەڵات لەگەڵ ئەوانەدا ناكەین كە خەلیفەی موسڵمانانن.

ئەمە عەقیدە و بنەمای ئەهلی سوننەت و جەماعەتە كاتێک كاربەدەستان موسڵمانبن، با تاوانباریش بن، بەڵام دەسەڵاتدار گەر كافر بێت هیچ ویلایەتێكی نییە بەسەر موسڵمانانەوە، وەكوو ئیمامی ئەحمەد ئەڵێ: "پێویستە لێیان دووركەونەوە و هیچ شەعائیرێک لەگەڵیاندا جێبەجێ نەكەن". وەكوو

تەواوی ئەوانەی ئەمڕۆ لە نەبوونی خەلافەتی ئیسلامدا هەن، کە هیچیان بە وەلی ئەمری موسڵمانان حیساب ناکرێن.

بە وەلی ئەمر نەزانینی هەڵگرانی جگە لە ئیسلام بابەتێکە، خرِوج و شۆڕش دژیان شتێکی ترە، پێویستە ئەو دوانە لێکجیابکەینەوە!

لابردن و شۆڕش دژیان ڕاوەستاوە بە توانای موسڵمانان و بەرژەوەندییان، تاکوو بە کەمترین زەرەر لاببردرێن، گەر نا سەبر گرتن و ئارامگرتن مەنهەجی ئەهلی سونتەیە، وەکو پرسیارکرا لە ئیمامی مالیک: "گەر کەسێک شۆڕشی دژی دەسەڵاتدارەکانمان کرد، ئایا ئێمە بەرگرییان لێبکەین، ئیمامی مالیک وتی: گەر عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو بەرگری لێئەکەین، گەر ئەو نەبوو ئەوە بەرگری لێ ناکەین، پەروەردگار ئەیەوێت تۆڵەی ستەمکارێک بە ستەمکارێکی دیکە بکاتەوە". ئەمانە موسڵمانی ستەمکار بوون ئەوها بەرگریان لێ ناکرێ، چجای موسڵمان نەبن و بەرنامەی ئیسلامیان قەبووڵ نەکردبێت!

لەسەردەمی غوربەتی ئیسلامدا، لە سەردەمێک کە حوکم و شکۆی ئیسلام نەماوە، پێویستە لەم بابەتە تێبگەین، لەم سەردەمەدا دوو تاقم هەیە، ئەوانیش:

١- کەسانێک کە باوەڕیان بەم بابەتە نییە، لەکاتێکدا ئەمە کۆدەنگی تەواوی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە و عەقیدەمانە، کاتێک خەلیفەی موسڵمانان بوونی هەبێ و پێشەوای موسڵمانان حوکم بە ئیسلامەکەی ﷲ تعالی بکات، لەم کاتەدا بێگومان (نُقِيمُ فَرْضَ الْجِهَادِ وَالْحَجِّ مَعَ أَئِمَّةٍ)، با ستەمکاریش بن، وە (وَلَا نَرَى الْخُرُوجَ)، واتە: وە دەرناچین لەسەر

دەسەڵاتداران. قیتال و شەڕ لە ڕۆژی فیتنەدا دروست نییە، گوێڕایەڵ و گوێبیست ئەبین لە چاکەدا بۆ ئەوانەی ئەبن بە دەسەڵاتدارمان مادام کار بە حوکمی ﷲ تعالی ئەکەن، وە کێبڕکێی دەسەڵات لەگەڵیاندا ناکرێت، چونکە حوکمی ئیسلام جێبەجێ ئەکەن، با تاوانباریش بن، ئەمە مەنهەج و عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، بەپێچەوانەی خەواریجەکان، کە بچووکترین تاوان و ستەم ببینن وا ئەزانن ئیتر گوێڕایەڵی نامێنێت.

٢- کەسانێکی دیکە کە ئەم عەقیدە جوانەی سەلەف ئەخەنە خزمەت کەسانێک و دەسەڵاتدارانێک کە ئەسڵەن ئەهلی ئیسلام نین و باکیان پێی نییە و حوکمی ﷲ تعالی جێبەجێ ناکەن، ئەو دەق و کۆدەنگییانە ئەخەینە سەرچاومان، بەڵام ئەبێت سەیری واقیع بکرێت، بۆیە وەلی ئەمر کاتێک لە چاکەدا گوێڕایەڵییان ئەکرێت، کە کار بە شەریعەتی ﷲ تعالی بکەن، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "تا کاتێک کە نوێژتان لەگەڵ بکەن، تا کاتێک پەرتووکی ﷲ تعالی جێبەجێ بکەن". ئەمە بێگومان لەم کاتەدا گوێڕایەڵییان ئەکرێت لە چاکەدا، بەڵام گەر هاتوو فەرمانمان پێبکەن بە خراپە، ئەوە گوێڕایەڵییان ناکرێت، لە خراپەدا گوێڕایەڵی خەلیفەی موسڵمانان ناکرێت، چجای ئەوەی خەلیفەی موسڵمانان نەبێت.

بێگومان ئەوانەی حوکمی ئیسلام جێبەجێ ناکەن؛ خەلیفە و گەورەی موسڵمانان نین، بەڵام دەرچوون لەسەریان ڕاوەستاوە بە توانای موسڵمانانەوە،

وەکوو چۆن لەسەردەمی ئیمامی ئەحمەددا هەندێ لە دەسەڵاتدارەکان بوونە هەڵگری کوفر و فیکری جەهمییەت، بەڵام ئیمامی ئەحمەد فەرمانیکرد بە ئارامگرتن، ئارامگرتن لەبەر ئەوەنا کە موسڵمانن، بەڵکوو ئارامگرتن لەسەر ئەوەی پێی وابوو بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدا نییە، ڕەنگە ئەو موسڵمانانە بکوژرێن، چونکە لەوکاتەدا بەئاسانی ئەو سەرۆکە کافرە نەئەهاتە خوارەوە و بەوان لا نەئەچوو.

بە حەقیقەتیش لەمڕۆدا تەنها کێشە ئەو سەرۆک و دەسەڵاتدارانە نییە، بەڵکوو هەڵگەڕانەوەی خەڵکێکی زۆرە لەو دینە و لە تەوحیدەکەی ﷲ تعالی و، پشتکردنیانە لە ئیسلام و لە تەوحید و، ڕووکردنیانە لە ڕێبازە کوفرییەکان، وە شوێنکەوتنیانە بۆ شیرک، عاممەی خەڵک کە هەڵگری کوفر و شیرک بن، لابردنی دەسەڵاتداری بێ دین تەنها گۆڕینی دەموچاو ئەبێت، چونکە ئەو خەڵکە گەر ئەوە حاڵیان بێت، ڕازی نابن بە حوکم و دەسەڵاتی ئیسلام، یان دەسەڵاتداری دەسەڵاتدارێکی موسڵمان کە حوکمی ﷲ تعالی جێبەجێ بکات لەناویاندا!

پاشان لای سەلەف غەیبەتکردنی دەسەڵاتداری ستەمکار دروست و جائیز بووە، گەر موسڵمانیش بووبێ، بەیهەقی لە [شعب الإيمان: ٦٤٧٤] و، هەرەوی لە [ذم الكلام : ٧٠٠] و، (إبن أبي الدنيا) لە [الصمت] و جگە لەوانیش، تەنانەت (حرب الكرماني) لە [مسائل]ەکەیدا لە سەلەفەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویانە: "**لَيسَت لَهُم غِيبَة: الإِمَامُ الجَائِر، وَالفَاسِقُ المُعلِنُ بِفِسقِهِ،**

**وَالمبتَدِعُ الَّذِي يَدعُ النَّاسَ إِلَى بِدعَتِهِ"**. واته: سێ گرووپ غەیبەتکردنیان تاوان نییە: دەسەڵاتدارێکی ستەمکار، فاسیقێک کە ئەهلی کەبائیر بێت و بەئاشکرا تاوانی گەورە بکات، موبتەدیعێکی لاڕێبوو لە مەنهەجی سەلەف و بانگەشەی خەڵک بکات بۆ ڕێگەکەی خۆی. ئەمانە غەیبەتیان نییە، واتە گەر غەیبەتیشیان بکرێت هیچ تاوان و کێشەیەکی تێدا نییە، بە پێچەوانەی عەقیدەی مورجیئەکانەوە، نەک غەیبەتی دەسەڵاتدارێکی ستەمکاری تاوانبار بەڵکوو غەیبەتی دەسەڵاتدارێکی جگە لە موسڵمانیش بە نادروست و ناجائیز ئەزانن، وە بە مەنهەجی خەواریجی ئەزانن، کە بێگومان ئەوە تێنەگەیشتنە لە مەنهەجی سەلەف و نەگەڕانەوەیە بۆلای ئەوان، ئەبینین سەلەفی ساڵح غەیبەتکردنی دەسەڵاتدارێکی ستەمکاری موسڵمانیان بە دروست زانیوە، چجای ئەوەی دەسەڵاتدارەکە هەڵگری جگە لە بەرنامەی ئیسلام بێت.

ئەمانە کۆمەڵێک کۆدەنگی و بنەمان کە پێویستە وەکوو خۆیان لێیان تێبگەین، **(اللَّهُمَّ أَرنَا الحَقَّ حَقًّا وَارزُقنَا اتبَاعَه، وَأَرنَا البَاطِلَ بَاطِلًا وَارزُقنَا اجتِنَابَه، اللَّهُمَّ آمِين)**.

## ٢٣- وَنَتَّبِعُ السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ، وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلَافَ وَالْفُرْقَةَ.[١]

---

(١) **وَنَتَّبِعُ السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ، وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلَافَ وَالْفُرْقَةَ.** واته: شوێن سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان ئەکەوین، وە دوورەکەوینەوە لە ڕاجیاوازی و تەفرەقە و شتی شاز.

پێویستە شوێن دینداری ئەووەڵینی ئوممەت بکەوین، ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتیین لە سەلەفی ساڵح، لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان، لە گەورە زانایانی وەکوو: ئەوزاعی و لەیس و مالیک و ئەحمەد و شافیعی و ئیسحاق و.. وێنەی ئەوانە، پێوستە شوێن ڕێبازیان بکەوین و ئیستیدلال و ئیحتیجاج بە ئاساریانەوە بکەین، موخالیف و موفاریقیش ئەوەیە وازی لە ڕێباز و ئاساریان هێناوە و، دەستیگرتووە بە مەنهەج و ڕێباز و پەرتووکی خەلەف و جگە لەوان، بۆیە هەر کەس لابدات لە سەلەف و نەگەڕێتەوە بۆ دینداریێتی ئەوان؛ ئەوە بەرەو لادان و گومڕابوون ئەڕوات، حەقیقەتی دینداری بە تەنها بە خۆدانەپاڵ نایەتەدی، لەکاتێکدا شوێنکەوتەی خەلەف و جگە لە سەلەف بین.

کە ئەڵێ: **(نَتَّبِعُ السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ)** بێگومان لە ئایەتی (الله تعالی)وە وەرگیراوە کە دەفەرمووێت: (وَأَطِيعُوا ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَـٰزَعُوا فَتَفْشَلُوا

وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ)[٢٤٨]. واته: باوەڕداران گوێڕایەڵی ﷲ و پێغەمبەرەکەی بن ﷺ وە جیاواز مەبن و دووبەرەکی مەکەن بە هۆیەوە بشکێن و لاواز ببن و هێزتان بڕوا و نەمێنێ.

مەبەست بە سوننەت ڕێباز و هەدیی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە وتە و کردار و دانپێدانانی، بێگومان گەورەترین شت بریتییە لەوەی مرۆڤی موسڵمان لەدینداریتیدا شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت، وە سوننەتیش ﷲ تعالى لە قورئاندا بە حیکمەت ناوی هێناوە، کاتێک ﷲ تعالى دەفەرمووێت: (وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ)[٢٤٩]. واتە: وە بیر بکەنەوە لەوەی دەخوێنرێت لە ماڵەکانتاندا لە ئایەتەکانی ﷲ و دانایی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ. ئیمامی حەسەن و قەتادە و ئیبنو جورەیج تەفسیری حیکمەتیان کردووە بە سوننەت و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وە دوعاکەی ئیبراهیمیش کە ئەیکات و دەفەرمووێت: (رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ)[٢٥٠]. واتە: پەروەردگار لە ناو نەوەکانماندا پێغەمبەرێک لەخۆیان بنێرە، ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە، قورئان و داناییان فێربکات و پاکیان بکاتەوە لە هەموو گوناهێک.

---

[٢٤٨] الأنفال: ٤٦.

[٢٤٩] الأحزاب: ٣٤.

[٢٥٠] البقرة: ١٢٩.

بێگومان سوننەتیش ئەو فەرموانەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دینی پێ ڕۆشنکراوەتەوە، بۆیە شوێنکەوتنی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەسڵە لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا.

پاشان جەماعەتیش کە ئەڵێ: **(وَالْجَمَاعَةَ)**، بریتییە لە **(الإجتِمَاع عَلَى تَوحِيدِ الله)**، واتە: کۆبوونەوە لەسەر تەوحیدی اللّٰه تعالی، اللّٰه تعالی دەفەرموێت: (وَٱعْتَصِمُوا بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا)[٢٥١]. واتە: هەمووتان دەست بگرن بەهۆی پەیوەستیتان بە (اللّٰه تعالی)ەوە کە قورئانە، وە چەند بەرە و لێکجیا مەبن.

بۆ ئیجتیماعیش (ئیجتیماعی مەحموود)مان هەیە، کە بریتییە لە کۆکبوون لەسەر تەوحید و سوننەتی پێغەمبەری خوا بوونﷺ، وە (ئیجتیماعی زەمکراو)یشمان هەیە کە خەڵکێک کۆببنەوە لەسەر بەتاڵ.

وە ئەسڵ لە خیلاف لە ئوممەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ مەزموومە و نەهی لێکراوە، وە ئەسڵ لە ئیجتیماعدا ڕەحمەت و نیعمەتە، وە لە ئیختیلافیشدا عەزاب و نیقمەتە، بەڵگەش وتەی (اللّٰه تعالی)یە کە دەفەرموێت: (وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ)[٢٥٢]. واتە: گەر پەروەردگارت بیویستایە گشت خەڵکی دەکرد بە (پەیڕەوی) یەك ئایین، بەڵام ئەوان بەردەوام جیاواز دەبن ﴿١١٨﴾ مەگەر کەسێ پەروەردگارت میهرەبانی لەگەڵدا کردبێت و ڕەحمی پێکردبێت.

---

(٢٥١) آل عمران: ١٠٣.

(٢٥٢) هود: ١١٨ و ١١٩.

وە بێگومان ﷲ تعالی مەدحی ئەوانەی کردووە کە لەسەر یەک ڕێچکە و ڕێبازن، هەروەکو دەفەرمووێ: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ)[٢٥٣]. واتە: سوێند بە ﷲ ناردمان بۆ گەلی سەموود برایان سالّح پێغەمبەر ﷺ کە پێی وتن: ﷲ بپەرستن، کەچی ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی دژ بەیەك.

بەڵام کاتێک حەق دێتە ناوەوە، ئەوکات تەفرەقە ڕووئەدات لەنێوان ئەهلی حەق و بەتاڵدا، بۆیە تەفرەقەیەک کە لەسەر حەق و بەتاڵ بێت، ئەو تەفرەقەیە مەحموودە، بەڵام تەفڕەقەیەک لەسەر ئەساس و بنەمای تەوحید و ئیسلام نەبێت، ئەو تەفرەقەیە مەزموومە.

وە پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان خیلاف و تەفرەقە لە بنەما و ئوسووڵی دین لەگەڵ خیلاف لە فڕوعدا، وە خیلافیش لە فڕوعدا نابێت بگاتە ئاستێک موسڵمانان یەکڕیزییان تێکبدەن، ئەبینین لە سەردەمی سەلەفدا خیلاف هەبووە لە بابەتە فڕوعیی و ئیجتیهادییەکاندا، بەڵام لە بابەتە ئەسڵییەکاندا ئەسڵ وایە موسڵمانان یەکڕیز و یەک پارچەبن، وە ﷲ تعالی حەزەر و هۆشداری داوە دەربارەی تەفرەقە و فرە فیکری، وە پێغەمبەری خواش ﷺ بەهەمان شێوە.

(٢٥٣) النمل: ٤٥.

## وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلَافَ وَالْفُرْقَةَ.(١)

(١) وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلَافَ وَالْفُرْقَةَ. واتە: ڕێگرییمان لێکراوە لە شازێتی و خیلاف و تەفرەقە و دووردەکەوینەوە لێی.

تەبعەن بەهۆی ئەمانەوەیە کە خرِوج ئەکرێت لە جەماعەت و یەکڕیزی موسڵمانان، لە ئەسڵدا پێویستە موسڵمانان یەکڕیز و یەک پارچەبن، بەڵام گەر هاتوو موسڵمان نەیتوانی ببێت بە کەسێکی ساڵح لەکاتی فەساددا و ترسا خۆشی تووشی ببێت، ئەوە ئیعتیزال (دوورەپەرێزی)یەکەی ئەبێتە ئیعتیزالێکی مەحموود، لە فەرموودەی سەحیحی (أبو سعيد الخدري)ەوە ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "**يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ، وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ**"[٢٥٤]. مەبەست بەم فەرموودەیە بریتییە لە: خەریکە وای لێدێ باشترین ماڵی کەسێک بریتی بێ لە مەڕوماڵاتێک و بدات لەو شیو و دۆڵە، بەهۆی ئەوەی دینەکەی تووشی فتنە نەبێت لەناو خەڵکی. ئەمە بۆ کەسێکە کە بێتوانا بێت لە ئیسڵاحی خەڵکی، بەڵام کەسێک کە توانای هەبێت بێگومان ئەسڵ وایە ئارامگربێت بە سەلاح و ئیسڵاح، وە دووركەوێتەوە لە شازێتی و ئیعتیزال لە کۆمەڵی موسڵمانان.

(٢٥٤) سەحیحی بوخاری: ١٩.

بۆیە پێویستە ئاگامان لە بنەماکان بێت لە بابەتی پشتهەڵکردن و دوورکەوتنەوەدا، بەتایبەت لەکاتی فیتنەدا.

پاشان مرۆڤی موسڵمان لەکاتی فیتنەدا، ئایا ئەوەندە عیلم و عەقڵی بە فیتنەکە هەیە کە دابەزیوەتە ناو موسڵمانان؟ توانای ئەوەندەی هەیە کە چاکسازی بکات لە کاروباری خەڵکیدا، لەم کاتەدا پێویستە ئەو کەسە (خوڵتە)ی هەبێت، واتە تێکەڵی خەڵکی بکات و چاکسازی بکات لە نێوانیان، بەڵام گەر توانای چاکسازی نەبوو لە نێوان خەڵکیدا، لەم کاتەدا بێگومان دوورکەوتنەوە لە فیتنە ئەولاترە، دوورکەوتنەوەکە بە هۆکاری بەهێز نەبوونی عەقڵ و کەم عیلمی و توندی فیتنەکەیە لە نێوان خەڵکی، ئا لەم کاتەدایە دوورکەوتنەوە لە خەڵکی دێتە بوون.

کەواتە ئەسڵ وایە هەموو موسڵمانان کۆک و برابن لە نێوان یەکدا، وە یەک ڕیز و یەک دەست و پارچەبن لەسەر قورئان و سوننەت و تەوحید.

٢٤- وَأَنَّ الْجِهَادَ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، مَعَ أُولِي الْأَمْرِ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ؛ لَا يُبْطِلُهُ شَيْءٌ.[1]

٢٥- وَالْحَجُّ كَذَلِكَ.[2]

٢٦- وَدَفْعُ الصَّدَقَاتِ مِنَ السَّوَائِمِ إِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ.[3]

---

(١) **وَأَنَّ الْجِهَادَ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ مَعَ أُولِي الْأَمْرِ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ لَا يُبْطِلُهُ شَيْءٌ.**
واتە: جیهاد و تێکۆشان بەردەوامە لەوکاتەوەی ﷲ تعالی پێغەمبەرەکەی ﷺ ناردووە، واتە لەوکاتەوەی کە لەسەری واجیب کراوە، تاکوو هەستانی قیامەت لەگەڵ دەسەڵاتدار و کاربەدەستانی موسڵمانان، وە هیچ شتێک لە زوڵم و ستەمی ئەوان جیهادکردن لە دوایانەوە بەتاڵ ناکاتەوە.

(٢) **وَالْحَجُّ كَذَلِكَ.** واتە: وە حەجیش بەهەمان شێوە.

(٣) **وَدَفْعُ الصَّدَقَاتِ مِنَ السَّوَائِمِ إِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ.**
واتە: وە دەرکردنی زەکاتی مەڕومالات و دەغڵودان و پێدانیان بە دەسەڵاتدار و کاربەدەستانی موسڵمانان.

بێگومان یەکدەنگی سەلەف و ئەهەلی سوننەت و جەماعەت لەسەر بەردەوام بوونی جیهادە، کە زاهیری قورئانیش وا دەفەرموویێت، وەکوو ﷲ تعالی ئەفەرموویێت: (وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ)[٢٥٥]. واتە: جەنگیان لەگەڵ بکەن تا دوژمنایەتی ئاین نەمێنێ. کە فیتنە مەبەست پێی شیرک و کوفرە. (الجِهَادُ مَاضٍ مَا وُجِدَ الكُفرُ والإسلَام). واتە: جیهاد بەردەوامە تا کوفر و ئیسلام بوونی هەبێت.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ، حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ..." الحَدِيثَ[٢٥٦]. واتە: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا تاکوو شایەتومان ئەهێنن بەوەی کە هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە ﷲ تعالی کە بەحەق شایستەی پەرستنە، وە تاکوو شایەتی ئەدەن بەوەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە نوێژ ئەکەن و، زەکات ئەدەن..

وە لە سەحیحیشدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: "لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ"[٢٥٧]. واتە: بەردەوام گرووپێک لە ئوممەتەکەم کوشتار ئەکەن و لەسەر حەقن تا کۆتایی قیامەت.

---

(٢٥٥) البقرة: ١٩٣.

(٢٥٦) سەحیحی بوخاری: ٢٥.

(٢٥٧) سەحیحی موسلیم: ١٥٦.

تەبعەن ئەم بابەتە کە کۆدەنگی موسڵمانانی لەسەرە، مەبەست پێی جیهادی شەرعییە تا ڕۆژی قیامەت، بە پێچەوانەی کۆمەڵێک گرووپ و فیرقەوە کە پێیان وایە ئیتر بوونی نەماوە، بەتایبەت ڕافیزەکان، کە پێیان وایە هەڵگیراوە تاکوو ئەو ئیمامەیان کە پێی دەڵێن ئیمامی غائیب، کە (موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری)یە، دەڵێن: تا ئەو نەیەتەوە، ئەوە هەر هەڵگیراوە ئەبێت لەسەر ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وە هەروەها ڕەددە بۆ خەواریج و موعتەزیلەکانیش، کە دەڵێن گەر کاربەدەست زوڵم یان ستەمێکی لێوەشایەوە یان کاربەدەستێک نەبوو وەکو پێشەوا ئەبو بەکر و عومەڕ؛ ئەوە بێگومان جیهادی لە پشتەوە ناکرێت، ئەمەش پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، کە کاربەدەستێک موسڵمان بێت و حوکم بە شەریعەتی ئیسلام بکات، هەرچەندە زوڵم و ستەمیشی هەبێت، بێگومان جیهادی لە پشتەوە ئەکرێت، وە لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا ویلایەتی موسڵمانی جائیر حەققە، بە پێچەوانەی مەنهەجی خەواریجەکانەوە کە ویلایەت لە موسڵمانی جائیر ئەستێننەوە و پێیان وایە نە وەلی ئەمرە و نە جیهادیشی لەپشتەوە ئەکرێت.

## ئەو گرووپانەی پێچەوانەی ئەم کۆدەنگییەن:

جا ئەو گرووپانەی پێچەوانەی ئەم کۆدەنگییەن بریتیین لە:

١- ڕافیزەکان، کە پێیان وایە جیهاد نەماوە تاکوو ئیمامی غائب دەرەکەوێ.

٢- خەواریجەکان.

٣- لیبڕاڵییەکان، ئەوانەن فیکرێکی ماددی زاڵە بەسەریاندا، کە عەقیدە و بیرباوەڕیان تەواو پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە، تەنها لەگەڵ بەرژەوەندی دونیادان، وە پێچەوانەی دین هەنگاو ئەنێن، ئەمانە خراپترن لە ڕافیزە و خەواریجەکان و، باوەڕیان هەر بە ئیسلام نییە، بۆیە پێچەوانەی ئەم جیهادە وەستاونەتەوە.

وە نەک تەنها لیبڕاڵییەکان، بەڵکوو تەواوی گرووپەکانی تر کە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامن بە تەواوی و توندی و شەڕ هاتوون فیکرەکەیان سەپاندووە بەسەر خەڵکیدا، بەڵام جیهادی ئیسلامی بە تیرۆرست و خراپ ناوزەند ئەکەن.

## الْجِهَادَ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ.

(١) **الْجِهَادَ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ.** مەبەست لەم بڕگەیە سەردەمی ناردنی پێغەمبەری خوا نییە ﷺ، بەڵکوو ئەو کاتەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەبوو، ئەو کاتەی کە لە مەککە بوو جیهادەکەیان جیهادی دەعوە و بانگەوازی بوو کە دەفەرمووێت: (جِهَادًا كَبِيرًا)[٢٥٨]. بۆیە لەو کاتەدا جیهاد ئەبێت بە جیهادی قەڵەم و زوبان، تاکوو ﷲ تعالی لەسەر مەنهەجی پێغەمبەری خوا ﷺ خەلافەت و ئیمامەت ئەگێڕێتەوە.

پاشان ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە پشت خەلیفە و دەسەڵاتدارانێکەوە جیهاد ئەکەن کە لەسەر مەنهەجی حەقبن، لەسەر ئەو مەنهەجە بن کە ئەهلی سوننەی لەسەر بووە، ئەوەتا ئەبینین ئیمام عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەڵێ: "**لَا تَغزُو مَعَ القَدَرِيَّة؛ فَإِنَّهُم لَا يُنصَرُون**". واتە: لەگەڵ قەدەرییەکان و لەپشتیانەوە جیهاد مەکەن؛ چونکە ئەوان سەرناخرێن.

وەهەروەها دەرکردنی زەکاتی مەڕوماڵات و خۆراک و دانی بە کاربەدەستی موسڵمانان، ئەمە کرداری هاوەڵان و سەلەفیساڵح بووە، ئیتر ئەوان وەکیل بوون چۆن دابەشی ئەکەن، بەڵام لەم سەردەمەدا کە سەرۆکەکان لەسەر ئیسلام نین و زەکات کۆناکەنەوە و باوەڕیان بەو بابەتانە نییە، ئەوە پێیان نادرێت،

---

(٢٥٨) الفرقان: ٥٢.

بەڵکوو خاوەن زەکاتەکان کێ بەشایستە بزانن ئەیدەن بەو، بەڵام زەکاتی ئاڵتوون لەسەردەمی سەلەفیشدا خەڵکەکە خۆیان کێیان بە شایستە بزانیایە پێیان ئەدا، کەواتە دوو جۆر ماڵمان هەیە بۆ زەکات:

١- ماڵێک کە (ظاهر)ە، وەکو مەڕوماڵات و کشتوکاڵ، ئەمانە زەکات کۆکەرەوەی کاربەدەستانی موسڵمانان وەری ئەگرن، ئینجا حکوومەت دابەشی ئەکات بەسەر ئەوانەی پێویستیانە.

٢- ماڵێک کە (باطن)ە، وەکو پارە و ئاڵتوون، ئەوە ئەسڵ وایە خەڵک خۆی دابەشی بکات بەسەر ئەوانەی پێویستیانە.

ئەمەش باس و بابەتێکی تر بوو کە کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لەسەرە.

## ٢٧- وَالنَّاسُ مُؤَمَّنُونَ فِي أَحْكَامِهِمْ وَمَوَارِيثِهِمْ، وَلَا نَدْرِي مَا هُمْ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.[١]

---

(١) **وَالنَّاسُ مُؤَمَّنُونَ فِي أَحْكَامِهِمْ وَمَوَارِيثِهِمْ، وَلَا نَدْرِي مَا هُمْ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.** واته: خەڵکی حیسابی ئەهلی ئیمان و ئیسلامیان بۆ ئەکرێت لە حوکمەکان و میراتیاندا، ئێمە نازانین لەلای اللَّهُ تعالى چین و ناخیان چییە.

واتە: لە وڵاتی موسڵماناندا ئەوانەی بە ڕووکەش ئیسلامیان دەرخستووە، ئێمە بە موسڵمانیان ئەزانین، لە تەواوی حوکمەکانیان، هەر لە نوێژکردن لەسەریان و، میرات پێدان و لێوەرگرتن و، خواردنی سەربڕاویان و، لە عەقد و مامەڵە و هەموو شتێکدا، لە نهێنی و سڕیان ناکۆڵینەوە، ئەمە گەر وڵاتی موسڵمانان (دَارُ الإِسلَام)بوو، بەڵام گەر بەپێچەوانەوە بوو وڵات بوو بە وڵاتی ڕیددە و هەڵگەڕانەوە و بڵاوبوونەوەی کوفر و شیرکی گەورە و کوفرەکان زاڵ بوون و موسڵمان و کافر تێکەڵ ببوون، ئەوە بێگومان لەم کاتەدا بێ لێکۆڵینەوە حوکم بە زاهیر نادرێت، (فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا) مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

**(وَالنَّاسُ مُؤَمَّنُونَ فِي أَحْكَامِهِمْ وَمَوَارِيثِهِمْ، وَلَا نَدْرِي مَا هُمْ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).** ئەمە ئەسڵ وایە نهێنییەکانی خەڵکی بدەینەوە پاڵ اللَّهُ تعالى، ئەوەی بە

ڕووکەش ئیسلامی بۆمان دەرخست و، شیرک و کوفری ئاشکرامان لێ نەبینی؛ ئەوە بێگومان حیسابی موسڵمانی بۆ ئەکەین، مادام ئیسلامی دەرخستووە.

حوکمیش لە دونیادا بە ئاشکرایە و بەوەیە کە ئەیبینین، ناخ و ناوەوەی بۆ (الله تعالى)یە، کە ئایا حەقیقەتە یان چۆنە و چییە.

وە هەر لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتییە لەوەی کە ناوەوەی خەڵکی بشارێتەوە و قسەی لەسەر نەکات، چونکە ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەرە کە ئایا ئەو کەسە لە ڕووکەشدا چۆنە، نەک ئەوەی بچین لە نهێنییەکانی بکۆڵینەوە و ئاشکرای بکەین.

أ - فَمَنْ قَالَ: (إِنَّهُ مُؤْمِنٌ حَقًّا)؛ فَهُوَ مُبْتَدِعٌ.[١]

ب- وَمَنْ قَالَ: (هُوَ مُؤْمِنٌ عِنْدَ اللَّهِ)؛ فَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ.[٢]

ت- وَمَنْ قَالَ: (هُوَ مُؤْمِنٌ بِاللَّهِ حَقًّا)؛ فَهُوَ مُصِيبٌ.[٣]

---

(١) فَمَنْ قَالَ: (إِنَّهُ مُؤْمِنٌ حَقًّا)؛ فَهُوَ مُبْتَدِعٌ. واته: هەرکەسێک بڵێ: (ئەو ئیمانداره بە حەقیقەت)، ئاوها تەرکی ئیستیسناء بکات و إن شاء اللَّهُ نەکات؛ ئەوه موبتەدیعه.

(٢) وَمَنْ قَالَ: (هُوَ مُؤْمِنٌ عِنْدَ اللَّهِ)؛ فَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ. واته: وه هەرکەس بڵێ: (ئەو ئیمانداره لای اللَّهُ تعالی)؛ ئەوه لە درۆزنترینەکانە.

(٣) وَمَنْ قَالَ: (هُوَ مُؤْمِنٌ بِاللَّهِ حَقًّا)؛ فَهُوَ مُصِيبٌ. واته: وه هەرکەسێک بڵێ: (من باوەڕدام بە اللَّهُ تعالی؛ ئەوه پێکاوێتی.

باس و بابەتێکی دیکە لە باس و بابەتەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتییە لەوەی کەسێک وتی باوەڕدارم ئەوه پێویستە ئیستیسناء بکات و إن شاء اللَّهُ بکات، وه وتنی: (من ئیماندارم) بە موتڵەقی و بێ وتنی: (إن شاء اللَّهُ)، ئەوه عەقیدەی مورجیئەکانە کە بۆخۆیان و خەڵکیش هەر ئەوه بەکاردێنن، بە پێچەوانەوه ئەسڵ وایە ئیستیسناء بکرێت لە ئیمانی موتڵەقدا کە ئیمانەکە موقەییەد نەکرابێت بە شتێکەوه، بەڵام کە موقەییەد کرا بە شتێکەوه ئەوه

ئيتيسنائى ناوێ، يان له وتنى ئيسلامەتيدا (إن شاء اللّٰه)ى ناوێ، بۆ نموونه ناوترێ: (من ئيماندارم به اللّٰه تعالى، إن شاء اللّٰه)، يان: (ئيماندارم به فريشتەكان و قيامەت، إن شاء اللّٰه)، كەواته گەر موقەييەد بوو (إن شاء اللّٰه)ى تێدا ناكرێ، وه ناوترێت: (موسڵمانم إن شاء اللّٰه)، يان: (موەحيدم إن شاء اللّٰه)، تەنها له ئيمانى موتڵەقدا إن شاء اللّٰه ئەكرێت؛ چونكه هەم تەزكيەيه بۆ نەفس و هەم تەحقيقيشه، بۆيه ئەسڵ وايه ئەهلى سوننەت و جەماعەت لەكاتى بەكارهێنانى ئيمان بۆخۆيان و خەڵكيش بڵێن: (إن شاء اللّٰه ئيماندارم)، يان: (إن شاء اللّٰه ئيمانداره)، ئەمه وەكوو ئيمانى ڕەها، بەڵام بۆ ئيمانى موقەييەد ئەوه ئەسڵ وايه بەكارنەهێنرێت.

بۆيه:

أ- ئەوەى وتى: (ئەو ئيمانداره به حەقيقەت)؛ ئەوه موبتەديعه.

ب- ئەوەى وتى: (ئەو ئيمانداره لاى اللّٰه)؛ ئەوه درۆزنه، چونكه چوزانيت لاى ئەو چييه و چۆنه.

ت- ئەوەى وتى: (باوەڕم هێناوه به اللّٰه تعالى)؛ ئەوه پێكاوێتى.

لێرەدا (مُؤْمِنٌ بِاللَّهِ) موقەييەده.

ئەم كۆدەنگييه له لايەن سەلەفى سالحەوەيه، وه پێيان نادروست بووه كه مرۆڤ وەسفى ئيمانداريیەكەى خۆى بكات بەبێ ئيستيسناء، چونكه ئەمه بانگەشەى كەماڵ و تەواوى ئيمانه.

ئەمەش وەکو باسکرا بۆ ئەیەوە مرۆڤ تەزکییەی حەقیقەتی خۆی نەکات و بانگەشەی ئەوە نەکات کە ئیمانەکەی تەواوە، وەهەروەها وتنی: **(إِنِّي مُؤمِنٌ بِاللَّهِ إِن شَاءَ الله)**، واتە: من باوەڕدارم بە الله تعالى إن شاء الله، دروست نییە، چونکە ئەچێتە بابی شەک و گومانەوە.

## ٢٨- وَالْمُرْجِئَةُ: مُبْتَدِعَةُ ضُلَّالٌ.[١]

---

(١) **وَالْمُرْجِئَةُ: مُبْتَدِعَةُ ضُلَّالٌ.** واتە: وە مورجیئەکان: بیدعەچی و گومڕان.

لە یەکێک لە نوسخەکاندا دەڵێن: **(وَالْمُرْجِئَةُ وَالْمُبْتَدِعَةُ: ضُلَّالٌ).**

تەبعەن دوای ئەوەی باسی ئوسووڵ و بنەمای بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کرا، ئەیەوێت تەحزیر و هۆشداری بدات لە کۆمەڵێک گرووپی گومڕا، کە لەم بنەمایانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لایانداوە، سەرانی گرووپە گومڕاکانیش بریتیین لە چوار گرووپ، ئەوانیش:

١- مورجیئەکان.

٢- قەدەرییەکان.

٣- ڕافیزەکان.

٤- خەواریجەکان.

دوو ڕازییەکە دەربارەی مورجیئە دەڵێن: مورجیئە: بیدعەچی گومڕان.

تەبعەن ئەمە حوکمی سەلەفە بۆ مورجیئەکانی سەرەتا، کە خەلەف پێیان دەڵێن مورجیئەی فوقەهاء، کە تەواوی ئەو ڕەددانەی سەلەف بۆ مورجیئەکان و ئەو توندێتی و تەبدیعەی ئەوان بۆ مورجیئەکان، سەلەف و پێشینی مورجیئەکان

بووە کە لای خەلەف مورجیئەی فوقەهائن، پاشان مورجیئەی سەرەتا ئەهلی ڕەئی و ڕاوبۆچوون بوون و دوژمنی ئەهلی حەدیس و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ، هەم لە عەقیدە هەم لە فیقهیشدا، سەلەف تەبدیعی سەرە گەورەکانیشیان کردوون، بەڵکوو کۆدەنگی سەلەف دروست بووە لەسەر تەبدیع و دەرکردنی مورجیئەکان لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت، وە لەسەرەمی سەلەفدا پێیان نەوتراوە ئەهلی سوننە، کە ئەوان ئەهلی ڕەئی بوون؛ چونکە بیروباوەڕیان وابوو ئیمان تەنها بە بیروباوەڕی دڵ و دووپاتکردنەوەی زوبان دێتە بوون، کردار بەشێک نییە لە پایەکانی ئیمان، وە حوکمی ئیسلام و ئیمانیان بۆ کەسێک دەدا کە وازهێنەر و تاریکی فەرزەکانی ئیسلام بێت.

ئەمە مورجیئەکانی سەرەتا بوون، بەڵام دواتر مورجیئەکان لقوپۆپی دیکەیان لێبوویەوە لە بابەتی ئیماندا، لەوانە:

١- جەهمییەکان: بیروباوەڕیان وابوو ئیمان تەنها مەعریفەت و ناسینی دڵە، ئەمە بەبێ دووپاتکردنەوەی زوبان.

٢- کەڕامییەکان: بیروباوەڕیان وابوو تەنها دووپاتکردنەوە و وتن بە زوبان کافی و بەسە و کەسەکە ئیمانداره، با دڵ و کرداریشی لەگەڵدا نەبێت.

٣- لە دواتریشدا ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان: لە بابەتی ئیماندا هەمان بیروباوەڕی جەهمییەکانیان هەیە؛ چونکە پێیان وایە ئیمان مەعریفەت و ناسینی دڵە، ئیتر گەر هیچ کردەوەیەکیشی لەگەڵدا نەبێت.

## ٢٩- وَالْقَدَرِيَّةُ الْمُبْتَدِعَةُ ضُلَّالٌ.[(١)]

---

(١) **وَالْقَدَرِيَّةُ الْمُبْتَدِعَةُ ضُلَّالٌ.** واتە: قەدەرییەکان: بیدعەچی و گومڕان.

تەبعەن مەبەست لەم قەدەرییانە ئەوانەی سەرەتا بوون، کە بیروباوەڕیان بە عیلم و زانستی پێشوەختەی ﷲ و کیتابەت و نوسینی قەدەرەکان هەبوو، تەنها لە پایەی (مەشیئەت و خەلق)دا گومڕابوون، بەوەی پێیان وابوو ﷲ تعالی ویست و مەشیئەتی لە خراپە و شەڕ نییە، ئەیانوت: (تاوان بە قەدەر نییە، ﷲ تعالی تاوانی خەلق نەکردووە)، بەڵام قەدەرییەی ڕۆچوو کە پێیان ئەوترێت قەدەرییەی غولات یان غولاتی قەدەرییەکان ئەوانەی کە نەفی سێ ڕووکنی سەرەتایان ئەکرد، کە ئەوانیش:

١- **(العِلم)** واتە: عیلم و زانستی پێشوەختەی ﷲ تعالی دەربارەی شتەکان.
٢- **(الكِتَابَة)** واتە: نووسینی قەدەرەکان لە **(لَوحُ المَحفُوظ)**دا.
٣- **(المِشِيئَة)** واتە: ویستی ﷲ تعالی بۆ هاتنەبوونی قەدەرەکان.

جا غولاتی قەدەرییەکان ئەوانەبوون کە نکووڵی ئەمانەیان ئەکرد، بێگومان هەر کەسێک نکووڵی ئەمانە بکات؛ کافرە و، سەلەفیش تەکفیری ئەمانەیان کردووە.

٣٠- فَمَنْ أَنْكَرَ مِنْهُمْ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَعْلَمُ مَا لَمْ يَكُنْ قَبْلَ أَنْ يَكُونَ؛ فَهُوَ كَافِرٌ.[1]

---

(١) **فَمَنْ أَنْكَرَ مِنْهُمْ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَعْلَمُ مَا لَمْ يَكُنْ قَبْلَ أَنْ يَكُونَ؛ فَهُوَ كَافِرٌ.** واتە: هەرکەس لەوان نکۆڵی ئەوە بکات کە اللە تعالی زانستی بە شتەکان هەیە پێش ئەوەی ڕووبدەن؛ ئەوە کافرە.

هەرکەس پێی وابێ اللە تعالی ئەو شتانە نازانێت کە ڕووئەدەن تاکوو ڕوونەدەن؛ ئەوە کافرە، کەواتە قەدەرییەکان ئەوانەی کە نەفی **(العِلم)** یان **(المِشِيئَة)** یان **(الكِتَابَة)** دەکەن؛ ئەوانە کافرن، بەڵام ئەوانەیان کە نەفی **(الخَلق)** دەکەن، واتە: اللە تعالی شەڕ و خراپە و تاوان و مەعسییەتەکانی دروست نەکردووە ، ئەوانە ئەبینین سەلەف بەکافریان دانەناون و، بە بیدعەچی و گومڕایان داناون.

کەواتە قەدەرییەکان دوو بەشن: (سەرەتاکان و غولاتەکان)، غولاتەکان: گومان لە کافربوونیان نییە؛ چونکە ڕەددی سێ پایەیان دابووەوە کە کوفری گەورەن، سەرەتاکانیش: کە تەنها نەفی خەلق ئەکەن بۆ خراپە و مەعسیەت و، ئەیانەوێ بەحیسابی خۆیان خراپە نەدەنە پاڵ اللە تعالی، ئەوانە بیدعەچی و گومڕان لای سەلەف؛ چونکە اللە تعالی خالیق و بەدیهێنەری خۆمان و کردارەکانیشمانە بە خراپ و باشییەوە، بەڵام ئەوە ئێمەین کە فاعیل و بکەری کردارە خراپەکانین.

## ٣١- وَأَنَّ الْجَهْمِيَّةَ كُفَّارٌ.(١)

---

(١) وَأَنَّ الْجَهْمِيَّةَ كُفَّارٌ. واتە: بێگومان جەهمییەکان کافرن.

جەهمییەکان کە شوێنکەوتەی جەهمی کوڕی سەفوان بوون و کەسانێکی کافربوون، ئەوەش حوکمی سەلەفە بۆ جەهمییەکان، ئەمە بەگشتی و موتڵەقی وە بە دیاریکراوی و موعەینیش، وە تەنانەت تەکفیری ئەوانەشیان کردووە کە عوزریان بۆ جەهییەکان هێناوەتەوە.

هەڵوەشێنەرەوە و کوفرەکانی جەهمییەکان زیاتر لە ٧٠ دانەی تێپەڕاندووە، وەکو پێشەوا ئەحمەد باسیەکات، کە بەڵگەی ئایەت و فەرموودە و فیترەت و، تەنانەت عەقڵیش ئەوانە بەکافر و دەرچوو لەدین ئەزانێت، هەرچەندە خۆیان بە موسڵمان بزانن و خۆیان پاڵبدەن بۆ لای ئیسلام.

**هەندێ نیشانەی جەهمییەکان:**

هەندێ لەو نیشانانەی جەهمییەکان کە ئیمامی ئەحمەد باسی ئەکات و، پێی دەوترێت [السَّبعِينِيَّة]، واتە: ٧٠ نیشانەی جەهمییەکان، لەوانە:

١- جەهمییەکان پێیان وایە قورئان مەخلووق و دروستکراوە.
٢- پێیان وایە ﷲ تعالی قسە ناکات بە پیت و دەنگ (الحَرفُ وَالصَّوت).
٣- پێیان وایە ﷲ تعالی بە زاتی خۆی لەسەر عەرش نییە.

٤- پێیان وایە اللّٰە تعالی حەدد و بەینونەی نییە، تا جیابێت لە مەخلووقات.

٥- وە نەفی جیهەت و مەکان ئەکەن بۆ اللّٰە تعالی و، هەندێکیان باوەڕیان وایە اللّٰە تعالی لە هیچ شوێنێک نییە، وە هەندێکی تریان باوەڕیان وایە اللّٰە تعالی لە هەموو شوێنکە، کە پێیان وایە اللّٰە تعالی تێکەڵی مەخلووقاتی ئەبێت و ئاوێتەی ئەبێت و یەکەگرێت لەگەڵیدا.

٦- پێیان وایە اللّٰە تعالی سیفەتی نییە.

٧- پێیان وایە: لە قیامەتدا اللّٰە تعالی بە چاوی سەر نابینرێت.

٨- پێیان وایە اللّٰە تعالی شێوەی نییە و فەرموودەکانی شێوە و وێنە (صُورَة)ی اللّٰە تعالی ڕەتدەکەنەوە.

٩- پێیان وایە میزان کە تەرازووە و سیراتیش کە پردێکە لە قیامەتدا مرۆڤەکان بەسەریدا ئەپەڕنەوە، بوونیان نییە و نکووڵی ئەو دوانە ئەکەن.

١٠- پێیان وایە شەفاعەت بوونی نییە و نکووڵی لیَ ئەکەن.

١١- پێیان وایە سزای گۆڕ بوونی نییە و، مونکەر و نەکیر بوونیان نییە و نکووڵی ئەکەن.

١٢- پێیان وایە پێغەمبەری خوا ﷺ دانانیشیَ لەسەر عەرشی اللّٰە تعالی بۆ شەفاعەت لە قیامەتدا، کە ئەمە کۆدەنگی سەلەفە، لەناو سەلەفدا کەس نەبووە باوەڕی بەو پلە و پێگەیە نەبێت، کە اللّٰە تعالی پێغەمبەری خوا ﷺ دائەنیشێنێت لەسەر عەرشەکەی. تەبعەن هەرکەسێك لەسەردەمی سەلەفدا باوەڕی بەوە نەبوایە و نکووڵی بکردایە؛ بە جەهمییان دەزانی.

١٣- پێیان وایە بەهەشت و دۆزەخ فەوتانیان بەسەردا دێت و، دوای ماوەیەکی کاتی لە چوونە ناوەوەیان لەلایەن ئەهلەکانیانەوە.

١٤- پێیان وایە حەوزی کەوسەر بوونی نییە و نکوولّی ئەکەن.

١٥- پێیان وایە عیسا ﷺ دانابەزێت پێش هاتنی قیامەت و نکوولّی ئەکەن.

١٦- پێیان وایە دەجال دەرناچێت پێش هاتنی قیامەت و نکوولّی ئەکەن.

١٧- پێیان وایە داواکردنی موسا بۆ بینینی ﷲ تعالی کوفر بووە -والعیاذ باللە-، واتە پێیان وایە موسا کوفری کردووە.

١٨- پێیان وایە موسا قسەی لەگەڵ ﷲ تعالی نەکردووە و نکوولّی ئەکەن.

١٩- پێیان وایە عەرش و قەڵەم و کورسی بوونی نییە و نکوولّی ئەکەن.

٢٠- پێیان وایە ﷲ لەسەر عەرش دانەنیشتووە و نکوولّی ئەکەن.

جگە لەمانەش لە کوفرەکانیان و لە لادانیان لە بیروباوەڕی ئیسلامی زۆرن، بۆیە بێگومان: (أَنَّ الْجَهْمِيَّةَ كُفَّارٌ). واتە: بێگومان جەهمییەکان کافرن. بە تاک بێت یان بە گشتی. ئەمە لای سەلەف، بەپێچەوانەی خەلەفەوە کە لە مەنهەجی سەلەف لایانداوە لە تەکفیری جەهمییەکان، جا هەرچۆنێک بێت و هەر کەسێک بێت.

## ٣٢- وَأَنَّ الرَّافِضَةَ رَفَضُوا الْإِسْلَامَ.(١)

(١) وَأَنَّ الرَّافِضَةَ رَفَضُوا الْإِسْلَامَ. واته: بێگومان ڕافیزەكان ئیسلامیان ڕەفزكردۆتەوە.

ڕافیزەكان ئەوانەن كە هاوەڵانیان تەكفیركرد، تەنها پێنج یان شەش یان دوانزەیان نەبێت، وە باوەڕیان بە فەزڵ و ئیمامەتی ئەبو بەكر و عومەڕ نەبوو، ئیمامی عەلییان بە شایستەتر ئەزانی بەسەر هەموو هاوەڵانەوە، ئەوانە ڕافیزەكانن و كافرن، ئیمامی مالیک ئەڵێ: "لَا نَصِيبَ لَهُم فِي الإِسلَام". واتە: ڕافیزەكان هیچ بەشێكیان لە ئیسلام نییە. ئەمە حوكمی سەلەفە بۆ ڕافیزەكانی سەرەتا، بەڵام ڕافیزەكانی دواتر بەتایبەت دوای سەدەی شەش و حەوتی كۆچی بێگومان شیرک و كوفریان زۆر زیاترە، ئەوانەی سەردەمیش نە شیعەن، نە ڕافیزەن، بەڵكوو وەسەنی و موشریكن و، هەڵگری دینێكی ترن جگە لە ئیسلام.

پاشان با ئاگاداربین شیعە لای سەلەف كافر نەبوون و موبتەدیع بوون، ڕافیزە كافربوون، شیعە لای سەلەف ئەوانەبوون كە لە تەرتیب و ڕێكخستندا ئیمامی عەلییان پێشەخست بەسەر ئیمامی عوسماندا بەتەنها، نەک بەسەر ئیمامی ئەبو بەكر و عومەریشدا، بەڵام ڕافیزەكان بە تاک و بە گشتی كافرن، بۆیە پێویستە ئاگامان لە زاراوە و موستەڵەحەكان بێت.

## ٣٣- وَالْخَوَارِجَ مُرَّاقٌ.[١]

---

(١) وَالْخَوَارِجَ مُرَّاقٌ. واته: وه خەواریجەکان دەرچوون.

واته: دەرچوون لە دین. تەبعەن ئەو خەواریجانە دەڵێین کە غولات و دواییینەکانن، نەک ئەوانەی سەرەتا؛ چونکە ئەوان موبتەدیع بوون، هەرچەند بە ڕەهایی پێیان وتراوە (مُرَّاقٌ) واتە دەرچوون.

ئەوانەی سەرەتا بەهۆی دوو شتەوە تەبدیع کران، ئەوانیش:

١- بە دروستیان ئەزانی شۆڕش بکەن و دەربچن لەسەر ئیمامی موسڵمانان، کە زوڵمێکی لێوە دەرچێ یان فیسقێکی لێوە دەرچێ، وە خەلافەتی هیچ کەسێکیان بەلاوە قەبووڵ نەبوو تاوەکو هی خۆیان نەبێت.

٢- تەکفیری موسڵمانی نوێژکەریان ئەکرد بەهۆی تاوانەوە.

بەهۆی ئەم دوو خاڵەوە سەلەف تەبدیعی خەواریجەکانی سەرەتایان کردووە، بەڵام خەواریجە دواییینەکان و غولاتەکان، جگە لەو دوو بیدعەیە کوفرییاتی تر تێکەڵی عەقیدەیان بووە، بۆیە کاتێک ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە تەکفیری خەواریجەکاندا خیلافیان هەیە، ئا بەو شێوەیەیە، خەواریجەکانی پێشوو بەهۆی ئەو دوو خاڵەوە بە موبتەدیع دائەنران لای سەلەف، بەڵام دواییینەکانیان کوفر تێکەڵی عەقیدەیان بوو، لەوانە:

١- تەكفیركردنی هاوەڵان بەگشتی.

٢- نكووڵیكردنی ڕەجم.

٣- نكووڵیكردنی شەفاعەت.

٤- نكووڵیكردنی حەوزی كەوسەر.

وە شتانێكی تریش كە لە دیندا بەڵگە نەویستە.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: "**يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ**"(٢٥٩). واتە: لە ئیسلام دەردەچن وەكو چۆن تیر لە نێچیر دەرەچێ.

بۆیە سەلەف پێیان وتوون موڕڕاق یان ماریقین وەكو عەلی كوڕی ئەبو تالیب ﷺ ئاوا ناوی هێناون.

پاشان ئەو سەردەمەی خەواریجەكان دروست بوون سەردەمی كۆتایی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، بەتایبەت سەردەمی ئیمامی عەلی، تەنانەت ئیمای عوسمان بە زوڵم و ستەم لەلایەن خەواریجەكانەوە شەهید كرا، بۆیە سەلەفی ساڵح هۆشدارییان داوە دەربارەی خەواریجەكان.

پاشان خەواریجەكان ئەوانەن كە سەلەف وەسفیان كردوون، نەوەك ئەوانەبن كە موڕجیئەكان و جەهمییەكان وەسفیان كردبێتن؛ چونكە لای موڕجیئە و

جەهمییەکان ئەهلی سوننە خەواریجن و، ئەهلی سوننە تێکەڵ ئەکەن لەگەڵ خەواریجەکان.

بۆیە ئێمە ناسین و پێناسەی گروپەکان لە سەلەفەوە وەرەگرین، نەک کەسانێک خۆیان پاشخانی عەقیدەیەکی شێواویان هەبێت.

پاشان سەلەفی ساڵح بە دروستیان زانیوە جەنگ لەگەڵ ئەو خەواریجانەدا بکرێت کە چەکیان هەڵگرتووە و بەرامبەر موسڵمانان ئەجەنگن، بەڵام خەواریجێک کە چەکی هەڵنەگرتبێ بەرامبەر موسڵمانان و جەنگیان نەکات، ئەوە سەلەفی ساڵح وازی لە جەنگ هێناوە لە دژیان.

وە لەکاتی جەنگدا گەر هەڵبێن حوکمی سەلەف ئەوەیە بە دوایاندا ڕاناکرێت وەکو کافرەکان، وە ماڵ و سامانی خەواریجەکان بە حەڵاڵ نازانرێ. چونکە لای زۆرینەی سەلەف خەواریجەکان کافر نەبوون، بەڵکوو موسڵمانێکی لاڕێ بوون.

وە ئەسڵی (حەڕوڕییەکان)یش لە لادێیەک بوو، لە نزیک کووفە دەرچوون، کە ڕازی نەبوون بە خەلافەتی ئیمامی عەلی و وردە وردە کوفرییات هاتە ناو بیروباوەڕیانەوە، کە ئەمانیش خەواریجە دواییندکانن، کە سەلەف قسەیان هەیە لەسەر تەکفیریان، بەتایبەت ئەوانەی کە نکووڵی شەفاعەت و حەوزی کەوسەر و هەندێ بابەتی تر دەکەن کە بەڵگە نەویستە لە دینەکەماندا.

٣٤- وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ الْقُرْآنَ مَخْلُوقٌ؛ فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ.[١]

---

(١) وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ الْقُرْآنَ مَخْلُوقٌ؛ فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ. واته: هەرکەسێک گومانی وابێ و بڵێ قورئان مەخلووق و دروستکراوە؛ ئەوە کافرە بە (اللَّهُ)ی گەورە، بە کوفرێک کە خاوەنەکەی لە میللەتی ئیسلام دەرئەکات.

هەرکەس گومانی ئەوە بەرێت کە قورئان کەلامی اللَّهُ تعالی نییە بە دەنگ و پیت و دروستکراوە، کافرە بە کوفری گەورە و لە دین و میللەتی موسڵمانان ئەچێتە دەرەوە، ئەمە ڕەددە بۆ کەسانێک کە لایاندا لە حوکمی سەلەف بۆ جەهمییەکان، وە کوفری خەلقی قورئانیان بە کوفری گەورە نەئەزانی و، ڕائەوەستان لە تەکفیری جەهمییەکان، کە لای سەلەف: "مَن قَالَ بِخَلقِ القُرآنِ، يُكَفَّرُ مُبَاشَرَةً وَلَم يُفَصَّل". واتە: ئەوە دەربارەی قورئان بیوتایە مەخلووقە، کافرەکرا بە ڕاستەوخۆیی و بێ جیاکاری لە نێوان موتڵەق و موعەیەن. واتە بەگشتی و بە دیاریکراویش.

(إبن أبي عاصم و السجزي) وردەکارییەکی بیدعییان داهێنا و وتیان: سەلەف ڕای جیاوازییان هەبووە لە تەکفیری جەهمییەکان دەربارەی کوفری خەلقی قورئان، کە ئایا کوفری گەورەیە یان بچووکە. بێگومان ئەمە قسەیەکی بەتاڵە و موخالەفەی کۆدەنگی و ئیجماعی سەلەفە لەسەر جەهمییەکان، لای سەلەف نەک هەر جەهمییەکان کافرن بەڵکوو:

## ٣٥- وَمَنْ شَكَّ فِي كُفْرِهِ مِمَّنْ يَفْهَمُ؛ فَهُوَ كَافِرٌ.[١]

(١) وَمَنْ شَكَّ فِي كُفْرِهِ مِمَّنْ يَفْهَمُ فَهُوَ كَافِرٌ. واته: هەرکەسێکیش گومانی هەبووبێ لە کوفرەکەیان لەوانەی تێدەگەن و جەهمییەکان کافر ناکەن؛ ئەوە ئەویش کافرە.

لای سەلەف هیچ وردەکارییەک نەبووە لە تەکفیری جەهمییەکاندا، چ دیاریکراویان یان گشتییان، ئەوەی لای سەلەف دەبارەی پرسی جەهمییەکان وردەکاری بووە ئەوانە بوونە کە (عَاذِر) و پۆزش دەربوونە بە جەهمییەکان، یان ئەوانە بوونە کە گومانیان لە کافرێتی جەهمییەکان هەبووە، بەڵام ئاگاداربە چ کەسێکیان؟ ئەوانەیان وەکوو دوو ڕازییەکە وتیان: (مِمَّنْ يَفْهَمُ)، واتە: ئەوەی تێبگات، واتە بتوانێ تێبگات لە کافرێتی جەهمییەکان یان هەر گرووپێکی تر، ئەم تێگەشتنە قەید و مەرجە بۆ ئەم بابەتە، ئەمە کۆدەنگی سەلەفە دەربارەی عوزردان بە جەهمییەکان و موشریکەکانی دیکەش، کە کافرن ئەوانەیان تێدەگەن کە جەهمییەکان کوفریان هەیە، یان گرووپە کافرەکان کوفرییان هەیە و تەکفیریان ناکات و ڕادەوەستێ لە کافرکردنیان.

کەواتە ئەوەی جاهیل بێت بە کافرێتی جەهمییەکان، یان خاوەن کوفرێک و کافرێتی ئەو کەسەی پێنەگەشتبێ و نەزانێ، پێویستە فێر بکرێت و پێی بوترێت،

دوای گەیشتنی حوکمەکە پێی، هەر وەستا لە کافر نەکردنیان، یان نکووڵیکرد لەوەی کافربن؛ ئەوە حوکمی کافرێتی مولحەق ئەکرێت بەویشەوە و ئەویش پێی کافر دەبێت.

کەواتە بۆمان دەرکەوت ئەوەی تەکفیر نەکراوە و وردەکاری پێدراوە لەلایەن سەلەفەوە ئەوانەن کە (عَامِي و عَاذِر)ن، واتە: کەسانێکن کە عوزریان داوە بە جەهمییەکان و، نەزانن و حوکمی کافرێتی جەهمییەکانیان پێنەگەشتووە و نازانن کوفرەکانیان چین. ئەمانە تێدەگەیەنرێن، دواتر گەر وەکوو پێشوو هەر ڕادەوەستان لە کافر نەکردنیان؛ ئەوکات ئەوانیش کافر ئەکرێن بە کۆدەنگی سەلەف. خۆ گەر کەسی عوزردەر لەوانەبێت کە (يَفْهَمُ)، واتە: تێگەشتوون لەوەی جەهمییەکان خاوەن چ کوفرێکی گەورەن و کافریان نەکات، ئەویش کافرە.

بۆیە بابەتی خەلقی قورئان بابەتێکی گەورەبوو کە ڕوویدا لەسەردەمی سەلەفدا، جەهمییەکان هاتن بانگەشەی ئەوەیانکرد قورئان مەخلووقە، بەوەی پێیان وانەبوو ﷲ تعالی قسە ئەکات، گەر قسەش نەکات ئەوە هەرووەکوو شتەکانی دیکە مەخلووق و دروستکراوە، بەڵام ئێمەی موسڵمان لامان وایە ئەو قورئانە ﷲ تعالی قسەی پێکردووە بە دەنگ و پیت، بۆیە لەو سەردەمەدا کۆدەنگی سەلەفی ساڵح دروستبوو لەسەر کافرێتی جەهمییەکان، وە عەقیدەیان وابوو هەرکەس پێی وابێ قورئان مەخلووقە با نێوچاوانی لە سەجدە بردنی شەونوێژدا ڕەش بووبێت، یان لەناو خەڵکدا بە ئەهلی زوهد و تەقوا ناسراوبێ

کافرێکی موشریکه و خاریج و دەرچووه له دینی موسڵمانان، ڕووکەشەکەی ناخوێنرێتەوه که چەند کەسێکی خواپەرست و نوێژکەر و ڕۆژووگر و زاهید و عابیده، مادام بیروباوەڕێکی کوفری هەیە،.

با هەڵنەخەڵەتێین به کەسانێک که ئەهلی زوبان و قسەزانن، یان ئەهلی شەهادەبن، یان به ڕووکەش ئەهلی زوهد و وەرع و تەقوابن، بەڵام که خاوەنی عەقیدەیەکی بەتاڵ بن، ئەوانه نابنه تەزکییه بۆیان، تەزکییەی حەقیقی ئەوەیه کەسێک شوێکەوتەی سەلەفی ساڵح بێت، ئەوه مرۆڤ ئەگەیەنێت به ڕەزامەندی پەروەردگار.

٣٦- وَمَنْ شَكَّ فِي كَلَامِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَوَقَفَ شَاكًّا فِيهِ يَقُولُ: لَا أَدْرِي مَخْلُوقٌ أَوْ غَيْرُ مَخْلُوقٍ؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.[1]

٣٧- وَمَنْ وَقَفَ فِي الْقُرْآنِ جَاهِلًا، عُلِّمَ وَبُدِّعَ وَلَمْ يُكَفَّرْ.[2]

---

(١) **وَمَنْ شَكَّ فِي كَلَامِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَوَقَفَ شَاكًّا فِيهِ يَقُولُ: لَا أَدْرِي مَخْلُوقٌ أَوْ غَيْرُ مَخْلُوقٍ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.** واته: هەرکەس گومانی هەبێت لە وتەی اللَّهُ تعالی و بوەستێ بە گومانەوە و دەربارەی بڵێ: نازانم مەخلووقە یان مەخلووق نییە، ئەوە کەسێکی جەهمی (کافرە).

(٢) **(وَمَنْ وَقَفَ فِي الْقُرْآنِ جَاهِلًا، عُلِّمَ وَبُدِّعَ، وَلَمْ يُكَفَّرْ).** واتە: وە هەرکەسێک بوەستێت لە قورئاندا بە نەزانین، ئەوە فێردەکرێ و تەبدیع ئەکرێ و، کافر ناکرێ.

کەواتە **(الواقِفِيَّة):** ئەوانەن ڕائەوەستن لەوەی بڵێن: (قورئان مەخلووقە) وەکو جەهمییە کافرەکان، یان بڵێن: (قورئان مەخلووق نییە) وەکو موسڵمانان، ئەمانیش دوو جۆرن:

١- جۆری یەکەمیان **(عَالِمٌ)**و زانان، **(طَالِبُ العِلْم)** و خوێندکاری زانست و ئەلی فەهم و تێگەشتنن، کە بزانن ڕاوەستان لە یەقین و دڵنیایی لەوەی قورئان کەلامی (اللَّهُ تعالی)یە و وتنی: (قورئان مەخلووقە)کوفرە؛

بێگومان ئەوانە کەسانێکی کافرن و، مولحەقن بە جەهمییەکانەوە، هیچ عوزرێکیشیان نییە، با هەرکەسێک بن.

٢- جۆری دووەمیان کەسانێکی (عَامِي)ی نەخوێندەوارن کە نازانن وەستان دەربارەی ئەوەی قورئان کەلامی (ﷲ تعالى)یە و مەخلووق نییە کوفرە، واتە نازانن ئەبێ دڵنیابن لەوەی قورئان کەلامی ﷲ و مەخلووق نییە، نازانن گەر دڵنیا نەبن کافرن، بە جەهل و نەزانینەوە ڕاوەستاون و دڵنیانین، ئەم جاهیلانە بێگومان ئەهلی سوننە نین و موبتەدیعن، وە فێرەکرێن کە ئەو بابەتە چۆنە، بەڵام کافر ناکرێن سەرەتا، بەڵام کە فێرکران و هەر بەردەوام بوون لە ڕاوەستانیان؛ ئەوە مولحەقن بە جەهمییەکان و کافرەکرێن.

ئەمە بیروباوەڕی سەلەفە دەربارەی واقیفییەکان، کە چۆن نەزانێکی نەخوێندەواریش کە بە نەزانین خۆی یەکلا نەکردبێتەوە دەربارەی ئەوەی بڵێ: قورئان کەلامی (ﷲ تعالى)یە، بە ئەهلی سوننەت و جەماعەتیان نەزانیوە و تەبدیعیان کردووە، نەک ئەوەی عوزریان بۆ بهێنرێتەوە، بەڵام ئەوەیە کە کافر نەکراوە مادام ئەهلی (فَهم) و تێگەشتن نەبووە، ئەمە تا کەی؟ تا ئەوکاتەی حوججە و بەڵگەیان پێئەگات کە ڕاوەستان لەو بابەتەدا کوفرە، کە پێیان گەشت و هەر ڕاوەستان؛ ئەوانیش کافر دەکرێن، بەڵام کەسانی ئەهلی فەهم و علیم و زانست، زانیبێتیان ڕاوەستان کوفرە و یەکلانەبووبێتنەوە؛ ئەوانە بەکافر و بە جەهمی دانراون.

٣٨- وَمَنْ قَالَ: (لَفْظِي بِالْقُرْآنِ مَخْلُوقٌ)؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ، أَوِ: (الْقُرْآنُ بِلَفْظِي مَخْلُوقٌ)؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.(١)

---

(١) **وَمَنْ قَالَ: (لَفْظِي بِالْقُرْآنِ مَخْلُوقٌ)؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ، أَوِ: (الْقُرْآنُ بِلَفْظِي مَخْلُوقٌ)؛ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.** واته: هەرکەسێک بڵێ: لەفز و دەنگەکەی من بە قورئان مەخلووق و دروستکراوە، یان بڵێ: قورئان بە لەفز و دەنگەکەی من مەخلووق و دروستکراوە؛ ئەوە جەهمی (کافرە).

ئەمە کێ وا ئەڵێ؟

هەموو سەلەفی ساڵح کۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئەوکەسە کافرە، نەوەکوو زانایەک و دووان و سیان وەکو لە ڕابردوودا باسمانکرد، بۆیە لەفزییەکان گرووپێکی جەهمییەکان بوون، بەڵکوو خراپترینیان بوون، بۆ؟ چونکە تەلبیس و فێڵیان ئەکرد، بە ڕووکەش خۆیان وەکو ئەهلی سوننەت و جەماعەت نیشان ئەدا، بەوەی ئەیانوت: قورئان کەلامی (اللَّهُ تعالى)یە، بەڵام ئەشیانوت: لەفز و خوێندنەوەی ئێمە بە قورئان، یان قورئان بە خوێندنەوی ئێمە مەخلووق و دروستکراوە، سەلەف ئەوەیان لێ قەبووڵ نەکردن و بەخراپتریان ئەزانین لەو جەهمییانەی کە بە ئاشکرا ئەیانوت قورئان مەخلووقە، بۆ؟ چونکە سەرەنجامی ئەم قسەیەی لەفزییەکان ئەچێتەوە سەر ئەوەی دەڵێن: قورئان مەخلووقە، بۆیە ئەم قسانە ئەگەر بکرێت:

١) خوێندنەوەی قورئان بە دەنگی من.

٢) قورئان خوێندن بە دەنگی من.

٣) نوسینەوەی قورئانم.

٤) مورەکەب و نوسینەکە.

وێنەی ئەم قسانە گەر بوترێت: مەخلووقە، ئا ئەم وردەکارییە لەفزییە بە بیانووی جیاکردنەوەی:

١) خوێندنەوە و خوێنراو.

٢) نوسینەوە و نوسراو.

سەرەنجامی وێنەی ئەمانە خاوەنەکەی ئەخاتە ناو ئەوەوە کە بڵێ: قورئان مەخلووقە، بۆیە سەلەفی ساڵح ئەم قسە بەتاڵانەیان بە جەهمییەت ژماردووە، بۆیە پێویستە بوترێت: قورئان وتەی (اللَّهُ تعالى)یە و مەخلووق نییە لە هیچ ڕوویەکەوە، ئیتر نەچینە ناو ئەو وردەکاری و جیاکارییەی جەهمییە کافرەکان دایانهێنا.

کەواتە جەهمییەکان لە بابەتی خەلقی قورئاندا سێ گرووپن:

١- جەهمییەی خەلقییە: ئەوانەی بە ئاشکرا دەڵێن: قورئان مەخلووقە.

٢- جەهمییەی واقیفییە: ئەوانەی ڕائەوەستان لەوەی بڵێن: قورئان کەلامی (اللَّهُ تعالى)یە، یان: قورئان مەخلووقە.

٣- جەهمییەی لەفزییە: ئەوانەی دەڵێن: لەفز و دەنگ و خوێندنەوەمان بە قورئان مەخلووقە.

هەرسێکیان ئیمامی ئەحمەد و جگە لەویش لە ئاستی جەهمییەکاندا باسیان کردوون.

بۆیە گرنگە ئێمە بیروباوەڕی سەلەف تەنازول پێ نەکەین بۆ هیچ کەسێک، کە هەڵگری بیروباوەڕی یەکێک لەم گرووپانە بووبێ، وە ئەسڵ وایە من و تۆی موسڵمان شوێن ئەو کۆدەنگی و دینداریيە بکەوین کە هاوەڵان و تابیعییەکان و تابیعی تابیعییەکان و ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لەسەر بووە، وە بڵێین: ئەوە بیروباوەڕمانە کە کۆدەنگی ئەوانە، وە هەرکەس پێچەوانەی ئەم کۆدەنگییەی سەلەفی ساڵح بوو، ئەبێ ئاگاداربین لە قسەکەی، با ناو و ناوبانگ و ناسراوییەکی زۆری هەبێت لەناو خەڵکیدا و بە زانا و زاهید و عابیدیش ناسرابێ، نابێ تەنازول بکەین لە بیروباوەڕماندا لەپێناو ئەوکەسە یان جگە لەو کەسەش.

پاشان لێرەوە فێر دەبین کە بابەتی قورئان یەکێکە لەو بابەتە گەورانەی کە تاقمی جەهمییەکان پێی لە ئیسلام دەرچوون، کە بیروباوەڕیشیان وایە ئەو خوایەی خۆیان ئەیپەرستن، جیایە لەو خوایەی کە موسڵمانان دەیپەرستن، پێیان وایە خوایەکەی ئەوان قسە ناکات.

تەبعەن جەهمییەکانیش گرووپیان زۆرە لە بابەتی قورئاندا، کە ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکانیش لە بابەتی قورئاندا جەهمیین، چونکە ئەوانیش پێیان وایە ئەو

قورئانەی ئەمڕۆی بەردەست موسڵمانان کەلامی ﷲ نییە، بەڵکوو عیبارەتە لە کەلامی ﷲ تعالی، چونکە لە بیروباوەڕی ئەشعەری و ماتوریدییەکان وەهایە ئەو خوایەی موسڵمانان بە لەفز و دەنگ قسە ناکات، بەڵکوو پێیان وایە ﷲ تعالی خاوەنی کەلامی نەفسییە و هەرکات بیەوێ ئەیخاتە ناو نەفسی ئەو کەسەوە، بەبێ ئەوەی بە لەفز و گۆ دەریببڕێت، کە بێگومانە ئەمە عەقیدەی موسڵمان و عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نییە، ئێمە وەکو موسڵمان بیروباوەڕمان وایە ﷲ تعالی کەلامی هەیە و قسە دەفەرموێت، هەر لە دونیادا دەیان پێغەمبەر و دەیان فریشتەی ﷲ تعالی گوێیان لە دەنگی ﷲ تعالی بووە، موسا لە دونیادا گوێی لە دەنگی پەروەردگار بوو کە پەروەردگار قسەی ئەفەرموو لەگەڵ مووسادا -عَلَيهِ وَعَلَى نَبِيِّنَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام-، ﷲ تعالی دەفەرموێت: (وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا)[٢٦٠]. واتە: وە ﷲ تعالی قسەی لەگەڵ مووساکرد بە قسەکردن. وە فریشتەکانیش هەر گوێبیستی وتەی ﷲ تعالی بوون، وە پێغەمبەری خواش ﷺ لە شەوی ئیسڕا و میعڕاجدا بەهەمان شێوە گوێبیستی وتەی ﷲ بووە ئەو شەوەی کە جەهمییەکان زیندووی دەکەنەوە، کەچی باوەڕیان بەوە نییە ﷲ تعالی کاتێك پێغەمبەری خوای ﷺ بانگێشتکرد بۆ سەرووی ئاسمانەکان و قسەی لەگەڵداکرد، تەنانەت باوەڕیشیان بەوە نییە ﷲ تعالی لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوەیە.

---

(٢٦٠) النساء: ١٦٤.

بۆیە پێویستە ئەوە ببێت بە عەقیدەمان کە ﷲ تعالی کەلامی هەیە کە قورئانە و جگە لە قورئانیش کەلامی تری هەیە، کەلامی (ﷲ تعالی)ش دەنگ و پیتە، لە قیامەتیشدا گوێبیستی دەنگی ﷲ تعالی ئەبین -إن شاء ﷲ-، وە بەتایبەتیش ئەوانەی ئەچنە بەهەشتەوە ﷲ تعالی یەک بە یەک قسەیان لەگەڵدا ئەکات بەبێ هەبوونی وەرگێڕ، ئەمەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ:[١]

٣٩- وَعَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ.[٢]

---

(١) **قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ:** واه: (إبن أبي حاتم) ئەڵێ: گوێم لە باوکم بوو ئەیوت:

(٢) **وَعَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ.** واتە: نیشانەی ئەهی بیدعە و لاڕێبووەکان لە سوننەت، ئەوەیە قسە و توانج دەڵێن بە شوێنکەوتووانی ئەهلی ئەسەر.

بێگومان نیشانەکانی ئەهلی بیدەع زۆرن، لە دیارترینیان بریتییە لە توندی دژایەتییان بۆ شوێنکەوتووانی سەلەف، توندی دژایەتییانە بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی ئاساری سەلەف و، بە سووک سەیرکردنیانە، چونکە ئامانجیان خستنی ئیحتیجاج و بەڵگەیە بۆ ئاساری سەلەف، چونکە ئاساری سەلەف کەشفی لادان و گومڕاییەکانیان ئەکات.

٤٠- وَعَلَامَةُ الزَّنَادِقَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (حَشْوِيَّةً) يُرِيدُونَ إِبْطَالَ الْآثَارِ.[1]

---

(١) وَعَلَامَةُ الزَّنَادِقَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ حَشْوِيَّةً، يُرِيدُونَ إِبْطَالَ الْآثَارِ. واتە: نیشانەی زندیقەکان ئەوەیە بە ئەهلی سوننە دەڵێن: گێل و گەوج، ئەیانەوێ و ئامانجیانە حەق و ئەسەر ڕەتبکەنەوە.

زندیق لە بنچینەدا وشەیەکی فارسییە، سەلەف لە زاراوەدا زیاتر بۆ کەسانێکییان بەکارهێناوە کە لە ڕووکەشدا موسڵمان بوون، بەڵام هەڵگری کوفر و شیرکی گەورەبوون و لاڕێبوون بە کوفر و شیرکی گەورە، وە کۆمەڵێک بیروباوڕ و قسە هەیە لای سەلەف هەرکەس هەڵگریان بووبێ پێیان وتووە زندیق، لەوانە:

١- (تَكذِيبُ الأَحَادِيثِ الصَّحِيحَة). واتە: بەدرۆخستنەوەی فەرموودەی سەحیح و ڕەتکردنەوەی فەرموودە بەبێ جەهل، ئیمامی ئەحمەد وەکو لە [طبقات الحنابلة]دا هاتووە، ئەڵێ: "مَن كَذَّبَ بِالرِّوايةِ؛ فَهُوَ زِندِيق". واتە: ئەوە ڕیوایەت بەدرۆ بخاتەوە زندیقە.

٢- لە سیفەتێکی زندیقەکان باوەڕنەبوونیانە بە سیفەتی پەروەردگار و واتا گۆڕینی سیفەتی پەروەردگار گەر یەک سیفەتیش بووبێ، ئیمامی (أَبُو العَبَّاس السَّرَاج) ئەڵێ: "هەرکەسێک ئیقراڕ و ئیمانی بە سیفەتەکان

نەبێت، بەوەی ﷲ تعالی سیفەتی پێکەنینی هەیە، سیفەتی دابەزینی هەیە هەموو شەوێک بۆ ئاسمانی دونیا، کە دەفەرمووێت: (کێ ئەیەوێت لێی خۆشبم با داوام لێبکات)، هەرکەس باوەڕی بەمانە نەبێت زندیقە".

٣- سیفەتێکی تری زندیقەکان بریتییە لە: (نَفيُ عُلُوِ اللهِ تَعَالَى عَلَى خَلقِهِ)، واتە: نەفیکردنی بەرزێتی ﷲ تعالی لەسەر مەخلووقاتەکانی، موحەممەدی کوڕی موسعەب وەکو عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەد لە [السنة]دا هێناویێتی ئەڵێ: "مَن زَعَمَ أَنَّكَ يَا الله لَا تَتَكَلَّمُ وَلا تَرَى فِي الآخِرَة؛ فَهُوَ كَافِرٌ بِوَجهِكَ لَا يَعرِفُكَ، أَشهَدُ أَنَّكَ فَوقَ العَرشِ فَوقَ سَبعِ السَّمَاوَات، لَيسَ كَمَا يَقُولُ أَعدَاءُ اللهِ الزَّنَادِقَة". واتە: ئەی پەروەردگارم هەرکەس وا گومانت پێبەرێت کە قسەناکەیت و نابینرێیت لە ڕۆژی قیامەتدا؛ ئەوە بێباوەڕ و کافرە بە وەجهی تۆ و ناتناسێت، شایەتی ئەدەم بەوەی کە تۆ لەسەر عەرشی خۆتیت لە سەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە، نەوەکو وەکو ئەوەی دوژمنەکانی ﷲ تعالی کە زندیقەکانن ئەیڵێن.

٤- بیروباوەڕ بوون بەوەی (قورئان مەخلووقە) زەندەقەیە، واتە هەرکەس پێی وابێ قورئان مەخلووقە زندیقە، سەوری ئەڵێ: "مَن قَالَ: القرآنُ مَخلُوق؛ فَهُوَ زِندِيق". واتە: هەرکەس بڵێ قورئان مەخلوقە؛ زندیقە. قوتەیبەی کوڕی سەعید ئەڵێ: "مَن قَالَ: القرآنُ مَخلُوق؛ فَهُوَ زِندِيقٌ كَافِرٌ باللهِ العليِّ العَظيم، لَا أُصلِّي خَلفَهُ وَلَا أَتَّبِعُ جَنَازَتَهُ وَلَا أَعُودُهُ. واتە: هەرکەس بڵێ: قورئان مەخلووقە؛ ئەوە کەسێکی زندیقی کافرە بە

اللهى بەرزى گەورە، نوێژى لە پشتەوە ناكەم و شوێن جەنازەكەى ناكەوم و سەردانیشى ناكەم كاتێك نەخۆش بوو.

٥- نەفیكردنى بینینى پەروەردگاریش لە سیفەتى زندیقەكانە، كە پێیان وایە الله تعالى لە ڕۆژى قیامەتدا نابینرێت، ئیمامى ئەحمەد ئەڵێ: **"الرُّؤيَةُ مَن كَذَّبَ بِهَا؛ فَهُوَ زِندِيق"**. واتە: هەركەس بینینى الله تعالى بەدرۆ دابنێ، ئەوە كەسێكى زندیقە.

٦- وە حەڵاڵكردنى حەڕامە كۆدەنگى لەسەرەكان **(مُجمَع عَلَيهَا)**، گەر بە موڵەتپێدان **(رُخَص)** و لێكدانەوە **(تَأوِيلَات)** و فێڵكردن **(حِيَل)**یش بێت، مادام بە ئیجماعى زانایان حەڕامە، حەڵاڵكردنى سیفەتى زندیقەكانە.

٧- وە درۆكردن بەدەم پێغەمبەرى خواش ﷺ هەر كارى زندیقەكانە.

٨- وە نەفیكردنى **(حَرف)** و **(صَوت)** لە كەلامى الله تعالى سیفەتى زندیقەكانە، كە پێیان وایە الله تعالى بە پیت و دەنگ قسە ناكات، بەڵكوو سیفەتى كەلامەكەى سیفەتى كەلامى نەفسییە، عبداللەى كوڕى ئیمام ئەحمەد ئەڵێ: **"قُلتُ لأَبِي: إنَّ هَاهُنَا مَن يَقُولُ إِنَّ اللهَ لَا يَتَكَلَّمُ بِصَوتٍ، فقال: يَا بُنَيَّ هؤلاءِ جَهمِيَّة الزَّنادِقَة، إنَّما يَدرُون عَلَى التَّعطِيل"**. واتە: بە باوكمم وت: قەومێك هەیە دەڵێن: الله تعالى بە دەنگ قسە ناكات، ئیمام فەرمووى: ئەى كوڕى خۆم ئەوانە جەهمى و زندیقن، ئەوانە ئەسووڕێنەوە بە دەورى لەكارخستن و پەكخستن و تەعتیلكردنى سیفەتەكانى الله تعالى.

٩- **وه نكوولّی کردنی تەرازوو و سیرات لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کاری زندیقەکانە.**

١٠- وه نكوولّی کردنی فەزیلەتی دانیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر عەرشی اللَّهُ تعالی هەر سیفەتی زندیقەکانە، وەکو (**أَبُو العَبَّاسِ الهَاشميِّ**) ئەڵێ: "**مَن رَدَّ حَدِيثَ المُجاهِدِ؛ فَهُوَ عِندِي جَهميٌّ، وَمَن رَدَّ فَضلَ النَّبِيِّ ﷺ ؛ فَهُوَ عِندِي زِندِيق**". واتە: هەرکەس ڕەددی فەرموودەکەی موجاهید بکات، لای من جەهمییە، وە هەرکەس ڕەددی فەزڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، بکات، لای من زندیقە. لای سەلەف ڕەددانەوەی فەزڵی پێغەمبەری خوا ﷺ زندیقێتییە.

لە [السنة للخلال]دا هاتووە ئیمام (**عُثمانُ بنُ أبِي شَيبَة**) ئەڵێ: "**لَا يُرَدُّ هَذَا الحَديثَ، إِلَّا الزَّنَادِقة**". واتە: کەس ڕەددی ئەسەرەکەی موجاهید ناکاتەوە، ئیللا کەسی زندیق نەبێت.

١١- بەدرۆ دانانی سزای گۆڕ.

١٢- قسەوتن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

١٣- بیروباوەڕی ئەوەی بەهەشت و دۆزەخ فەوتانیان بەسەردادێت.

١٤- بیروباوەڕی ئەوەی اللَّهُ تعالی لە هەموو شوێنێکە.

ئەمانە و جگە لەمانیش سیفەتی کەسی زندیق بوون لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

## ٤١- وَعَلَامَةُ الْجَهْمِيَّةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (مُشَبِّهَةً).(١)

---

(١) وَعَلَامَةُ الْجَهْمِيَّةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (مُشَبِّهَةً). واتە: نیشانەی جەهمییەکان ئەوەیە: بە ئەهلی سوننەت دەڵێن: تەشبیهکاران.

جەهەمییەکان بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن موشەببیهە یان موجەسسیمە، چونکە بیروباوەڕی ئەوان ئەسووڕێتەوە لە دەوری پەکخستنی سیفەتەکانی ﷲ تعالی، بە گومانی خۆیان خۆیان ئەپارێزن لە چواندن و لاشەدانان بۆ ﷲ تعالی، بۆیە ئەهلی سوننە بە موجەسسیمە و موشەببیهە ئەزانن؛ لەبەرەوەی سیفەتەکان جێگیر ئەکەن بۆ ﷲ تعالی، وەکو چۆن خۆی بۆخۆیی جێگیرکردووە و پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ پەروەردگاری جێگیر کردووە لە فەرموودە سەحیحەکاندا و سەلەف لەسەری ڕۆشتوون.

## ٤٢- وَعَلَامَةُ الْقَدَرِيَّةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ الْأَثَرِ؛ (مُجبِرَةً).[١]

(١) وَعَلَامَةُ الْقَدَرِيَّةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ الْأَثَرِ؛ (مُجبِرَةً). واته: نیشانەی قەدەرییەکان ئەوەیە: بەئەهلی ئەسەر دەڵێن: ئەهلی جەبر.

قەدەرییەکان لەبەرچی بە ئەهلی سوننە دەڵێن جەبری؟

تەبعەن لەبەر ئەوەی ئەهلی سوننە باوەڕیان بە دروستکردنی کردار هەیە لەلایەن پەروەردگارەوە، بەڵام لای قەدەرییەکان بەندەکان خۆیان کردەوەکانی خۆیان دروست ئەکەن، بۆیە بیروباوەڕی ئەوەی کردەوەکانمان مەخلووقە و ﷲ تعالی دروستی کردووە بە خێر و شەڕیەوە لای قەدەرییەکان بریتییە لە جەبر و زۆرلێکردن، لەکاتێکا لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت جەبر بەواتای تەعتیلکردن و پەکخستنی مەشیئەت و ویست و هەڵبژاردنی بەندەکانە بۆ کردەوەکانیان.

جەبرییەکان ئەوانەن پێیان وایە تەواوی کاروکردەوەکانیان کە ئەیکەن بە ویست و ئیرادەی خۆیان نییە، بەڵکوو هەمووی ﷲ تعالی پێیان ئەکات بە چاکە و خراپەوە، بەڵام لای ئەهلی سوننە پێیان وایە بەندەکان مەشیئەت و ئیرادەیان هەیە، ﷲ تعالی دەفەرموێت: (فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ)[٢٦١].

---

([٢٦١]) الكهف : ٢٩.

واتە: جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت. ئەمە جەبرییەکان،.

قەدەرییەکانیش پێیان وایە بەندەکان خۆیان خالیقی کردەوەکانی خۆیانن و، ویست و ئیرادەی ڕەها و موتڵەقیان هەیە، کە خاریجە لە ویست و ئیرادەی ﷲ تعالی.

٤٣- وَعَلَامَةُ الْمُرْجِئَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (مُخَالِفَةً وَنُقْصَانِيَّةً).[1]

---

(١) وَعَلَامَةُ الْمُرْجِئَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (مُخَالِفَةً وَنُقْصَانِيَّةً). واتە: نیشانەی مورجیئەکان ئەوەیە: بە ئەهلی سوننە دەڵێن: پێچەوانان و نوقسانەکان.

مورجیئەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن: موخالیفە، واتە موخالیف و پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەوان لە پێناسە و حەقیقەتی ئیمان، کە لای ئەهلی سوننە (تَارِكُ العَمَل) کافرە، وە بە ئەهلی سوننە دەڵێن: (نوقسانییە)، چونکە ئەهلی سوننەت پێیان وایە: ئیمان کەم ئەکات و زیادیش ئەکات، لای مورجیئەکان ئیمان زیاد و کەم ناکات.

وە بەهەمان شێوە مورجیئەکان بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: (خەواریج) و (تەکفیری)، چونکە ئەهلی سوننە تەکفیری هەڵگرانی کوفر و شیرکی گەورە ئەکەن، بەڵام ئەوان (مُعَطِّلَة) و لەکارخەری تەکفیرن بەحەق و ناحەق، لای ئەهلی سوننە هەرکەس هەڵگری شیرک و کوفرێکی گەورەی ئاشکرا بێت؛ موسڵمان نییە، لای خەواریج هەرکەس تاوانی گەورەی ئەنجامدا جگە لە کوفر و شیرک و هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام وەک: دزی، ڕیبا، کوشتن، داوێنپیسی، عارەق خواردنەوە.. تاد، لای ئەوان ئەمانە کافرن، بە پێچەوانەوە

لای ئەهلی سوننە ئەمانە تاوانی گەورەن و خاوەنەکانیان تەنها بە ئەنجامدانیان کافر نابن، لای مورجیئەکانی سەرەتا کە خەلەف پێیان دەڵێن: (مورجیئەی فوقەهاء)، لای ئەو مورجیئانە **(تَارِكُ العَمَل)** موسڵمان بوو، واتە کەسێک سەری بە فەرزی خوادا نەدایە، تەنها بیروباوەڕی دڵ و وتەی زوبانی هەبوایە، بە موسڵمانیان ئەزانی و، بە ئەهلی سوننەشیان ئەوت: خەواریج، لەبەر ئەوەی **(تَارِكُ العَمَل)**یان بە خاریج و دەرچوو لە دین ئەزانی.

بەڵام لای مورجیئەکانی دوایین و خەلەف سەرباری ئەوەی **(تَارِكُ العَمَل)** بەکافر نازانن، ئەوەش بە موسڵمان ئەزانن کە تەنها بەدەم خۆی بە خۆی ئەڵێ: موسڵمانم، با سەر بە فەرزی خواشدا نەدات، تا ئەو دەقەیەی ئەمرێت موسڵمانە، فیتنە و بیدعە و گومڕاییەکانیشیان زۆر زیاترە لەوانەی کۆن، ئەویش ئەوەیە **(تَارِكُ التَّوحِيد)**یش بەکافر نازانن، واتە کەسێک هەڵگری شیرک و کوفری گەورەیە تەوحیدی وازلێهێناوە، ئەوان ئەمەش بەکافر نازانن، بۆیە ئەبینین کافربوونیان کورتکردۆتەوە لە بەحەڵاڵ دانانی کوفر و بیروباوەڕی قەلب و دڵ! واتە هەرکەس وتە و کردارێکی کوفری گەورە ئەنجام بدات لای ئەوان کافر نابێت، وە هەرکەس تەکفیری هەڵگرانی کوفر و شیرکی گەورە بکات و پێی وابێ کافرن، مورجیئەکان ئەم کەسانە بە خەواریج و تەکفیریی ئەزانن، بۆیە پێویستە بزانین کە بیروباوەڕ و قسەی مورجیئەکانی دواین و خەلەف وەك مورجیئەکانی پێشین نەبوون.

**هێندێك لە بیروباوەڕ و قسەی مورجیئەكانی دواین و خەلەف:**

١- نكووڵیكردنی تەكفیر و ناشیرنكردنی و بەقێزەون نیشاندانی و ترساندنی خەڵكی لێی، تا ئاستی تەعتیلكردن و پەكخستنی، لە كاتێكدا كافركردنی هەڵگرانی كوفر لە ئەسڵی كوفر بە تاغووتە، واتە بەبێ تەكفیری كافران و بەریبوون لێیان، كوفر بە تاغووتیش نایەتەدی، بەڵام ئەمان تەكفیری هەڵگرانی كوفر و شیركی گەورە بە فیتنە و مەنهەجی خەواریج ئەزانن، لەكاتێكدا مورجیئەكانی پێشین هەڵگرانی كوفر و شیركیان بەكافر و موشریک ئەزانی، تەنها (تَارِكُ العَمَل)یان بەكافر نەئەزانی، كەچی ئەهلی سوننەت و ئەسەر و حەدیس زۆر زۆر توند بوون لەسەریان.

٢- لە بیروباوەڕی مورجیئەكانی دواین و خەلەف بریتییە لە بەموسڵمان دانانی موشریكان لە گۆڕپەرستان و شوێنكەوتووانی ڕێبازە كوفرییەكان. تەنها كابرا خۆی بەموسڵمان بزانێ، ئیتر هەڵگری هەر كوفر و شیركێكیش بێت ئەم مورجیئەیە هەر بە موسڵمانی ئەزانێ و تەكفیر لەحەقیدا بە حەڕام ئەزانێ.

٣- نكووڵی وەلاء و بەڕائی عەمەلی و كرداریی ئەكەن، وە كورتی هەڵەیەنن لە خۆشویستن و ڕقلێبوونەوەدا، لای ئەمان زۆركردنی ڕەشایی كافران و موشریكان، واتای وەلاء و بەڕاء نییە گەر لە دڵەوە لەگەڵیان نەبێت.

٤- باوەڕیان وایە ئەوەی وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا الله) ئیتر نابێت بەكافر بزانرێت، هەرچەندە كوفری گەورە گەورەش بكات.

٥- سەرخستنی فیکری عوزر بە جەهل و عوزر دانان بۆ تەواوی شوێنکەوتووانی کوفر و شیرک و تەنانەت ئەوانەشی دژایەتی ئیسلام ئەکەن، بە بیانووی ئەوەی جەهلی هەیە و ئەبێ ئیقامە حوججە بکرێت، بێ شک و گومان ئەوە مەنهەجی مورجیئەکانی دواین و خەلەفە، لە ئەسڵدا ئەمە بیدعەیەکە موعتەزیلەکان دایانهێنا، وە (جاحظ) ئەو بیدعەیەی سەرخست، لە سەردەمی خەلەفیشدا جەرجیسییەکان لە شوێنکەوتووانی داوودی کوڕی جەرجیس، دوژمنە گەورەکانی زانایانی نەجد لەو سەردەمەدا هەستان ئەم بیدعەیەیان تازەکردەوە و سەریانخست، کە بە موتڵەقی و ناحەق عوزریان ئەدا، لەکاتێکدا ئەسڵی ئەم مەنهەجە فیکری موعتەزیلەکان بوو، کە ئەوان عوزر بە جەهلیان نەک ئەدا بە جاهیلەکان بە تەنها، بەڵکوو بە گاور و جوولەکەکانیش، بیروباوەڕیان وابوو جەهل عوزرە لە شیرک و کوفری گەورەدا، لەکاتێکدا لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوە ئیجماعە و لە شیرک و کوفری گەورەدا جەهل عوزر نییە، لە دەیان شوێندا بەڵگەمان هەیە کە الله تعالی کردوێتی بە بەڵگە بۆ بڕینی بیانووەکان، تا ئەوەی مرۆڤەکان هیچ عوزرێکیان نەبێت لە ئەنجامدانی شیرک و کوفرە گەورەکان، ئێرە شوێنی باسکردنی ئەم بابەتە نییە، تەنها ئەوەی لێرەدا گرنکە باسبکرێت ئەوەیە، سەرخستنی فیکری عوزر بە جەهل نیشانەیەکی دیاری مورجیئەکانی خەلەفە.

٦- ئەڵێن: ئیمان بیروباوەڕ و وتە و کردارە، بەڵام کردار مەرج و شەرتی کەمال و کامڵێتییە، واتە: گەر کەسێک هیچ کردەوەیەکیشی نەبێت لەو کردەوانەی تایبەتمەندی دینی پێغەمبەری خوان ﷺ لە ڕووکن و پایەکانی ئیسلام،

ئەوان هەر پێیان وایە ئەو کەسە موسڵمان و ئیماندارە، بەڵام ئیمانەکەی کامڵ نییە، قسە و بیروباوەڕی سەلەف بە فیکری خەواریج ئەزانن، هەرکەس بڵێ: کردار و عەمەل پایەی ئیمانە، ئەوان ئەو قسەیە بە فیکری خەواریج ئەزانن.

٧- درۆ ئەکەن بەدەم سەلەفەوە و خیانتیان لێ ئەکەن، بەوەی دەڵێن سەلەف: "فَرَّقُوا بَينَ الإِيمَانِ والعَمَلِ، وَجَعَلُوا العَمَلَ شَرطَ كَمَالٍ". واتە: سەلەف جیاوازییان کردووە لە نێوان ئیمان و کرداردا، وە کرداریان کردووە بە مەرجی کەماڵی ئیمان.

٨- نکووڵی تەلازوم و پەیوەندی لەنێوان ڕووکەش و دەروون ئەکەن کە ئەهلی سوننەی لەسەرە، لای مورجیئەکان گەر کەسێک پەنا بە (ﷲ)ی پەروەردگار جوێن بە (ﷲ تعالی)ش بدات، کافر نابێت مادام بە حەڵاڵی نەزانیوە، بۆیە ئەبینین یەکێک لە گەورەکانیان ئەڵێ: "سَابُّ اللهِ لَيسَ بِكَافِرٍ، حَتَّى يَستَحِلَّ، لَكِن هُوَ عَاصٍ وَقَلِيلُ تَربِيَّةٍ". واتە: جوێندەر بە ﷲ تعالی کافر نییە، تاکوو بە حەڵاڵی ئەزانێ، بەڵام تاوانبارە و تەربێتی کەمە.

٩- بە موتڵەقی (السَّمع و الطَّاعَة) ئەدەنە کاربەدەستان، دەڵێن پێویستە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری دەسەڵاتداران بکرێت لە هەموو کارێکدا، جا هەر مەنهەج و ڕێبازێک بن و هەڵگری هەر کوفر و شیرکێکبن.

١٠- بە وەلی ئەمر زانینی خەڵکانێک، کە جگە لە ئیسلام مەنهەجیانە.

١١- هەر کەسێکیش لەگەڵ خۆیان نەبێت بە خەواریجی ئەزان.

ئەمانەی باسکرا مەنهەجی مورجیئە دواینەکانن.

## ٤٤- وَعَلَامَةُ الرَّافِضَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (نَاصِبَةً).[(١)]

---

(١) وَعَلَامَةُ الرَّافِضَةِ: تَسْمِيَتُهُمْ أَهْلَ السُّنَّةِ؛ (نَاصِبَةً). واته: نیشانەی ڕافیزەکانیش ئەوەیە بە ئەهلی سوننەت دەڵێن: ناسیبییە و دوژمنانی ئالوبەیت.

وا گومان ئەبەن ئەهلی سوننەت ڕقیان چاندووە دژ بە ئالوبەیت، لە کاتێکدا لە پێشترینی کەسانێک بە ئالوبەیت، ئەهلی سوننەت و جەماعەتن نەک ئەوان؛ چونکە ئەوە ئەوانن دژایەتی و ڕقیان بەرپاکردووە بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و خێزانەکانی، کە جوێنیان پێ ئەدەن و قسەیان پێ ئەڵێن و سووکایەتییان پێ ئەکەن.

وَلَا يَلْحَقُ أَهْلَ السُّنَّةِ إِلَّا اسْمٌ وَاحِدٌ، وَيَسْتَحِيلُ أَنْ تَجْمَعَهُمْ هَذِهِ الْأَسْمَاءُ.[1]

---

(١) وَلَا يَلْحَقُ أَهْلَ السُّنَّةِ إِلَّا اسْمٌ وَاحِدٌ، وَيَسْتَحِيلُ أَنْ تَجْمَعَهُمْ هَذِهِ الْأَسْمَاءُ. واتە: وە نالکێت بە ئەهلی سوننەتەوە ئیللا یەک ناو نەبێت، (کە ئەویش ئەهلی سوننەتە یان ئەهلی ئەسەرە یان ئەهلی حەدیسە یان ئەهلی ئیتتیباعە یان فیرقەی ناجییەیە یان ئەهلی تەوحیدە)، هەموو ئەم نازناوانەش هاوواتان بۆ شوێنکەوتوانی حەقی لەسەربوون، هەرگیز ئەو ناو و ناتۆرانەی ئەهلی بەتاڵ لە ئەهلی سوننەی ئەنێن، ئەهلی سوننە ئەوانەی کۆنەکردۆتەوە.

جا وتنی خەواریجە، یان تەکفیرییە، یان توندەڕەوە، یان موجەسسیمەیە، یان موشەببیهەیە.. هەر شتێکی ترە کە ئەینێن لە شوێنکەوتوانی سەلەف، لەلایەن ئەوانەی لاڕێبوون لە مەنهەجی پێغەمبەری خوا ﷺ، بێگومان لە کۆن و تازە ئەهلی سوننەت بەریین لێی و کۆی نەکردوونەتەوە، ئەوەی ئەهلی سوننەی کۆکردۆتەوە بریتییە لە شوێکەوتنی پێغەمبەری خواو ﷺ ئاساری سەلەف، نەک شوێنکەوتنی حیزب و کوتلە و گرووپ و کەسەکان.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَمِعْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ:(١)

يَأْمُرَانِ بِهِجْرَانِ أَهْلِ الزَّيْغِ وَالْبِدَعِ، يُغَلِّظَانِ فِي ذَلِكَ أَشَدَّ التَّغْلِيظِ.

---

(١) قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَسَمِعْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ: واتە: لە باوکم و ئەبو زوڕعەی ڕازیم بیست.

(٢) يَأْمُرَانِ بِهِجْرَانِ أَهْلِ الزَّيْغِ وَالْبِدَعِ، يُغَلِّظَانِ فِي ذَلِكَ أَشَدَّ التَّغْلِيظِ.
واتە: فەرمانیان ئەکرد بە دابڕان لە بیدعەچی و لاڕێبووان، زۆر پێداگیرییان ئەکرد لە هەجرکردنیان.

بێگومان هەجری ئەهلی بیدعە غیرەیە بەرامبەر بە دینی حەق، بەرامبەر بەو دینەی کە سەلەفی لەسەر بوون، هەجری ئەهلی بیدعە لەپێناو تەمێکردنی ئەوان و گەڕانەوەیانە، هەجری ئەهلی بیدعە لەپێناو سەلامەتی دڵ و نەفس و دەروونە لە شوبهە و گومانەکانیان.

**هەجر لای ئەهلی سوننە:**

بێگومان بابەتی هەجر لای ئەلی سوننە لە چوار لایەنەوە سەیر ئەکرێت، ئەوانیش:

١- لە لایەنی ئەوانەی کە هەجر ئەکرێن.

٢- وە لە لایەنی ئەهلی سوننەوە کە هەجر ئەکەن.

٣- وە لە لایەنی ئەو شتەی کە لە پێناویدا هەجری هەجرکراوەکە ئەکرێت.

٤- وە لە لایەنی (عَامَّة)ەوە، ئەوانەی چواردەوری ئەم بیدعەچییەیان داوە، ئایا کێن؟ زۆرن؟ کەمن؟

جا گەر سەیری مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بکەین دەبینین:

لە لایەنی (مَهجُور)ەوە کە کەسە هەجرکراوەکەیە، حاڵی ئەوانەی هەجر ئەکرێن جیاوازن؛ هەموویان لەسەر یەک حاڵ نین، تێیاندا هەیە بیدعەچییە بەڵام پێگەکەی هی ئەوە نییە کە وەکو کەسێکی بانگخواز و داعی بێت بۆ بیدعەکەی، بۆیە ئەبینین سەلەف جیاوازییان کردووە لە نێوان کەسێک کە داعی بێت بۆ بیدعەکەی و کەسێک داعی نەبێت بۆ بیدعەکەی، وەکو لە [سؤلات أبي داود]دا هاتووە پێشەوا ئەبوو داوود ئەڵێ: "قُلتُ لِأَحمَدَ: يُكتَبُ عَنِ القَدَرِيِّ؟ قَالَ: إِذَن لَم يَكُن دَاعِيَاً". واتە: بە ئەحمەدم وت: فەرموودە لە کەسی قەدەرییەوە دەنووسرێتەوە و وەردەگیرێت؟ وتی: گەر داعی نەبوو دەنووسرێتەوە.

تەبعەن کەسێک هەجر ئەکرێت کە داعی بێت بۆ بیدعەکەی و شەڕەکەی گەورە بێت، بەڵام کەسانێک گەر داعی بیدعە نەبن و، کەسێکی نزیکیان بزانێ گەر نزیک ببێتەوە لێی و ئامۆژگاری بکات ئەگەڕێنەوە لە بیدعەکەیان، بێگومان ئەوکات ئەولاترە تێکەڵاوییان بکرێت تا ئەگەڕێنەوە لە کردارەکەیان، نەک سەرەتا هەجریان بکرێت.

ئینجا ئەو کەسەشی کە هەجر ئەکرێت، گەر حەقی سیلەی ڕەحمیان لەسەربوو یان حەقی چاکەکاریان لەسەربوو گەر کەسێکی کافریش بێت، بۆ نموونە: دایک و باوک، لەم کاتەدا هەجری ئەوانە شەرعی نییە، بەڵکوو موخاڵەتە و تێکەڵییان ئەولاترە، بەمەرجێ کار نەگاتە ئەوەی بەرەو کوفر و شیرکت بەرن، ئەوکات لەوانەدا بەقسەیان ناکەیت، کەواتە ئەبێت ئاوها مەنزیلە و پێگەی مەهجوورەکەش لە هەجرەکەدا بزانین.

پاشان لە لایەن (هَاجِر)یشەوە کە کەسی هەجرکەر ئەگرێتەوە حاڵەتەکە ئەگۆڕێت، ئایا ئەو کەسەی کە هەجرەکە ئەکات کاریگەری هەیە لەسەر هەجرکراوەکە؟ یان هیچ کاریگەرییەکی باشی نییە، بەڵکوو شەڕی زیاتر ئەکات؟ بۆیە ئەبینین لەناو ئەهلی سوننەتدا کەسانێک پلەوپێگەیەکیان هەبووبێ هەجری کەسانێکی ئەهلی بیدعەیان کردبێ و بووبێ بە هۆکاری گەڕانەوەیان لە بیدعەکەیان، بێگومان ئەوە ئەولاتر بووە، بەڵام کەسانێکی دیکە کە هەجری ئەهلی کەبائیر و تاوانەکان بکەن، ببێتە هۆی شەڕیان، بێگومان لەوکاتەدا مرۆڤ

پێویسته حیکمەت بەکاربهێنێت و بزانێت چ کاتێک هەجر ئەکات و چۆن ئەیکات و لەگەڵ کێدا هەجر ئەکات.

پاشان لایەنی دواتر سەیری (مَهجُورٌ لأَجلِهِ) ئەکرێت، واتە: ئەو شتەی کە لە پێناویدا هەجری هەجرکراوەکە ئەکرێت، جا تاوانی گەورەبێ یان بیدعە، پێویستە تاوانەکە تاوانێکی گەورەبێ و بیدعەکە بیدعەیەکی موغەللەزە بێت، لەسەر تاوانی بچووک هەجری مرۆڤی موسڵمان ناکرێت.

بۆیە ئەبێ بزانین لە پێناو چیدا کەسەکە هەجر ئەکەین، پێویستە لەپێناو تاوانی گەورە و بیدعەی توندا کەسەکە هەجر بکەین، نەک لەسەر تاوانی بچووک.

پاشان سەیری (جِهَةُ العَامَّة)ش ئەکەین بزانین کێ چواردەوری ئەم بیدعەچییەی داوە، گەر موبتەدیعێک چواردەورەکەی کەسانێکی زۆری ئەهلی سونئە بوو ئەوە وا ئەکات لەو خەڵکە ئەو موبتەدیعە بە حەق بزانن، گەر کەسێک کەسانێکی زۆر دەوریان نەدابێ حاڵەتەکەی ئەگۆڕێت.

وَيُنْكِرَانِ وَضْعَ الْكُتُبِ بِرَأْيٍ فِي غَيْرِ آثَارٍ.(١)
وَيَنْهَيَانِ عَنْ مُجَالَسَةِ أَهْلِ الْكَلَامِ.(٢)
وَالنَّظَرِ فِي كُتُبِ الْمُتَكَلِّمِينَ، وَيَقُولَانِ: لَا يُفْلِحُ صَاحِبُ كَلَامٍ أَبَدًا.(٣)

---

(١) وَيُنْكِرَانِ وَضْعَ الْكُتُبِ بِرَأْيٍ فِي غَيْرِ آثَارٍ. واته: ڕێگرییان ئەکرد لە نووسینی کتێب بەبێ ئەسەر، واتە: ڕێگرییان ئەکرد کتێبیک بنووسرێت و ئەسەری تێدا نەبێت، ئیمامی ئەحمەدیش ڕێگری کردووە لە نووسینی کتێب کە لەسەر ئەساسی ئەسەر نەبێت، وە ڕێکخستنی کتێبەکە هەمووی عەقڵکاری بێت، وەک زۆرێک لەو کتێب و مەتنانەی کە خەلەف و دوایینەکان نووسیان لە زانستەکاندا.

(٢) وَيَنْهَيَانِ عَنْ مُجَالَسَةِ أَهْلِ الْكَلَامِ. واته: ڕێگرییان کردووە لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی کەلام.

(٣) وَالنَّظَرِ فِي كُتُبِ الْمُتَكَلِّمِينَ، وَيَقُولَانِ: لَا يُفْلِحُ صَاحِبُ كَلَامٍ أَبَدًا. واتە: ڕێگرییان کردووە لە سەیرکردنی پەرتووک و نامیلکەی موبتەدیعەکان لە ئەهلی کەلام و، ئەیانوت: ئەهلی کەلام هەرگیز سەرفراز نابن.

ئەسڵ وایە ئەهلی سوننەت و جەماعەت و خوێنداکارانی زانستی شەرعی دووربن لە سەیرکردنی کتێبەکانی موبتەدیعەکان؛ چونکە زانستی لەپاش بەجێماوی سەلەف ئەوەندە زۆرە، گەر خوێندکاری زانست تەواوی تەمەنی تەرخان بکات بۆ خوێندنەوەیان هێشتا فریای ناکەوێت، بۆیە سەرقاڵ بوون بە پەرتووکی ئەهلی فەلسەفەکان و گومڕایان دروست نییە، تەنها بۆ تەعقیب و ڕەخنە لێگرتن و ڕەددانەوەیان نەبێت.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَبِهِ أَقُولُ أَنَا.[١]

(١) قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَبِهِ أَقُولُ أَنَا. واتە: باوکی موحەممەد کە (إبن أبي حاتم)ە وتی: منیش بەم شێوەیە ئەڵێم و ئەمە بیروباوەڕی منە.

ئەوەی کە باسکرا هەمووی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، وە هەمووی کۆدەنگی و ئیجماعاتی عەقەدی و بیروباوەڕییە، بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

**ئێمەش دەڵێین:**

بێگومان ئەوەی باسکرا قسە و بیروباوەڕ و مەنهەجمانە، داواکارین لە پەروەردگار و لێی ئەپاڕێینەوە بۆ خاتری ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرزەکانی بمانگێڕێ لەو کەسانەی کە بەحەق شوێنی سەلەفی ساڵح ئەکەوین، دین و مەنهەج و بیروباوەڕمان ئەو دین و مەنهەج و بیروباوەڕەبێ کە سەلەف پەیڕەوییان لێکرد و لەسەری بوون، وە حەق بە حەق ببینین و شوێنی بکەوین، وە بەتاڵیش بە بەتاڵ ببینین و لێی دووركەوینەوە.

اللَّهُمَّ آمِين! وَصَلِّ اللهُ وَسَلَّمَ وَبَارَكَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ نَبِّينَا مُحَمَّد.



# ڕاڤەی
# "عَقِيْدَةُ أبي حاتِم الرَّازي"

# "مَتنُ عَقِيْدَةِ أبي حاتِم الرَّازي"

قال إبنُ أبي حاتِم الرَّازِيِّ: "ووَجَدْتُ فِي بَعْضِ كُتِبِ أَبِي حَاتِمٍ مُحَمَّدِ بْنِ إِدْرِيسَ بْنِ الْمُنْذِرِ الْحَنْظَلِيِّ الرَّازِيِّ -رَحِمَهُ اللَّهُ- مِمَّا سَمِعَ مِنْهُ: يَقُولُ:

١- مَذْهَبُنَا وَاخْتِيَارُنَا اتِّبَاعُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ بِإِحْسَانٍ.

٢- وَتَرْكُ النَّظَرِ فِي مَوْضِعِ بِدَعِهِمْ.

٣- وَالتَّمَسُّكُ بِمَذْهَبِ أَهْلِ الْأَثَرِ: مِثْلِ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، وَإِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، وَأَبِي عُبَيْدٍ الْقَاسِمِ بْنِ سَلَّامٍ، وَالشَّافِعِيِّ.

٤- وَلُزُومُ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ.

٥- وَالذَّبُّ عَنِ الْأَئِمَّةِ الْمُتَّبِعَةِ لِآثَارِ السَّلَفِ، وَاخْتِيَارُ مَا اخْتَارَهُ أَهْلُ السُّنَّةِ مِنَ الْأَئِمَّةِ فِي الْأَمْصَارِ مِثْلُ: مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ فِي الْمَدِينَةِ، وَالْأَوْزَاعِيِّ بِالشَّامِ، وَاللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ بِمِصْرَ، وَسُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَحَمَّادِ بْنِ زِيَادٍ بِالْعِرَاقِ، مِنَ الْحَوَادِثِ مِمَّا لَا يُوجَدُ فِيهِ رِوَايَةٌ عَنِ النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- وَالصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ.

٦- وَتَرْكُ رَأْيِ الْمُلْبِسِينَ الْمُمَوِّهِينَ الْمُزَخْرِفِينَ الْمُمَخْرِقِينَ الْكَذَّابِينَ.

٧- وَتَرْكُ النَّظَرِ فِي كُتُبِ الْكَرَابِيسِ، وَمُجَانَبَةُ مَنْ يُنَاضِلُ عَنْهُ مِنْ أَصْحَابِهِ وَشَاجَرَ فِيهِ مِثْلِ دَاوُدَ الْأَصْبَهَانِيِّ وَأَشْكَالِهِ وَمُتَّبِعِيهِ.

٨- وَالْقُرْآنُ كَلَامُ اللَّهِ وَعِلْمُهُ وَأَسْمَاؤُهُ وَصِفَاتُهُ وَأَمْرُهُ وَنَهْيُهُ، لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ بِجِهَةٍ مِنَ الْجِهَاتِ.

٩- وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ مَخْلُوقٌ مَجْعُولٌ؛ فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ، كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ. وَمَنْ شَكَّ فِي كُفْرِهِ مِمَّنْ يَفْهَمُ وَلَا يَجْهَلُ، فَهُوَ كَافِرٌ. ومن كان جاهلا، علم، فإن أذعن بالحق بتكفيره، وإلا ألزم الكفر".

١٠-وَالْوَاقِفَةُ وَاللَّفْظِيَّةُ جَهْمِيَّةٌ، جَهَّمَهُمْ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ إمامنا وإمام المسلمين.

١١-وَالِاتِّبَاعُ لِلْأَثَرِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَنِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ بَعْدَهُمْ بِإِحْسَانٍ.

١٢-وَتَرْكُ كَلَامِ الْمُتَكَلِّمِينَ، وَتَرْكُ مُجَالَسَتِهِمْ وَهِجْرَانُهُمْ.

١٣-وَتَرْكُ مُجَالَسَةِ مَنْ وَضَعَ الْكُتُبَ بِالرَّأْيِ بِلَا آثَارٍ.

١٤-وَاخْتِيَارُنَا أَنَّ الْإِيمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، إِقْرَارٌ بِاللِّسَانِ وَتَصْدِيقٌ بِالْقَلْبِ وَعَمَلٌ بِالْأَرْكَانِ، مِثْلُ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ لِمَنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، وَالْحَجِّ لِمَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا، وَصَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ، وَجَمِيعِ فَرَائِضِ اللهِ الَّتِي فَرَضَ عَلَى عِبَادِهِ، الْعَمَلُ بِهِ مِنَ الْإِيمَانِ. وَالْإِيمَانُ يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.

١٥-وَنُؤْمِنُ بِعَذَابِ الْقَبْرِ.

١٦-وَبِالْحَوْضِ الْمُكْرَمِ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

١٧-وَنُؤْمِنُ بِالْمُسَاءَلَةِ فِي الْقَبْرِ.

١٨-وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ.

١٩-وَبِالشَّفَاعَةِ الْمَخْصُوصِ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٢٠-وَنَتَرَحَّمُ عَلَى جَمِيعِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَا نَسُبُّ أَحَدًا مِنْهُمْ، لِقَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: {وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ}.

٢١-وَالصَّوَابَ نَعْتَقِدُ وَنَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ: {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ} [الشورى: ١١].

٢٢-وَلَا نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى الْأَئِمَّةِ وَلَا نُقَاتِلُ فِي الْفِتْنَةِ، وَنَسْمَعُ وَنُطِيعُ لِمَنْ وَلَّى اللهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمْرَنَا.

٢٣-وَنَرَى الصَّلَاةَ وَالْحَجَّ وَالْجِهَادَ مَعَ الْأَئِمَّةِ، وَدَفْعَ صَدَقَاتِ الْمَوَاشِي إِلَيْهِمْ.

٢٤-وَنُؤْمِنُ بِمَا جَاءَتْ بِهِ الْآثَارُ الصَّحِيحَةُ، بِأَنَّهُ يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ مِنَ الْمُوَحِّدِينَ بِالشَّفَاعَةِ.

٢٥-وَنَقُولُ: إِنَّا مُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَكَرِهَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ أَنْ يَقُولَ: أَنَا مُؤْمِنٌ حَقًّا عِنْدَ اللَّهِ وَمُسْتَكْمِلُ الْإِيمَانِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُ الْأَوْزَاعِيِّ أَيْضًا.

٢٦-وَعَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ.

٢٧-وَعَلَامَةُ الْجَهْمِيَّةِ أَنْ يُسَمُّوا أَهْلَ السُّنَّةِ مُشَبِّهَةً وَنَابِتَةً.

٢٨-وَعَلَامَةُ الْقَدَرِيَّةِ أَنْ يُسَمُّوا أَهْلَ السُّنَّةِ مُجَبِّرَةً.

٢٩-وَعَلَامَةُ الزَّنَادِقَةِ أَنْ يُسَمُّوا أَهْلَ الْأَثَرِ حَشْوِيَّةً. وَيُرِيدُونَ إِبْطَالَ الْآثَارِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

وَفَّقَنَا اللَّهُ وَكُلَّ مُؤْمِنٍ لِمَا يُحِبُّ وَيَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ، وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَسَلَّمَ.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف المرسلين، سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعه بإحسان إلى يوم الدين. أما بعد:

دەست بە ڕاڤەکردنی کیتابی (عەقیدەی ئەبو حاتەمی ڕازی) دەکەین، کە ناوی خۆی (موحەممەدی کوڕی ئیدریسی حەنزەلییە)، لە ساڵی (٢٧٧ھ) وەفاتی کردووە.

تەبعەن ئیمامی "اللالكائي" ئەم عەقیدەمان بۆ ڕیوایەت ئەکات، لە کیتابەکەی کە (شەرحی ئوسوولی ئیعتیقادی ئەهلی سوننەیە).

ئیمامی لالەکائی لە کیتابی بنچینەکانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە دەگێڕێتەوە لە ئیمامی (ئیبو ئەبی حاتەم) کە دەفەرمووێت: "وجدت في بعض كتب أبي حاتم محمد بن إدريس المنذر الحنظلي الرازي -رحمه الله- مما سمع منه ويقول:

واتە: دەستم کەوتووە و بینیومەتەوە لە هەندێك لە کیتابەکانی ئەبو حاتەم کە ناوی (موحەممەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی مونزیری حەنزەلی ڕازییە) لەوەی کە لێی بیستراوە دەفەرمووێی:

"مذهبا و اختيارنا و ما نعتقده و ندين الله به و نسأله السلامة في الدين والدنيا".

ڕێگا و ڕیباز و هەڵبژاردەمان و ئەوەی کە بیروباوەڕمانە و دینداریەتی پێ دەکەین بۆ ﷲ تعالی وە داوای سەلامەتی دین و دونیای لێ دەکەین، بریتییە لە:

## یەکەم:

## " اتِّبَاعُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ بِإِحْسَانٍ ".

---

راڤەکەی:

.شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا و -صلى الله عليه وسلم- هاوەڵانی و ئەوانەشی کە شوێن ئەوان کەوتوون بە باشترین شێوە.

تەبعەن ئەم سێ جیلە پێی دەوترێت "سەلەف"، وە شوێنکەوتنی ئەوان و گەڕانەوە بۆ دینداریێتی ئەوان، لەپێشترین شتێکە کەوا شەیدای حەق بیکاتە دەستپێك، چونکە بەبێ خۆ تەسلیمکردن و ئیتتیباع بۆ سەلەف، مەحاڵە بتوانرێت حەق وەك خۆی بدۆزرێتەوە و ئینسان پێی بگات، گەڕانەوە بۆ سەلەف بەڕاستی و ئیتتیباعی ئەوان، نهێنی گەیشتن و دۆزینەوەی حەق و بەختەوەری دونیا و دواڕۆژە.

بۆیە دەبێت بەئاگا بین! سەلەف ناوێك نییە بۆ نازناو و خۆدانەپاڵ و تەزکییە! بەڵکوو مەنهەجێکە بۆ عەمەلکردن و دینداریێتی، زۆرن ئەوانەی کە خۆیان ئینتیساب ئەکەن بۆ سەلەف، بەڵام عەقیدە و بیروباوەڕ و سولوك و مەنهەجی دینداریێتییان خراپترینی خەلەفە، خۆیان ئەدەنە پاڵ سەلەف، بەڵام باوەڕیان وایە کەوا بە موجەڕەدی خۆ بە موسڵمان زانین و شایەتومان هێنان ئیتر ئیسلامەتی بۆ

کەسەکان جێگیر ئەکرێت، ئەگەر تەرکی تەواوی پایەکانی ئیسلامیشیان کردبێت، وە (تارك العمل) لایان موسڵمانە!

لەکاتێکدا لای سەلەف کردەوەی لاشە و عەمەلکردن بە پایەکانی ئیسلام، ڕوکن و پایەی دانەبڕاوی ئیسلام بوون، بەبێ عەمەل ئەو کەسە لەلایان کافر بووە.

وە خەڵکانێك هەن خۆیان ئەدەنە پاڵ سەلەف و خۆیان ئینتیساب ئەکەن بۆلای سەلەف و، تەزکییەی خۆیانی پێ ئەکەن، بەڵام ویلایەتی شەرعی ئەدەنە سەرانی عەلمانییەت و پەکخەرانی شەریعەتی ئیسلام، شانازی بە نزیکی و تێکەڵی ئەوانەوە دەکەن، لەکاتێکدا سەلەف خۆیان بە دوور ئەگرت لە دەسەڵاتدارە موسڵمان و خەلیفەکان، وە بەسووکی دینیان ئەزانی کە ئەهلی عیلم نزیکی بەردەرکی سولتانەکان ببنەوە و تەنازولیان بۆ بکەن، ئەسڵەن زۆرینەی زانا گەورەکانی سەلەف فیرابوون (هەڵاتبوون)، لە غوربەت و غەریبایەتی و ئەشکەنجە و ناڕەحەتی دابوون لە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکانەوە، چجای غەیرە موسلمانەکان!

کەواتە دەبێت بەئاگابین سەلەف ئەو سێ جیلە پاکەیە کە پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- شایەتی خەیریەتی بۆ داون کە ئەسحابە و تابیعین و تابیعی تابیعینن، وە بە حەقیقەت نهێنی دۆزینەوەی حەق بریتییە لە: گەڕانەوە بۆ ئەو دینداریەتییەی کە ئەوانەی لەسەر بووە، هەر بۆیە دەبینین کەوا یەکەم خاڵ کە ئیمام ئەبو حاتەمی ڕازی دەیهێنێت، بریتییە لە ئیتتیباعی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم-، وە ئیتتیباعی هاوەڵەکانی و تابیعینی دوای ئەوانیش بە چاکە.

دووەم:

" وَتَرْكُ النَّظَرِ فِي مَوْضِعِ بِدَعِهِمْ ".

---

راڤەکەی:

وازهێنان لە سەیرکردنی شوێنی لادان و شتە داهێنراوەکانی ئەوان.

کاتێك کە بریار بێت بە حەق شوێن سەلەف بکەوین، پێویستە واز لە سەیرکردن و خۆمەشغوڵکردن بهێنین لەو فیکر و لادانەی کە لادەران لە ڕێبازی سەلەف نووسیوویانە، وە بانگەشەکردنی شوێنکەوتنی سەلەف تەنها بانگەشەیە؛ ئەگەر سەرانی جەهمییەت و ئیرجاء بە ئیمام و پێشەوای خۆمان بزانین و تەقدیس و تەعزیمیان بکەین، بە گەورەدانان و بە گرینگدانانی سەلەف و بیروباوەڕیان، لەگەڵ بە گەورەزانینی بیدعەکان لە خەلەف لە دڵێکدا کۆنابێتەوە و گونجاو نییە، بۆیە هەتاوەکو تەخلیەی دڵ و دینداریێتیمان نەکەین لە سەیرکردنی کتێبەکانی خەلەف -ئەوانەیان کە پێچەوانەی سەلەف بوون-، مەحاڵە بتوانین هەڵگری حەق بین، بۆیە ناکرێت سەلەف بە مەرجەعی دینداریەتی خۆمان بزانین و، دینیش وەربگرین لەوانەی کە بانگەشەکاری جەهمییەت و ئیرجاء و ئەشعەرییەتن، وە عوزر بۆ بیروباوەڕی خراپیان بهێنینەوە، بۆیە دەبێت دووربکەوینەوە لە شوێنی بیدعەی ئەوانەی کە لاڕێ بوون لە مەنهەجی سەلەف.

سێیەم:

" وَالتَّمَسُّكُ بِمَذْهَبِ أَهْلِ الْأَثَرِ: مِثْلِ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، وَإِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، وَأَبِي عُبَيْدٍ الْقَاسِمِ بْنِ سَلَّامٍ، وَالشَّافِعِيِّ ".

---

ڕاڤەکەی:

لە بیروباوەڕ و دینداریتیمان دەستگرتنە بە مەزهەبی ئەهلی ئەسەرەوە.

ئەسەر: بریتییە لەوەی کە بۆمان بەجێماوە و ماوەتەوە لە سەلەفەوە لە بیروباوەر و قسەو کرداریان وەك دینداریتی، بە نموونە:

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل:**

ئیمامی گەورەی ئەهلی سوننە کە لەساڵی (١٦٤ھ) لە دایك بووە و، لەساڵی (٢٤١ھ) لە تەمەنی (٧١) ساڵیدا وەفاتی کردووە لە سەردەمی خەلافەتی عەبباسییەکان، وە لە سەردەمی خەلیفە (مەئموون و موعتەسەم و واسیق)دا ژیاوە، کە هەڵگری بیروباوەڕی موعتەزیلەکان بوون، ئەوان باوەڕیان وابووە کە قورئان مەخلووق و دروستکراوە، وە لەسەر فیتنەی خەلقی قورئان ئیمامی ئەحمەد زیندانیکراوە و، ناڕەحەتی و ئەشکەنجەی زۆری دیتووە، وە بەهیچ شێوەیەك تەنازوولی لە حەق وتن و هەڵگرتنی حەق نەکردووە لە ترسی

دەسەڵاتداران، وە جگە لە زیندانی و ئەشکەنجەدان، ڕێگری لێکراوە لە دەرسدان و دەرس وتنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەدان قوتابی دوای خۆیی پەروەردە کردووە، وە چەندین کتێبی گرینگی نوسیووە، لەوانە: (المسند) کە مەوسوعەیەکی گەورەیە، نزیکەی ٣٠ هەزار فەرموودەی لەخۆگرتوە.

ئیمامی ئەحمەد لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا ئەچێتە خزمەتی ئیمامی گەورە (هوشەیمی کوڕی بەشیر) کە ئەبو حازمی واسیتیان پێ وتووە، کە لە ساڵی (١٨٣ھ) وەفاتی کردووە، لەبەر دەستی ئەم ئیمامەدا تەڵەبی عیلمی کردووە، وە لە هەمان کاتدا لە خزمەتی ئیمامی گەورە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدیش خوێندویەتی.

لە ساڵی (١٨٦ھ) دەست دەکات بە کۆچ و ڕیحلەتی عیلمی بۆ شارەکانی تری عێراق و حیجاز و توهامە و یەمەن و ڕەی، وە لە مەککە بە خزمەتی ئیمامی شافیعی دەگات و زانستی لێ وەردەگرێت، دواتریش کە شافیعی دێتەوە بۆ بەغداد لە خزمەتیدا دەبێت تاوەکوو دەڕواتەوە.

لەگەڵ ئیمامی یەحیای کوڕی مەعین کە هاوڕێیتی ئەچێتە خزمەتی ئیمامی گەورەی یەمەنی عەبدوڕڕەزاقی سەنعانی خاوەنی (مصنف) لەوێ لە خزمەتیدا تەڵەبی عیلم ئەکات، هەتا هێزوقووەتی گەڕانی تێدابوو، لە ڕیحلەت و فێربوون و چوونە خزمەتی زانایان ڕانەوەستاوە و بەردەوام بووە لە فێربوونی شتی تازەدا هەتا وەفاتیشیکرد، وە لە تەواوی شارەکانیشەوە قوتابییانی عیلم ئەچوون بۆلای

و مەجلیسی عیلمی فراوان بوو، وە هەزاران قوتابی عیلمی فێری فەرموودە و فیقە و دینی اللَّهُ تعالى دەبوون، لەوانە:

ئەبو بەکری مەڕوەزی، ئەبو بەکری ئەسرەم، ئەحمدی کوڕی موحەممەدی هانیئ، حەربی کوڕی ئیسماعیلی کرمانی، ئیبراهیمی کوڕی ئیسحاقی حەربی، ئەبو یەعقووبی کەوسەر، ئەبو داوودی سیجستانی، موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری، موسلیمی کوڕی حەججاج، عەبدوڵڵا و ساڵحی کوڕی، مامی کە ناوی ئیسحاقە، ئامۆزاکەی کە ناوی حەنبەل بووە، جگە لەمانیش کە زۆر بوون.

جا کە دەفەرموێت: "**والتمسك بمذهب أهل الأثر**". واتە: دەستگرتن بە ڕێگا و مەنهەجی ئەهلی ئەسەر، وێنەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و وێنەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم.

## ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم:

کە ناسراوە بە ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی ئیمامی ڕۆژهەڵاتی زەوی بوو کە تورکمانستانە، لە ساڵی (١٦١هـ) لە دایك بووە، لەساڵی (٢٣٨هـ) لە نەیسابوور وەفاتیکردووە، واتە: سێ ساڵ پێش وەفاتی ئیمامی شافیعی وەفاتی کردووە.

لەبەر دەستی ئیمامە گەورەکانی ئیسلام وەك: عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك و سوفیانی کوڕی عویەینە و شافیعی و وەکیعی کوڕی جەڕڕاح و عەبدوڕڕزاقی سەنعانی و فوزەیلی کوڕی عیاز و ئیبنو وەهب و ئەبو بەکری کوڕی عەییاش و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدی و، سەدانی تر لە گەورە زانایان ئەم پیاوە بەرێزە

تەڵەبی عیلمی لەلایان کردووە.

مامۆستای گەورە زانایانی وەکوو: بوخاری و موسلیم و ئەبو داوود و تورمزی و نەسسائی بووە، وە ئیمامی گەورەی تەواوی خۆراسان و ڕۆژهەڵات بووە، وێنەی ئیمامی ئەحمەد.

خاوەنی موسنەدێك و تەفسیرێکی گەورەیە و چەندین کتێبی تریشی هەیە.

تەبعەن ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی بەپاڵنەر و هەوێنی نووسینی سەحیحی بوخاری دائەنرێت، چونکە ڕۆژێکییان لە مەجلیسی عیلمیدا دەڵێت: "خۆزگە کەسێك هەڵسایە کتێبێکی پوختی بنووسیبایە لە فەرمووده سەحیحەکاند". ئەم قسەیە ئەچێتە دڵی ئیمامی بوخاری و دەست ئەکات بە نووسینی سەحیحەکەی.

ئینسانی سوونی مەزهەب دەبێت شوێنی وێنەی ئەم پیاوە گەورانە بکەوێت!

## ئەبو عوبەیدی قاسمی کوڕی سەللام:

ئیمامی گەورە قاسمی کوڕی سەللامی هەرەویی کە لە شاری هەرات لە ئەفغانستان لە ساڵی (١٥٧هـ) لەدایك بووە، وە لە ساڵی (٢٢٤هـ) لە مەککەدا وەفاتی کردووە.

ئەم پیاوە بەرێزە لەلای هوشەیمی کوڕی بەشیر کە مامۆستاکەی ئیمامی ئەحمەد بوو خوێندوویەتی و، لەلای سوفیانی کوڕی عویەینە و یەزیدی کوڕی هارون و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدی و یەحیای قەتتان و ئیسماعیلی کوڕی عەییاش و کیسائی و فەڕاء و ئەسمەعی و جگەلەمانەش تەڵەبی عیلمی کردووە.

ئیمام ئیبنو ئەبی دونیا و بوخاری و داریمی و سەدان لە گەورە زانایانی فەرمووده چونەتە خزمەتی و تەڵەبی عیلمیان لەلا کردووە.

کۆمەڵێك کتێبی لە زانستەکانی قورئان و فەرمووده و زمانی عەرەبیدا نووسیوە، وەکوو: (الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم)، وە (غريب الحديث).

تەبعەن ئیمامی ئەهلی سوننە بووە لە زانستەکانی قورئان و فەرمووده و جەرح و تەعدیل و زمانی عەرەبی.

وێنەی ئائەمانە، ئەبێت سوننی مەزهەب شوێنیان بکەوێت.

## موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی شافیعی:

ئیمامی گەورەمان شافیعی، کە لە وڵاتی شام لە شاری غەززە لە ساڵی (١٥٠هـ) لە دایك بووە، لە ساڵی (٢٥٠هـ) لە میسرِ وەفاتی کردووە، وە لە تەمەنی دە ساڵیدا تەواوی کیتابی "موطأ"ی ئیمامی مالیکی لەبەرکردووە.

لەبەردەستی ئیمامی گەورە ئیمامی ئەهلی مەدینە کە ئیمام مالیکە تەڵەبی عیلمی کردووە، وەهەروەها لەلای وەکیعی کوڕی جەڕڕاح و سوفیانی کوڕی عویەینە و حەممادی کوڕی ئوسامە و عەبدوڵڵای سائیغ و عەبدولعەزیزی دەراوەردی و چەندین زانای تری ئوممەت، تەڵەبی عیلمی کردووە و عیلمی لێیانەوە وەرگرتووە، وە لە تەواوی مەزهەب و رێچکەکان شارەزا بووە.

تەبعەن ئیمامی شافیعی هەڵسا بە نووسینی بناغەی زانستی ئوسووڵی فیقه و، بنەماکانی زانستی شەریعەت ئەو داینا، کە کیتابێك بوو بە ناوی (الرسالة)

دووجار ئیمام ئەم کیتابەی نووسی، جارێکیان لە بەغداد و جارێکیتریان کە گەڕایەوە بۆ میسڕ نووسیەوە.

وە کتێبە گەورە بە نرخەکەی کە کتێبی (الأم)ە، شایەتی فراوانی و گەورەیی زانستەکەیەتی، وە دەرخەری پێگەیەتی لە زانستە شەرعییەکاندا.

وەهەروەها دەستی نووسینی شیعریشی هەبووە.

ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێت: ئەگەر بابەتێك خەبەر و فەرموودەم تێیدا دەست نەکەوتایە، بە وتەی شافیعی فەتوام ئەدا و ئەمکردە بەڵگە؛ چونکە ئیمامێکی گەورەی قورەیشی بوو.

ڕیوایەتیش کراوە کە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- فەرمووبێتی زانایەکی قورەیشی تەواوی سەرزەوی پر دەکات لە زانست، ئیمامی ئەحمەد پێی وابووە شافیعی ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- باسی کردووە.

بۆیە دەستگرتن بە ڕێباز و دینداریتی ئەم گەورە پیاوانە لە بیروباوەڕ و دینداریتی سەلەفەوەیە، سوننی کەسێکە کە قەدروقیمەتی زانایانی ئەووەڵینی ئوممەتی لابێت و، لە قسە و فەتوای ئەوان لانەدات بۆ خەلەف و هەڵگرانی عیلمی دوایی، گومڕایی و سەرگەردانییە بۆ بابەت و شیکاری مەسئەلەکان لە قسە و فەتوای زانایانی سەلەف لابدەین بۆ خەلەف، وە پێمان وابێت کە خەلەف زانستیان فراوانترە لە سەلەف!

## چوارەم:

## " وَلُزُومُ الْكِتَابِ وَالسُّنَّة ".

---

راڤەكەی:

لە بیروباوەڕ و دینداریەتیمان پەیوەست بوونە بە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم-، وە وەرگرتنی دینە لێیانەوە.

بەپێچەوانەی ئەهلی ڕەئی كە حیساب بۆ بەڵگەكان ناكەن و، سەرچاوەی وەرگرتنی دینیان عەقڵ و بیروبۆچوونی خۆیانە، وە پێچەوانەی دژە سونەتییەكانیش كە فەرموودە بە سەرچاوەی وەرگرتنی دین نازانن و، بانگەشەی تەنها قورئان سەرچاوەیە دەكەن، دژی فەرموودە شوبهە و گومانەكان بڵاودەكەنەوە.

لای ئەهلی سونە فەرموودە سەحیحەكان وەك قورئان بنچینەی بەڵگە هێنانەوەی دیندارێتییە لە بیروباوەڕ و شەریعەتدا، بەڵكوو ئاساری سەلەفیش كە بریتییە لە فەتوا و كرداری سێ جیلی ئەووەڵینی ئوممەت، لە شتانێك كە بەڵگەی تەواو و وازح لە قورئان و فەرموودەمان دەست نەكەوێت، ئەوەش بەڵگەی دیندارێتییە لای ئەهلی سونە؛ چونكە ئاساری سەلەف ڕەنگدانەوەی قورئان وفەرموودەكانە لە ئەرزی واقیعدا لە ناو ئەو سێ جیلە پاكەی كە پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- شایەتی چاكەی بۆ داوون.

بەپێچەوانەی زاهیرییە جەهەمی و مورجیئەکانەوە کە هیچ حیساب و سەنگێك بۆ ئاساری سەلەف دانانێن لە بابەتێکدا کە دەلیلی وازح نەبێت و دەستییان نەکەوێت، شوێن عەقل و بیروبۆچوونی خۆیان دەکەون بە بێ گەڕانەوە بۆ قسە و کرداری سەلەف کە پێی دەوترێی ئاسار، بەڵکوو ئامادەن شوێن قسە و فەتوا و تەڕجیحاتی کەسانێکی سەردەمی بکەون وە پێشی بخەن بەسەر ئاساری سەلەفدا، ئەگەر بشچنە ناو ئاسارەوە وەك حیسابی فەرموودە بە ناوی تەسحیح و تەزعیفەوە، شەن و کەوی بابەتەکان دەکەن و پەڕوباڵی ئاسارەکان دەکەن، لە کاتێکدا ئەهلی سوننە هەڵوێستیان بۆ ئاسار وەك هەڵوێستیان نەبووە بۆ فەرموودەکان، ئەگەر بەهەمان نەفەس و تێڕوانین بۆ فەرموودەکان بڕوانینە ئاسار، ڕەنگە دەیان بەرگی وەك کتێبی موسەننەفی سەنعانی و ئیبنو ئەبی شەیبە چەند بەرگێکی بچووکی لێ بمێنێتەوە.

بۆیە لە بنچینە و ئوسووڵی ئیستیدلالەوە دەزانین کە ئەهلی سوننە و سەلەف کێن؟

وە شوێنکەوتوانی ئەهلی بیدعە و گومڕاییش کێن؟

پێنجەم:

" وَالذَّبُّ عَنِ الْأَئِمَّةِ الْمُتَّبِعَةِ لِآثَارِ السَّلَفِ، وَاخْتِيَارُ مَا اخْتَارَهُ أَهْلُ السُّنَّةِ مِنَ الْأَئِمَّةِ فِي الْأَمْصَارِ مِثْلُ: مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ فِي الْمَدِينَةِ، وَالْأَوْزَاعِيِّ بِالشَّامِ، وَاللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ بِمِصْرَ، وَسُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَحَمَّادِ بْنِ زِيَادٍ بِالْعِرَاقِ، مِنَ الْحَوَادِثِ مِمَّا لَا يُوجَدُ فِيهِ رِوَايَةٌ عَنِ النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- وَالصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ".

---

ڕاڤەکەی:

لە بنچینەی دینداریێتمان بەرگریکردنە لە ئیمام و زانایانی شوێنکەوتەی ئاساری سەلەف، وە هەڵبژاردنی ئەوانەی کە ئەهلی سوننە هەڵیان بژاردوون لە ئیمامەکان لە تەواوی شارەکاندا، وەکوو:

**مالیکی کوڕی ئەنەس لە شاری مەدینە:**

ئیمامی مالیك لە ساڵی (٩٣ھ) لە مەدینەدا لە دایك بووە و، هەر لە مەدینەش لە ساڵی (١٧٩ھ) لە تەمەنی (٨٦)ساڵیدا وەفاتی کردووە و، لە گۆڕستانی بەقیع نێژراوە، لە کۆتایی سەردەمی ئەمەوییەکان و کۆتایی سەردەمی عەبباسییەکاندا ژیاوە.

لەلای کۆمەڵێك لە تابیعین تەڵەبی عیلمی کردووە، وەکوو: مالیکی کوڕی هورمز و، نافیع کە خزمەتکاری ئیبنو عومەر بووە -ڕەزاو ڕەحمەتی اللَّهُ تعالی یان لێبێت-، وە لای ئیمامی زوهری و ڕەبیعە و چەندانی تر لە گەورە زانایان فێری عیلم بووە.

لەسەرەتادا مەجلیسی عیلمی و فەتوای لە ناو مزگەوتی پێغەمبەری خوادا بوو -صلی الله علیه وسلم-، پاشان بە هۆی نەخۆشییەوە لە ماڵەکەی خۆیدا دەرسی وتۆتەوە.

یەکەم کیتاب و ڕاسترین کتێب کە نووسیویەتی لە فەرمووده و فیقهدا ناوی "الموطأ" بووە.

ئەوەندە بەسە شافیعی لە وەسفیدا دەفەرموێـت: "ئەگەر باس و ناوی زانایان هێنرا، مالیك ئەستێرەیە لە ناویاندا".

**ئەوزاعی لە شام:**

ناوی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەمری ئەوزاعییە، لە ساڵی (٨٨ھ) لە بەعلەبەگی شام لە دایك بووە، لە ساڵی (١٥٧ھ) هەر لە شام وەفاتی کردووە، لە تەمەنی سێزدە ساڵی لە "فیقە" و، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا لە "عەقیدە"دا ئەهلی فەتوا بووە و، خەڵك بۆ دین گەڕاونەتەوە بۆ خزمەتی.

ئیمامی ئەوزاعی لە خزمەتی حەسەنی بەسری و ئیبن سیرین و قەتادەی کوڕی دەعامە و زوهری و مەکحوول و چەندانی تر لە گەورە زانایان تەڵەبی عیلمی کردووە.

چەندین لە گەورە زانایانی وەکوو: ئیمامی شوعبە و ئیبنو موبارەك لەبەردەستیدا فێرە عیلم بوون.

ئیمامی ئیبنو موبارەك دەربارەی دەفەرموویت: "ئەگەر بوترێت لە ناو ئوممەتدا دوو کەس لە تەواوی زانایان هەڵبژێرە، دەڵێم: سوفیانی سەوری و ئەوزاعی هەڵدەبژێرم، وە ئەگەر بوترێی یەکێك لەو دوانە هەڵبژێرە، ئەوە ئەوزاعی هەڵدەبژێرم؛ چونکە نەرمونیانتر بوو".

**لەیسی کوڕی سەعد لە میسڕ:**

ئیمامی گەورەی تەواوی میسڕ بوو، لە ساڵی (٩٤ھ) لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٧٥ھ) وەفاتی کردووە.

شافیعی دەربارەی دەفەرموویت: "زۆر لە مالیك شارەزاتر و فەقیهتر بووە".

وە گەیشتووە بە زیاتر لە ٥٠ تابیعین و، زیاتر لە ١٥٠ تابیعی تابیعین، کە زانستی لێ وەرگرتوون.

گەورە زانایانی وەکوو: ئیبن موبارەك و شافیعی و عەبدوڵڵای کوڕی وەهب لەبەردەستی ئیمامی لەیسدا پێگەیشتن و گەورە بوون.

**سوفیانی سەوری:**

ئەم ئیمامە گەورەیە لە ساڵی (٩٧ه) لە کووفەدا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٦١ه) لە بەسرە وەفاتی کردووە.

وە لەلای زانا گەورەکانی وەك: ئەیوبی سەختیانی و شوعبەی کوڕی حەججاج و مالیکی کوڕی ئەنەس و حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان و سەدان لە گەورە زانایان تەڵەبی عیلمی کردووە.

سەدان لە گەورە زانایانی وەکوو: ئیبن موبارەك و عەبدوڕڕەزاقی سەنعانی و سوفیانی کوڕی عویەینە لەبەردەستیدا فێرە عیلم بوون.

ئیبنو موبارەك دەفەرمووێت: "لە هەزار و سەد زاناوە زانستم نوسیووە، بەڵام کەسیان وەکوو سوفیانی سەوری گەورەتر نەبوونە".

ئیمامی ئەحمەد دەربارەی دەفەرمووێت: "دەزانن ئیمام کێیە؟! ئیمام، سوفیانی سەورییە! لە دڵمدا کەس پێشی ئەو نەخراوە". ئەوەندە گەورە بووە لەلای ئیمامی ئەحمەد.

**حەممادی کوڕی زەید لە عێراق:**

ئەم پیاوە بەڕێزە لە ساڵی (٩٨هـ) لە بەسرا لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٧٩هـ) کۆچی دوایی کردووە، وە گەیشتووە بە زۆرێك لە گەورە تابیعین.

گەیشتووە بە گەورە زانایانی وەکوو: ئەبو ئەیوبی سەختیانی و عەمڕی کوڕی دینار و عەتائی کوڕی سائیب، لەبەر دەستی ئەوانەدا تەڵەبی عیلمی کردووە.

مامۆستای زۆرێك لە گەورە زانایانی ئوممەت بووە، نموونەی سوفیانی سەوری و ئیبن موباڕەك و سوفیانی کوڕی عویەینە و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدی و قوتەیبەی کوڕی سەعید و وەکیعی کوڕی جەڕڕاح و سەدانیتر.

کەواتە دەبێت ئێمە تێبگەین لە بنچینەی دینداریتیمان هەم شوێنکەوتنی ئەم پیاوە بەرێزانەیە و، هەم بەرگریکردنە لە خۆیان و لە مەنهەج و لە مەزهەبیان، کە بێگومان ئەمانە هەڵبژاردەی ئەهلی سوننە و جەماعەن.

دەفەرمووێت: "من الحوادث مما لایوجد فیه روایة عن النبی -صلی الله علیه وسلم- والصحابة والتابعین". لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەیە ڕەدکردنەوەی هەموو ئەو داهێنراو و بیدعانەی، کە هیچ بەڵگە و ڕیوایەتێك لە پێغەمبەری خوا و -صلی الله علیه وسلم- هاوەڵان و تابیعین نادۆزیتەوە و، دەستت ناکەوێت دەربارەی.

شەشەم:

" وَتَرْكُ رَأْيِ الْمُلْبِسِينَ الْمُمَوِّهِينَ الْمُزَخْرِفِينَ الْمُمَخْرِقِينَ الْكَذَّابِينَ ".

---

ڕاڤەكەی:

لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە وازهێنان و دووركەوتنەوەیە لە بۆچوون و بیروباوەڕی ئەوانەی كە پۆشاكی ئەهلی حەقیان بە بەرخۆیاندا كردووە، بەڵام لە حەقیقەتدا هەڵگری باتڵن، ئەوانەی كە هەڵگری بەتاڵن و قسەیان باقوبریق و زل و ڕازێنراوەیە و، ئەوانەی كە فێڵ باز و درۆزنن و، هەموو هەوڵێكییان سەرخستنی خۆیانە.

لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە ئەوەیە كە دووربكەوینەوە لە زانایانی خراپ (سوء)، ئەوانەی كە دوورمان دەخەنەوە لە شوێنكەوتنی سەلەف وەكو خۆی، وە دوورمان دەخەنەوە لەو مەنهەجەی كە پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- لەسەری بووە و، ئەسحابی لەسەر پەروەردەكرد و، ئەسحابیش تابیعینیان لەسەر پەروەردەكرد و، تابیعینیش ئەتباعی تابیعین.

حەوتەم:

" وَتَرْكُ النَّظَرِ فِي كُتِبِ الْكَرَابِيسِ، وَمُجَانَبَةُ مَنْ يُنَاضِلُ عَنْهُ مِنْ أَصْحَابِهِ وَشَاجَرَ فِيهِ مِثْلِ دَاوُدَ الْأَصْبَهَانِيِّ وَأَشْكَالِهِ وَمُتَّبِعِيهِ ".

---

ڕاڤەکەی:

له مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە و بیروباوەڕمان ئەوەیە کە دووربکەوینەوە لە سەیرکردنی کتێبەکانی کەڕابیسی، وە دوورەپەرێز بین لەوانەش کە بەرگری لێ دەکەن، لە هاوەڵانی و قوتابییەکانی، وێنەی داوودی ئەسبەهانی و، هاوشێوە و شوێنکەوتووەکانی.

تەبعەن ئەمە وەکوو نموونەیەك هێناویەتییەوە، کەڕابیسی ناوی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی یەزیدی کەڕابیسی بووە، لە ساڵی (٢٨٤ھ) بە هیلاك چووە!

تەبعەن کەڕابیسی یەکێك بووە لە هاوەڵەکانی ئیمامی شافیعی، بەڵام دواتر لایداوە، فیقهی لە شافیعی وەرگرتوە و، یەکەم کەس بووە کە فیکرەی (ألفاظنا بالقرآن مخلوق)ی داهێناوە.

ئیمامی مەڕوەزی لە کتێبی "القصص"دا دەفەرمووێت: باسم کردووە بۆ باوکی عبدالله ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە کەڕابیسی دەلێ: (لەفزی بە قورئان مەخلووقە) یانی وتەی من بە قورئان دروستکراوە! وە دەلێت: "إن القرآن كلام

**الله غير مخلوق من كل جهاته، إلا أن لفظى به مخلوق، من لم يقول باللفظ بالقرآن مخلوق؛ فهو كافر.** واته: بێگومان قورئان کەلامی (اللّٰه تعالی)یە لە هەموو جیهەتەکانییەوە، تەنها ئەوە نەبێت وتەم بە قورئان، یانی کاتێك کە قورئان دەخوێنمەوە، ئەوە مەخلووقە، هەر کەسێکیش نەڵێت لەفزم بە قورئان مەخلووقە؛ ئەوە کافرە!

ئیمامی ئەحمەد دەربارەی دەفەرمووێت: "**بل هو كافر قاتله الله! وأى شىء قالت الجهمية إلا هذا، وما ينفعه فقد نقض كلامه الآخر، كلامه الأول**". بەڵکو خۆی کافرە، خوا بیکوژێت! مەگەر جەهمییەکانیش چ شتێکی تر دەڵێن جگە لەوە، سوودی نییە قسەی کۆتاییەکەی کە دەڵێت: (**لفظى بالقرآن مخلوق**)، ئەمە قسەی یەکەمی هەڵدەوەشێنێتەوە کە پێی وایە قورئان کەلامی اللّٰهیە و لە هیچ ڕووێکەوە مەخلووق نییە.

تەبعەن ئەگەر سەرنج بدەین کەڕابیسی وەك (جەهمییە خەلقییەکان) پێی وانەبووە قورئان مەخلووق بێت، بەڵکو بە ڕاشکاوی پێی وابووە کە قورئان مەخلووق نییە لە هەموو جیهەتەکانەوە، بەڵام لەفز و خوێندنەوەی بەندە بە قورئان کە دەنگ و خوێندنەوەکەیەتی، مەخلووقە، بەڵام ئیمامی ئەحمەد و تەواوی زانایانی شارەکان، وەکوو لە عەقیدەی ڕازییەیندا هاتووە و باسمانکرد، ئەوەیان بە جەهمی و تەجەهوم زانیوە و، ڕێگریان لەوە کردووە لە باسی قورئاندا هیچ تەفسیلێك بدرێت، قورئان کەلامی اللّٰه تعالی یە، و هیچ خیلافێك نەبووە لە نێوانیاندا، وە کە باسی قورئانکرا ڕادەوەستین لەسەر ئەوەی کە (**إن القرآن**

**كلام الله، غير مخلوق من كل جهاته)**، بەبێ چوونە ناو ئەو تەفاسیلەی کە کەڕابیسی باسی کردووە.

وەهەروەها وێنەی ئەوانەش کە باسیان دەکات کە دووادی ئەسبەهانییە، ئەمەش لە ساڵی (٢٧٠هـ) وەفاتی کردووە و، پێشەوای زاهیرییەکانە و، قوتابی کەڕابیسی بووە.

ئەبو حاتەم دەربارەی دەفەرمووێت: **"إنه ضال مضل، لا يلتفت إلى وساوسه"**. پیاوێکی گومڕا و گومڕاکاربووە، ئاوڕ بەلای قسە و فەتوا و وەسوەسەکانیدا نادرێتەوە.

ئەمەش پێشەوای زاهیرییەکانە!

## هەشتەم:

## " وَالْقُرْآنُ كَلَامُ اللَّهِ وَعِلْمُهُ وَأَسْمَاؤُهُ وَصِفَاتُهُ وَأَمْرُهُ وَنَهْيُهُ، لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ بِجِهَةٍ مِنَ الْجِهَاتِ ".

---

راڤەکەی:

قورئان وتەی پەروەردگارە و، زانست و ناوەکانی و، سیفاتەکانی و، ئەمر و نەهیەکانییەتی، لە هیچ ڕوویێك لە ڕووەکانەوە دروستکراو نییە.

قورئان کەلامی (اللَّهُ تعالی)یە چۆن بخوێنرێتەوە و چۆن بنووسرێت، وە لە هەر شوێنێك بێت، لە هەموو حاڵەتەکان و، لە هەموو ڕوویێکەوە کەلامی (اللَّهُ تعالی)یە و دروستکراو نییە، وە جیاکاری ناکرێت لە نێوان لەفز و تیلاوە و سەوتدا، کاتێك باسی قورئان هاتە پێش، دەڵێین: کەلامی پەروەردگارە لە هەموو ڕوویێکەوە، بەبێ هیچ تەفسیل دانێك و تەفریقێك لە نێوان هەموو حاڵەتەکانی قورئاندا.

ئائەمەش کۆدەنگی بیروباوەڕی سەلەفە، پێچەوانەی لەفزییە جەهمییەکان، کە دەرگای جەهمییەت بەڕووی فیکر و تێگەیشتنی خەڵکدا دەکەنەوە، وە تەفسیل و تەفریقی بیدعی دەکەن لە نێوان حاڵەتەکانی قورئاندا.

ئەمە کۆدەنگی سەلەفە و، بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیە کە قورئان کەلامی (الله تعالی)یە، کەلامی پەروەردگار و عیلمەکەیی و ناوەکانی و سیفاتەکانی و ئەمر و نەهییەکەیەتی، هیچی مەخلووق نین لە هیچ جیهەتێکەوە.

نۆیەم:

" وَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ مَخْلُوقٌ مَجْعُولٌ؛ فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ، كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ. وَمَنْ شَكَّ فِي كُفْرِهِ مِمَّنْ يَفْهَمُ وَلَا يَجْهَلُ، فَهُوَ كَافِرٌ. ومن كان جاهلا، علم، فإن أذعن بالحق بتكفيره، وإلا ألزم الكفر".

---

ڕاڤەکەی:

هەرکەسێك پێی وابێت قورئان دروستکراو و داندراوە، ئەوە کافرە بە پەروەردگار، بە کوفرێك کەوا دەری دەکات لە دینی ئیسلام.

ئەمەش کۆدەنگی سەلەفە لەسەر بە کافر زانینی جەهمییەکان بە گشتی و بەتاکە تاکەشیان، موتڵەقەن و موعەییەنەن، بەبێ تەفسیل دان و جیاکاری و، کوفرەکەش کوفری گەورەی ئاشکرایە.

پێچەوانەی زۆرێك لە خەلەف کە هاتن بیدعەی تەفریقی تەکفیری موتڵەق و موعەییەنیان داهێنا لە شیرك و کوفری گەورەدا، کۆمەڵێك شتیان کردە بەربەست و عوزر بۆ هەڵگرانی کوفر کە لەلای سەلەف بەربەست و عوزری تەکفیرکردن نەبووە.

لەلای سەلەف نەك هەڵگرانی کوفری گەورە -وەك بە مەخلووق زانینی قورئان-، بەڵکوو ئەوانەشیان بە کافر زانیوە کە گومانیان لە کافرێتی جەهمییەکان

هەبووە، بۆیە دەفەرمووێت: "ومن شكَّ في كفره ممَّن يفهم ولا يجهل؛ فهو كافرٌ، ومن كان جاهلا، علم، فإن أذعن بالحق بتكفيره، وإلا ألزم الكفر".
واتە: هەرکەسێك گومانی هەبێت لە کافری کەسێك کە دەڵێ قورئان مەخلووقە، لەوانەی کە تێدەگەن و، بێئاگا نیین لە حوکمی کافرێتی جەهمییەکان، ئەوە بەو گومانەی کە بە کافریان نازانێت، کافر ئەبێ، هەرکەسێکیش حوکمی کوفرەکەیان نەزانێت فێر ئەکرێت، ئینجا ئەگەر دانینا بە تەکفیری هەڵگرانی کوفر، ئەوە باشە، ئەگەرنا، ئەویش پەیوەست ئەکرێت بە کوفرەوە.

بۆیە دەبینین لای سەلەف هیچ تەفسیل و ڕاوەستانێك لە تەکفیری جەهمییەکان و هەڵگرانی کوفردا نییە، بەڵکوو ئەوانەی ڕاوەستاون لە تەکفیری جەهمییەکان، کەسانێك بوون ئەهلی گومان و، واقیفییەکان بوون لە تەکفیری جەهمیەکان، ئەم جۆرە کەسانەش (عازرییەکان) ئەگەر ئەهلی تێگەیشتن بووبێتن و، شارەزابووبێتن لە کوفری خەلقی قورئان، ئەوە ڕاستەوخۆ تەکفیر کراون، مەگەر کەسانێکی نەزان و تێنەگەیشتوو و عەوام بووبێتن لە حوکمی بەکافر زانینی هەڵگرانی کوفر و جەهمییەت.

ئالێرەوە تێدەگەین لە حوکمی شەرعی تەکفیر لە نێوان مورجیئەکان و ئەهلی غولودا، سەرەتا دەبێت بزانین کەوا لای شوێنکەوتوانی سەلەف هەرکەسێك هەڵگری کوفر و شیرکی گەورەی ئاشکرا بووبێت، ئەوە کافرە و، عوزر بە جەهل ناهێنرێتەوە بۆ هەڵگرانی کوفری گەورە، بەڵکوو ئەوەی عوزر بە جەهل تێیدا ڕەچاو ئەکرێت کەسی عازرە، ئەو کەسەی کە تەکفیری هەڵگری کوفر ناکات

(من كان جاهلا)، وەکوو دەفەرموویّت: "علم"، ئەگەر نەزان بیّت بە کافریّتی هەڵگری ئەو کوفرە، یان نەزان بیّت بەوەی بیروباوەڕ و کردارەکەی کوفرییە، ئەوە فیّر ئەکریّت و جەهلەکەی لەسەر لادەبریّت، ئەگەر دوای تەعلیم دانی بە کافریّتی هەڵگرانی کوفر دانینەنا، ئەوە ئەوکاتی ئەویش کوفری دەخریّتە پاڵی، بەڵام ئیتر لیّرەدا دەوەستین وەك موعتەزیلە و خەواریجەکان تەکفیری تەسەلسول ناکریّت، ئەم تەسەلسولە بێگومان فیکرەی موعتەزیلە و خەواریجەکانە.

لە مەزهەبی موعتەزیلەکان و، پاشان جەرجیسییەکان و، موڕجیئەکانی سەردەمیش کە میراتگری فیکرەی جەرجیسییەکانن، دەبینین کەوا ئەوان عوزر بە جەهل دەبیننەوە بۆ هەڵگرانی کوفری گەورەی ئاشکرا، وە دژایەتی تەکفیر ئەکەن و، بە حوکمێکی قێزەون و توندڕەوێتی لە قەڵەمی دەدەن، لەکارخەر و موعەتیلەن لە تەکفیردا، بێگومان مەنهەجی ئەهلی سوننە و سەلەف ئەوە نییە.

فیکرەی خەواریجەکان مەعلوومە کە ئەوان بە تاوانی گەورە -غەیری کوفر و شیرك-، وە بە موخالەفەکردنی خۆیان خەڵك تەکفیر ئەکەن، هەرکەسێکیش ئەهلی کەبائیر بە کافر نەزانێت، یاخود هاوفیکریان نەبێت، لای ئەوان کافرە.

بۆیە دەبێت بەئاگابین لە فیکری جەرجیسی و موڕجیئەکان و، ئەوانەمان لێ نەکرێتە مەنهەجی ئەهلی سوننە، وە ئاگاداربن فیکری توندی خەواریجتان لی نەکرێتە مەنهەجی ئەهلی سوننە، چونکە سەردەم بێگومان سەردەمی هەڵگەڕانەوەی تەرازووەکانە بە بەتاڵ و، نیشاندانی حەق بە ناحەق و بەتاڵ بە

حەقە، بۆیە دەبێت تێ بگەین لە مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە، هەرکەسێك شەکك و گومانی هەبێت لە تەکفیری کەسێکی جەهمیدا، بێگومان ئەو کەسە پێی کافر دەبێت، مەگەر کەسێك بێت کە (یجهل ولا یفهم)، ئەمەش دەبێت تێبگەیەنرێت و فەهمی بۆ دروست بکرێت.

کەواتە مەسەلەی عوزر بە جەهل بۆ کەسی عازرە، نەك بۆ کەسی هەڵگری کوفرکە، بۆیە ئەگەر کەسێك هەڵگری کوفر و شیرکی گەورەی ئاشکرا بێت، بێ شەکك لە مەنهەجی سەلەفدا بەوە کافر ئەبێت، بەڵام کەسێك کە عوزریان بۆ بهێنێتەوە، ئەوە سەیر ئەکەین ئەگەر کەسەکە ئەهلی عیلم بێت یان شارەزا بێت و بزانێت ئەوەی ئەوانە کردوویانە کوفری گەورەیە، بێ شەکك ئەویش مولحەق دەکرێت بەوانەوە، ئەگەرنا ئەوە فێر دەکرێت و شارەزا دەکرێت.



و، وەکوو جەهمییەی خەلقییەش بە ڕاشکاوی ناڵێن مەخلوقە.

جەهمییەی لەفزییە دواتر باسیان دەکەین إن شاءالله.

حەقە، بۆیە دەبێت تێ بگەین لە مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە، هەرکەسێك شەكک و گومانی هەبێت لە تەکفیری کەسێکی جەهمیدا، بێگومان ئەو کەسە پێی کافر دەبێت، مەگەر کەسێك بێت کە (**يجهل ولا يفهم**)، ئەمەش دەبێت تێبگەیەنرێت و فەهمی بۆ دروست بکرێت.

کەواتە مەسەلەی عوزر بە جەهل بۆ کەسی عازرە، نەك بۆ کەسی هەڵگری کوفرکە، بۆیە ئەگەر کەسێك هەڵگری کوفر و شیرکی گەورەی ئاشکرا بێت، بێ شەكک لە مەنهەجی سەلەفدا بەوە کافر ئەبێت، بەڵام کەسێك کە عوزریان بۆ بهێنێتەوە، ئەوە سەیر ئەکەین ئەگەر کەسەکە ئەهلی عیلم بێت یان شارەزا بێت و بزانێت ئەوەی ئەوانە کردوویانە کوفری گەورەیە، بێ شەكک ئەویش مولحەق دەکرێت بەوانەوە، ئەگەرنا ئەوە فێر دەکرێت و شارەزا دەکرێت.

دەیەم:

" وَالْوَاقِفَةُ وَاللَّفْظِيَّةُ جَهْمِيَّةٌ، جَهَّمَهُمْ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ إمامنا وإمام المسلمين.

---

ڕاڤەکەی:

واقیفییەکان و لەفزییەکان جەهمین و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل -کە ئیمامی ئێمە و موسڵمانانیشە- ئەوانەی بە جەهمی هەژمار کردوون.

واقیفییەکان: ئەوانە بوون کە دەیانوت قورئان کەلامی (الله تعالی)یە، ئیتر ڕادەوەستان و نەیاندەوت مەخلووقە یاخود غەیر مەخلووقە. وەك جەهمییەکان بوون.

وەکوو باسیشمانکرد جەهمییەکان سێ گرووپ بوون:

جەهمییەی خەلقییە: ئەوانەن کە بە ئاشکرا دەڵێن قورئان مەخلووقە.

جەهمییەی واقیفییە: ئەوانەن کە ئەڵێن: قورئان کەلامی (الله تعالی)یە و ڕادەوەستن و خۆیان یەکلایی ناکەنەوە، وەکوو موسلمانان بڵێن مەخلووق نییە و، وەکوو جەهمییەی خەلقییەش بە ڕاشکاوی ناڵێن مەخلووقە.

جەهمییەی لەفزییە دواتر باسیان دەکەین إن شاءالله.

بۆیە بێگومان ڕاوەستان و خۆ یەکلایی نەکردنەوە لە بابەت گەلێکی گرینگ کە جیاکاری دەکات لە نێوان ئەهلی حەق و بەتاڵدا، نیشانەی نەخۆشی و لادان و ملنەدانە بۆ حەق، مەگەر کەسەکە زۆر لێکراو بێت، یاخود بەهۆی دەرخستنی حەقەوە تووشی فیتنە بێت.

کەواتە واقیفییەکانیش ئەوانەی کە وەکوو موسڵمانان نەیاندەوت قورئان کەلامی (ﷲ تعالی)یە و مەخلووق نییە، بەڵکو دەیانوت کەلامی (ﷲ)یە و ڕادەوەستان، بێگومان ئائەوانە دەبینین هەروەکوو ئەبو حاتەم باسی ئەکات، کە ئیمامی ئەهلی سوننە و ئیمامی موسڵمانان واقیفییەکانی بە جەهمی حیساب کردووە.

لەفزییەکان: وەك ئیمامی "حەربی کرمانی" لە سوننەکەی خۆیدا دەفەرمووێت: ئەوانەن کە پێیان وایە قورئان کەلامی (ﷲ تعالی)یە، بەڵام لەفزمان بە قورئان و خوێندنەوەمان بۆی مەخلووقە، ئەوانە جەهمی و لە ڕێی دەرچوون.

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: جەهمییەکان سێ گرووپن ئەوانەی کە ئەڵێن: قورئان مەخلووقە کە خەلقییەکانن، ئەوانەی کە گومانیان هەیە و ڕادەوەستن کە واقیفییەکانن، ئەوانەشی کە دەڵێن لەفز و خوێندنەوەمان مەخلووقە، ئەوانەش پێیان دەوترێ لەفزییەکان.

کۆدەنگی سەلەف لەسەر ئەوە دروست بووە کە کاتێك باسی قورئان هاتە پێش ئەبێ بوترێ: (القران كلام الله غير مخلوق في كل الجهات)، ئیتر هیچ تەفسیلێك و تەفریقێکی بیدعی لە نێوان وتە و وترا و، نووسین و نووسراو و،

خوێندنەوە و خوێندراودا ناکرێت، وە ئەو بیروباوەڕەی کە لە قەدەردا باس دەکرێت و، پایەی سێیەمی قەدەرە کە خەلقە، یانی خەلقی تەواوی کاروباری بەندەکان، ئەوانە هەرهەمووی دروستکراوی دەستی پەروەردگارن (وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ)[٢٦٢]، خۆمان و کاروکردەوەکانیشمان دروستکراوین و، اللَّهُ تعالى خالیقی خراپ و تاوانەکانیشە، بەڵام بکەرەکەی بەندەکانن، کە قورئان هاتە پێش لە باسی قورئاندا سەلەف باسی دروستکراویەتی کردەوەی بەندەکانیان نەکردوە و، هەرگیز ڕێگایان نەداوە.

بۆیە دەبینین ئیبنو ئەبی حاتەم دەربارەی (ئەفعالی عیباد)، پرسیار لە ئیمامی گەورە ئەبو زورعە دەکات، ئایا ئەفعالی عیباد پێی دەڵێن مەخلووق؟ ئەبو زورعە دەڵێت: بەڵی مەخلووقە.

پاشان دەڵێت: ئەی لەفز و خوێندنەوەمان بۆ قورئان لە کردەوەکانی خۆمان نییە؟ فەرمووی: "لا يقال هذا". ئەوە ناوترێت.

ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم دەفەرمووێت: "پرسیارم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرد، وتم ئەی باوکی عبدالله مەگەر چاوەکان سەیری ڕەشایی وەرەقەکان ناکەن؟! کاتێك سەیری قورئان دەکەین مەگەر ئەو نووسین و مەرەکەبە دروستکراو نییە؟! ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: دەست هەڵگرە، ئەوە ناوترێت، ڕاسترین خەبەر لە بارەی ئەمەوە هاتبێت فەرموودەکەی نافیعە لە ئیبنو

---

[٢٦٢]- سورة الصافات: ٩٦.

عومەرەوە -ڕەزاو ڕەحمەتی (اللهِ تعالی)یان لێ بێت- ئەویش لە پێغەمبەری خواوە -صلى الله عليه وسلم- کە فەرموویەتی: "**نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بالقُرْآنِ إلى أَرْضِ العَدُوِّ**".[٢٦٣] واتە: بە قورئانەوە سەفەر مەکەن بۆ زەویی دوژمن. باسی حیبر و وەرەقەی نەکرد.

بۆیە کاتێك سەلەف نەهیبانکردووە لەوەی کە باسی قورئان هاتە پێش، نابێت بوترێت لەفزمان بە قورئان مەخلووقە، بەهەمان شێوە نەهێیشیان لەوە کردووە کە بوترێت غەیر مەخلووقە!

پێچەوانەی فیکری لەفزییەکان، کەوا تێئەگەن سەلەف و ئەهلی سوننە باوەڕیان وابێت نووسین ومەرەکەب و وەرەقە لامان مەخلووق نەبێت -العياذ بالله-، نا بێگومان هیچ عەقڵێکی سەلیم و، هیچ موسڵمانێکی عاقڵ نییە کە وەرەقە و مەرەکەب بە دروستکراو نەزانێت، بەڵام کە باسی قورئان هاتە پێشەوە ئەم بابەتە لای سەلەف دائەخرێت، نە دەوترێت مەخلووقە، نە دەورێت غەیر مەخلووقە.

یەکەم کەس کە عەقیدەی لەفزییەکانی داهێنا، بریتیی بوو لە کەڕابیسی کە ناوی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی یەزیدی کەڕابیسی بوو، لە ساڵی (٢٨٤ھ) بە هیلاکچوو، هاوەڵی ئیمامی شافیعی بوو، فیقهی لەوەوە وەرگرت، یەکەم کەس بوو کە فیکرەی (لەفزمان بەقورئان مەخلوقە)ی داهێنا.

---

[٢٦٣]- صحيح البخاري.

ئیمامی مەڕوەزی لەکیتابی "القصص"دا دەفەرمووێت: بۆ ئیمامی ئەحمەدم باسکرد، گوتم: کوڕی حەنبەل! کەڕابیسی دەڵێت: لەفزمان بە قورئان مەخلووقە؟! وە دەڵێت: "**إن القرآن كلام الله غير مخلوق من كل جهات**". کەڕابیسی ئەڵی قورئان کەلامی (الله تعالی)یە مەخلووق نییە لە هەموو ڕووێکەوە، "**إلا أن الفظ به مخلوق**" تەنها ئەوە نەبێت کە دەڵێم لەفز و خوێندنەوەکەم بۆ ئەم قورئانە مەخلووقە، "**ومن لم يقل لفظي بالقرآن مخلوق، فهو كافر**". هەرکەسێکیش نەڵێت لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، ئەوە کافر بووە! ئیمامی ئەحمەد دەربارەی فەرمووی: "**بل هو الكافر قاتله الله، وأى شيء قالت الجهية إلا هذا**". بەڵکوو خۆی کافرە، الله بیکوژێت، مەگەر جەهمیەکانیش چ شتێکی تر دەڵێن غەیری ئەوە نەبێت، "**وما ينفعه وقد نقض كلامه الآخر كلامه الآول**" ئەوە سوودی پێ ناگەیەنێت کە دەڵێت قورئان کەلامی (الله تعالی)یە لە هەموو جیهاتەکانییەوە، قسەکەی ئەخیری قسەی یەکەمی هەڵدەوەشێنێتەوە.

بۆیە دەبینین ئەگەر سەرنج بدەین کەڕابیسی وەك جەهمییە خەلقییەکان پێیان وانەبوو کە قورئان مەخلووق بێت، بەڵکوو بەڕاشکاوی بڕوای وابوو کە قورئان کەلامی (الله تعالی)یە لە هیچ ڕووێکەوە مەخلووق نییە، بەڵام لەفز و خوێندنەوەمان بۆی مەخلووقە! بەڵام ئیمامی ئەحمەد و تەواوی زانایانی ئەهلی سوننە ئەوەشیان بە تەجەهوم و جەهمییەت هەژمار کردووە و، هیچ خیلافێکیش نەبووە لە نێوانیاندا کە باسی قورئان کرا ڕادەوەستین لەسەر ئەوەی کە بوترێت:

قورئان کەلامی پەروەردگارە و، مەخلووق نییە لە هەموو ڕووێکەوە، بەبێ چوونە ناو ئەو تەفسیلە بیدعییەی کە کەڕابیسییەکان دایانهێنا.

یازدەیەم:

" وَالِاتِّبَاعُ لِلْأَثَرِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَنِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ بَعْدَهُمْ بِإِحْسَانٍ ".

---

ڕاڤەکەی:

لەکۆدەنگی و بیروباوەڕ و مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە بریتییە لە شوێنکەوتنی ئەوەی بەجێماوە لە پێغەمبەری خوا و-صلی الله علیه وسلم- هاوەڵان و شوێنکەوتوانی دوای ئەوان بە باشی.

دینداریتی بە شوێنکەوتن بۆ ئەسەر خاڵێکی یەکلایکەرەوەی نێوان حەق و گرووپە گومڕاکانە، اللَّهُ تعالی دەفەرموویت: (فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍۖ)[٢٦٤]. واتە: ئەگەر ئەوانە ئیمان بهێنین وێنەی ئەو ئیمانەی کە ئێوە هێناوتانە ئەی هاوەڵان -تەبعەن ئەمە خیتابە لەگەڵ هاوەڵاندا بە دەرەجەیەك- ئەوە بێگومان ئەو خەڵکە هیدایەتدراوە، خۆ ئەگەر پشت بکەنە دینداریەتی ئێوە، ئەوا بێگومان لەناو تەفەرەقەدا دەبن.

بۆیە خۆشەویستانم! ئاساری سەلەف -کە بریتییە لە تێگەیشتن و قسە و کردەوەی هاوەڵان و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین- گەورەترین خاڵی

---

٢٦٤- سورة البقرة: ١٣٧.

جیاوازی نێوان ئەهلی سوننەیە لەگەڵ گرووپە گومڕاکان، چونکە ئەهلی سوننە دینداریتی بە ئاساری سەلەفەوە دەکەن و، قەدر و سەنگی ئاسار لایان گەورەیە، بەپێچەوانەی گرووپە لاڕێکان لە جەهمی و خەواریج و مورجیئە و موعتەزیلە و ڕافیزە و ئەشعەری و ماتوریدییەکان، هەموو ئەو گرووپ و فیرقانەی تر کە دروست بوون، پشتیان کردۆتە فەهم و مەنهەجی هاوەڵان، تێگەیشتن و مەنهەجی خۆیان و سەرمەزهەبەکانیان کردۆتە پێوەر.

## دوازەیەم:

## " وَتَرْكُ كَلَامِ الْمُتَكَلِّمِينَ، وَتَرْكُ مُجَالَسَتِهِمْ وَهِجْرَانُهُمْ ".

---

ڕاڤەکەی:

وازهێنان لە خوێندنەوە و قسە و نووسراوی فەلسەفەچییەکان وەك ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان و، واز هێنان لە کۆڕ و دانیشتنەکانیان وپشت تێکردنیان.

تەبعەن ئەمەش لە پێناو پارێزگاری دڵە لە شوبهە و دینداریێتی لە لادان، وە گرینگە کەسی سوننی نزیکی کتێبی ئەهلی کەلام و فەلسەفە نەکەوێت، بەڵکوو نزیککەوتنەوەیان تەنها بۆ کەسانێکە کە ئەهلی عیلم بن و، چەسپاوبن کە بە مەبەستی دەرخستنی فیکرە چەوتەکانیان بێت.

ئینجا هەجری بیدعەچییەکانیش بۆ سێ مەبەستە:

مەبەستی یەکەم: غیرەیە بەرامبەر بەو دینە حەقەی کە ئەوان شێواندوویانە و دژایەتی دەکەن.

مەبەستی دووەم: بۆ تەمبێکردن و گەڕانەوە و تەوبەکردنی ئەوانە.

مەبەستی سێیەم: بۆ سەلامەتی دڵمانە لە شوبهە و گومانەکان.

سێزدەیەم:

" وَتَرْكُ مُجَالَسَةِ مَنْ وَضَعَ الْكُتُبَ بِالرَّأْيِ بِلَا آثَارٍ ".

---

ڕاڤەکەی:

وازهێنان لە دانیشتن لەگەڵ کەسانێك کە بە بیر و فیکری خۆیان کتێب ئەنووسن، بەبێ گەڕانەوە بۆ ئاسار.

چواردەیەم:

" وَاخْتِيَارُنَا أَنَّ الْإِيمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، إِقْرَارٌ بِاللِّسَانِ وَتَصْدِيقٌ بِالْقَلْبِ وَعَمَلٌ بِالْأَرْكَانِ، مِثْلُ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ لِمَنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، وَالْحَجِّ لِمَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا، وَصَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ، وَجَمِيعِ فَرَائِضِ اللَّهِ الَّتِي فَرَضَ عَلَى عِبَادِهِ، الْعَمَلُ بِهِ مِنَ الْإِيمَانِ. وَالْإِيمَانُ يَزِيدُ وَيَنْقُصُ".

---

ڕاڤەکەی:

بیروباوەڕمان وایە کە ئیمان قسە و کردارە، دانپێدانانە بە زمان و، بەڕاستدانانە بە دڵ و، کردەوە پێکردنە بە ئەندامەکانی لاشە، وەك: نوێژ، زەکات -بۆ کەسێك سامانی هەبێت-، حەجکردن -بۆ کەسێك توانای ڕێگای هەبێت-، بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان، وە تەواوی فەرزەکان کە الله تعالی فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، کردەوە پێکردنی لە ئیمانە، وەهەروەها ئیمان زیاد و کەمیش دەکات.

خۆشەویستانم! لەگرینگترین ئەو باس و بابەتانەی کە ئەهلی حەقی پێ جیادەبێتەوە لە ئەهلی بەتاڵ بریتییە لە پێکهاتەی ئیمان و حەقیقەتەکەی، کۆدەنگی ئەهلی سوننە بڕاوەتەوە لەسەر ئەوەی کە پێکهاتەی ئیمان سێ شتە:

(بیروباوەری دڵ و دانپێدانانی، قسەی زوبان، کردەوەی لاشە)، هەریەکێك لەم سێیانە دەربکرێت لە پێکهاتەی ئیمان، ئیتر ئیمانەکە نییە و، بە خاوەنەکەی ناوترێت ئیماندار.

لەلای ئەهلی سوننە هیچ کەسێك نییە بەبێ کردەوەکردن بەو فەرزانەی کە تایبەتمەندن بە ئوممەتی ئیسلام، وەك: نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج، پێی بوترێ ئیماندار و هەڵگری ئیسلام، وە ئینسان کاتێك هەڵگری ئیسلام و ئیمانە کە ئەهلی ملکەچی بێت بۆ فەرزەکانی ئیسلام و، ئینقیادی هەبێت و، جێبەجێکاری پایەکانی ئیسلام بێت.

ئەگەر تێڕابمێنین ئیمان لە زمانی عەرەبیدا واتا: دانپێدانان و بەڕاستدانان.

بەڵام ئیمان لە پێناسی شەرعدا واتا: بیرباوەڕی دڵ و قسەی زوبان و کردەوەی لاشە، هەرسێکیان پێکەوە.

پێویستە بزانین کە دینی ئیسلام و حەقیقەتی ئیمان دوو شتە:

یەکەم: خەبەر و هەواڵ پێدان، کە ئەمە پێویستی بەڕاستدانان و دانپێدانانە و، پەیوەستە بە زانست و قسەوە، پێچەوانەکەی بریتییە لە بە درۆدانان.

دووەم: بریتییە لە تەڵەب و داواکاری، بۆیە دینی ئێمە تەنها خەبەر نییە، تاوەکوو بە بەڕاستدانانی ئیتر پێمان بوترێ ئیماندار، بەڵکوو بەشی دووەمی دینداریەتی ئێمە و پێکهاتەی ئیمان بریتییە لە تەڵەب و داواکاری، کە ئەمەش

پێویستی بە گوێڕایەڵی و ملکەچی و ئیلتیزام و کردەوەیە، ئەمەش پەیوەستە بە کردەوەی لاشە و، پێچەوانەکەشی بریتییە لە پشت تێکردن و کردەوە پێنەکردن.

ئالێرەوە تێدەگەین ئیمان قسە و کردارە، بە هەمان شێوە کوفریش قسە و کردارە، تەنها پەیوەست نییە بە دڵەوە، ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (الَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ)[٢٦٥]. بەدرۆخستنەوە بە دڵ و قسە دەکرێت، تەوەللی و پشتتێکردنیش بە کردارە.

ﷲ تعالی دەفەرمووێت: (إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ)[٢٦٦]. واتە: بێگومان وەحیمان بۆ هاتووە کە سزای هەتاهەتایی دۆزەخ لەسەر کەسێکە کە دینی (ﷲ تعالی)ی بەدرۆ داناوە و پشتی کردۆتە فەرمانەکانی.

ﷲ تعالی لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: (فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَـٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾)[٢٦٧]. واتە: دۆزەخییەکان ئەوانەن کە دانیان بە ئیسلامدا نەناوە و نوێژەکانیان ناکەن، بەڵکوو ئیمان ناهێنن و پشت ئەکەنە کردەوە.

کەواتە مەداری ئیمان هەم بەڕاستدانانە، هەم کردەوەکردنە بە فەرمانەکان، بەهەمان شێوەش مەداری کوفر هەم بە درۆدانانە، هەم پشتتێکردن و کردەوە

[٢٦٥]- سورة الليل: ١٦.

[٢٦٦]- سورة طه: ٤٨.

[٢٦٧]- سورة القيامة.

نەكردنە بە فەرمانەكان و تەركی كردەوەیە.

ئالێرەوەیە كە گومڕایی مورجیئەكانمان بۆ بەدەردەكەوێت كە ئیمانیان كورت هەڵهێناوە لە بەڕاستدانان و، كوفریش لە نكووڵی لێكردن، "تارك العمل" و پشتكەرانی فەرزەكانیش بە ئەهلی ئیمان دەزانن!

پێچەوانەی ئەهلی حەق كە "تارك العمل" لایان كافرە، بەڵگەكان زۆرن لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا و-صلى الله عليه وسلم- كۆدەنگی سەلەف لەسەر ئەوەی كە ئەوانەی پشتگوێخەری فەرمان و فەرزەكانن، بێگومان ئەهلی ئیمان نین.

**بەڵگەی قورئان:**

1 - اللَّهُ سبحانه و تعالى دەفەرموێت: (وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ)[٢٦٨]. واتە: خەڵكانێك هەن كە بەسەرزارەكیی ئەڵێن ئێمەش بڕوامان بە اللَّهُ تعالى و بە پێغەمبەرەكەی -صلى الله عليه وسلم- هێناوە و گوێڕایەڵیشمان كردووە، كەچی كاتێك كە ڕووبەڕووی فەرز و فەرمانێك دەبنەوە، دوای ئەوە دەبینی دەستەیەكیان لە بڕیارەكانی اللَّهُ تعالى ڕوو وەردەگێڕن و پشت لە فەرمانەكانی دەكەن (وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ) ئەوانە بڕوادار نین، بەڵكوو تەنها بە دەم بڕوایان هێناوە و دەڵێن گوێڕایەڵین.

---

[٢٦٨]- سورة النور:٤٧.

ڕوونە لە ئایەتەکەدا کە پەروەردگارمان باسی (يَتَوَلَّىٰ) دەکات، ئەمەش زانراوە کە بەکردار دەکرێت، نەك بە دڵ و بەقسە.

کەواتە ئیمانداری حەقیقی کەسێکە، کە ئەهلی ئینقیاد و ئیلتیزام بێت بە کردەوەکردن و، ئیلتیزامی هەبێ بەو کردەوانەی کە اللَّه تعالی فەرزی کردووە، تەنها ئەوەندە کافی نییە کە خەڵکانێك پێیان وابێت بیروباوەڕی دڵ و قسەی زمان کافی بێت، (وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا) بەڵام لەولاشەوە (يَتَوَلَّىٰ) پشتبکەنە کردەوەکردن بە فەرمانەکانی اللَّه تعالی.

2 - اللَّه سبحانه وتعالی دەفەرمووێت: (قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ)[٢٦٩]. واتە: پێیان بڵێ کە گوێڕایەڵی اللَّه و پێغەمبەرەکەی بکەن -صلی الله علیه وسلم- خۆ ئەگەر پشت بکەنە فەرمانەکانیان و تەرکی عەمەل بکەن، ئەوە بێگومان اللَّه تعالی کافرانی خۆش ناوێت.

اللَّه تعالی فەرمووی: (فَإِن تَوَلَّوْا) ئەگەر پشتیانکردە فەرمانەکان، نەی فەرموو (فإن كذبوا) ئەگەر باوەڕیان نەهێنا یان بەدرۆیان دانا، مەعلوومە ئەم ئایەتانە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەوانەی "تارك العمل"ن لە مەنهەجی ئەهلی حەقدا بێگومان خاوەنی ئیمان نیین.

---

[٢٦٩]- سورة آل عمران:32.

3 - الله سبحانه و تعالى له ئايەتێكى تردا دەفەرمووێت: (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا)[٢٧٠]. واتە: نا سوێند بە پەروەردگارت ئەمانە ئیمانیان نەهێناوە تا تۆ و شەریعەتەكەی تۆ نەكەنە حەكەم بۆ ئیش پێكردن و حوكمكردن لە نێوانیاندا.

دەبینین الله تعالى عەمەلى كردە سەنگ و مەحەكی ئیمان، وە تەسدیقی ئەو ئیمانە بەو كردەوە و تەحكیمەیە كە ئینسان كاتێك بانگەشەی ئیمانی كرد، بێگومان دەبێت شەریعەتی الله تعالى سەروەری بێت (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ)، الله تعالى سوێند دەخوا بە نەفسی پیرۆزی خۆی كە ئیمانیان نەهێناوە هەتاوەكوو تۆ نەكەنە حەكم، هەتاوەكوو یاسا و ڕێبازی تۆ نەكەنە سەروەر و پێشەنگی خۆیان.

4 - الله سبحانه و تعالى دەفەرمووێت: (تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ)[٢٧١]. واتە: زۆرێك لەوانە دەبینی وەلائیان دەبێت بۆ كافران، ئاشكرایە كە (تَرَىٰ) بۆ بینینی چاوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو شتەی ئەوانی دەركردووە كردارێكی زاهیرییە، نەك بیروباوەڕی دڵ و ئەوەی كە لە دڵیاندایە.

---

[٢٧٠]- سورة النساء:٦٥.

[٢٧١]- سورة المائدة:٨٠.

ئەمانە و دەیان ئایەتی تر بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە کردەوەکردن و عەمەلی جەواریح لە پایە دانەبڕاوەکانی ئیمانە و، ئیمان بەبێ کردەوە ئیمان نییە.

**بەڵگەی فەرموودە:**

پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرمووێت: "**أُمِرْتُ أَن أُقاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَن لا إِلهَ إِلاَّ اللَّه وأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ويُقِيمُوا الصَّلاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذا فَعَلوا ذلكَ، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وأَمْوَالَهم إِلاَّ بحَقِّ الإِسلامِ، وحِسابُهُمْ عَلى اللَّهِ**"[٢٧٢]. واتە: فەرمانم پێکراوە کە بجەنگم لەگەڵ کافراندا هەتاوەکوو ئەوکاتەی کە دەبنە هەڵگری تەوحید و شایەتی ئەدەن بە وەحدانیەتی الله تعالى ، وە شایەتی بە ڕیسالەتی موحەممەد ئەدەن -صلى الله عليه وسلم-، وە نوێژەکانیان ڕادەگرن و زەکاتی ماڵیان دەردەکەن، کاتێك ئەوەیان ئەنجامدا ئیتر سەر و ماڵیان پارێزارو دەبێت ئیللا بە حەقی خۆی نەبێت، وە حیسابیشیان لای پەروەردگارە.

دەبینین پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- موسڵمانێتی و ئیمانی تەنها نەبەستەوە بە تەوحید و ئیمانی دڵ، بەڵکوو کاتێك دەستبەرداری جەنگ و کوشتاری ئەم خەڵکە دەبویەوە، کە بەکردار بیسەلمێنن و، هەڵگر و بکەری نوێژ و زەکات بن.

دەیان فەرموودەی تر کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئیمان بەبێ کردار دانامەرزێت، کۆدەنگی تەواوی سەلەف و ئەووەڵینی سەلەف چەسپاوە لەسەر

---

[٢٧٢]- متفق عليه.

ئەوەی کە پێکهاتەی ئیمان سیانە: بیروباوەر و قسە و کردەوە، وە کرداریش بەشێکی دانەبڕاوی ئیمانە.

بۆیە دەبینین سەرگەردانی فیکری مورجیئەکان لەوەدایە کە حاڵی ئەو خەڵکە وەك حاڵی تازە موسڵمان بوێکە لایان.

دەبینین کەسێک کە تازە بێتە ناو ئیسلام، شایەتی هێنان کافییە بەوەی بەو کەسە بوترێت ئیماندار.

لەکاتێکدا لای ئەهلی حەق دوو حاڵەتی جیاوازە کەسێك کە سەرەتا دێتە ناو ئیسلامەوە و موسڵمان دەبێت، لەگەڵ کەسێك کە لەناو ئیسلامدایە و بەردەوامە لەسەر موسڵمانیەتیەکەی، ئەوەیان دوو حالەتی جیاوازن.

لای ئەهلی حەق کەسێك کە تازە دێتە ناو ئیسلام و شایەتی بە حەق دەهێنی، ئیتر بەو کەسە دەوترێ موسڵمان، ئەوەندە بەسە بۆ هاتنە ناو ئیسلام کە شایەتومان بهێنێ، ئەگەر ئەو کەسە کافری ئەسڵی بێت، وە ئەگەر ئەهلی ڕیددە بێت، دەبێت بەڕائەت بکا لەو کوفرەی کە پێشتر لە ئیسلام دەری کردووە، ئەمە جگە لەوەی کە دەبێت شایەتومانیش بهێنێتەوە.

بەڵام بۆ بەردەوامبوون لەسەر ئیسلام و هەڵگرتنی ئیمان، بۆ ئەوەی بەکەسێك بوترێت موسڵمان و ئیماندار، پێویستی بەدوو شتە:

یەکەم: کردەوەکردن بە داخوازییەکانی تەوحید و، ئیلتیزام بوون بە فەرمانەکان و ملکەچبوون بۆ شەریعەت بە کردار.

دووەم: نەکەوتنە ناو هیچ شتێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و ئیمان، وە خۆبەدوورگرتن لەو قسە و گوفتار و کردارانەی کە ئیسلامەتی و دین بەتاڵ ئەکەنەوە.

کەواتە لای ئەهلی سوننە هەم پێویستی بە کردار و ئیلتیزامە، وە هەم پێویستی بە تەواوی بەڕائەتە لە کوفر و شیرك، بەپێچەوانەی کەسێکەوە کە تازە دێتە ناو ئیسلامەوە، تەنها بە شایەتیدان پێی دەوترێت موسڵمان.

ذەبینین مورجیئەکان و ئەهلی تەجەهوم هەموو خەڵکی بەشێوەیەك سەیر دەکەن کە تازە هاتبێتنە ناو ئیسلامەوە، بۆیە بە تەنها شایەتیدان لای ئەوان کافییە بۆ ئەوەی بە کەسێك بوترێت موسڵمان و ئیماندار، با هەتاوەکوو مردنیش سەر بە فەرزی خوا دانەدات و، ئەهلی ئیلتیزام و تەسلیمبوو نەبێت بۆ شەریعەتەکەی الله تعالی.

وەهەروەها خەڵکانێك ئەگەر کەوتبێتنە ناو نەواقیزی ئیسلام و هەڵوەشێنەرەوەکانی دینەوە، ئەوان هەر بە ئەهلی ئیسلام و ئیمانی دەزانن، وە دەیان بەربەستی شەیتانی و عوزری بۆ دەهێننەوە، لەکاتێکدا کە ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەر ئەو مەنهەجە پیسەی ئەوان نیین، کە بێگومان مەنهەجێکی بیدعییە.

پازدەیەم:

" وَنُؤْمِنُ بِعَذَابِ الْقَبْرِ ".

---

ڕاڤەکەی:

ئیمانمان بە سزای گۆڕ هەیە. وەهەروەها باوەڕمان بە حەسانەوە و خۆشی ناو گۆڕیش هەیە.

بێگومان ئەو ژیانەی کە لە دوای مردن دەست پێ دەکات و پێی دەوترێ "ژیانی بەرزەخ"، ڕاستە و حەقە.

شازدەیەم:

" وَبِالْحَوْضِ الْمُكْرَمِ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ".

---

ڕاڤەکەی:

ئیمانمان بە "حەوزی کەوسەر" هەیە، کە پێغەمبەرمانی -صلی الله علیه وسلم- پێ ڕێز لێ دەنرێت. بە تەفسیلی لە عەقیدەی ڕازییەن باسمانکردووە.

## حەڤدەیەم:

## " وَنُؤْمِنُ بِالْمُسَاءَلَةِ فِي الْقَبْرِ ".

---

راڤەکەی:

وە ئیمانمان بە پرسیاری ناو گۆڕ هەیە.

مەبەست لە پرسیاری ناو گۆڕ، ئەو سێ پرسیارەیە کە دوو مەلائیکەت دێنە ناو گۆڕ پرسیار لە مردووەکان دەکەن: **(من ربك؟ ما دينك؟ من نبيك؟).**

پەرستراوت کێ بوو؟ کێت ئەپەرست؟ خوات کێ بوو؟ ﷲ خوات بوو یان خوا بەتاڵەکانی تری وەك تاغووتەکان، یان هەواوئارەزووی ئینسانەکانی تر.

لەسەر چ دین و ڕێبازێك بووی؟ بە تەنها لەسەر ئیسلام بووی؟ یان لەسەر ڕێباز و دینەکانی تریش بووی؟!

کێ ڕابەر و پێشەوات بوو؟! ئایا شوێن کۆتا پێغەمبەر کەوتبووی؟!

ئەوەی بە حەق تەنها (ﷲ)ی پەرستبێت و، تەنها شوێن ئیسلام کەوتبێت و، شوێنکەوتەی پیغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- بووبێت، ئەوە بێگومان وەڵامی پێیە، بە پێچەوانەوە هەرکەسێك تەحەقیقی وەحدانییەتی (ﷲ تعالی)ی نەکردبێت و، تەحقیقی ڕێبازی ئیسلامی نەکردبێت و، تەحەقیقی ئیتیباعی بۆ پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- نەکردبێت، ئەوە بێگومان وەڵامی پێ نییە.

هەژدەیەم:

" وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ ".

---

ڕاڤەکەی:

ئیمانمان بە دوو مەلائیکەتی بەڕێزی نووسەری کردەوەکان هەیە، کە کردەوەی چاك و خراپی بەندەکان دەنووسن.

## نۆزدەیەم:

## " وَبِالشَّفَاعَةِ الْمَخْصُوصِ بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ".

---

راڤەکەی:

ئیمانمان بە شەفاعەتی تایبەتکراو بە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- هەیە، کە اللّٰه تعالی لە ڕۆژی قیامەت پێی دەبەخشێ کە شەفاعەتی گەورەیە، بۆ دەست پێکردنی حیساب و لێپرسینەوە لە بەندەکان.

وەهەروەها شەفاعەتەکانی تریش، وەکوو: شەفاعەتکردن بۆ دەرهێنانی خەڵکانێك لە دۆزەخ و، شەفاعەتکردن بۆ کردنەوەی دەرگای بەهەشت و، شەفاعەتکردن بۆ ئەهلی کەبائیر لە ناو ئوممەتەکەی و، ئەو شەفاعەتانەی کە تایبەتە بە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم-، بێگومان ئەمانە کۆدەنگ و بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیە و هیچ خیلافێك نەبووە لەنێوان سەلەفدا.

بیستەم:

**" وَنَتَرَحَّمُ عَلَى جَمِيعِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَا نَسُبُّ أَحَدًا مِنْهُمْ، لِقَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: {وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ}. الحشر: ١٠".**

---

ڕاڤەکەی:

ڕەحمەت و ڕەزا بۆ تەواوی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- دەنێرین و، قسە بە هیچ یەکێك لە هاوەڵان ناڵێین، لەبەر وتەی اللّٰه تعالى کە دەفەرمووێت: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ). واتە: ئەوانەی کە لە دوای هاوەڵان هاتن لە شوێنکەوتووان، دەیان فەرموو: ئەی پەروەردگار لە ئێمە و براکانی ئێمەش خۆشبە کە پێش ئێمە کەوتن بە ئیمانەوە و، هیچ ڕق و نەنگیەك لەدڵماندا بەرامبەریان دروست نەکەی، بێگومان تۆ لێبووردە و خاوەن ڕەحم و سۆزی.

له بیروباوەڕ و کۆدەنگی سەلەف و، مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعەت بریتییە لە: پارێزراوی دڵ و زمان بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا -صلی الله علیە وسلم-، چونکە هاوەڵان هێلی سوورن.

بێگومان بوونی هەر حیقد و ڕقێك بەرامبەر هاوەڵان، بەڵگەی نیفاق و خەلەلی ئیمانە.

لە کۆدەنگی بیروباوەڕی سەلەف سەلامەتی و پاکی دڵ و زمانە بەرامبەر بە تێکڕای هاوەڵان بەبێ جیاوازی، چونکە هاوەڵان شوڕا و هێلی سووری سوننە بوونە، هەرکەسێك بیبەزێنێت، بە جۆرێك لە ڕەخنە یان ڕق یان قسە پێوتنیان، بێگومان ئەو کەسە سنووری تێپەڕاندووە و، ملی ڕێی سەرگەردانی گرتۆتە بەر.

هەرکەسێك بۆ ساتێك گەیشتبێت بە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیە وسلم- و، ئیمانی پێ هێنابێت و، لەسەر ئیمان مردبێت، ئەوە ئەم کەسە لە مەقامی سوحبەت دایە و، ئەم مەقامەش بەرزترین مەقامی ئیمانە، هیچ کەسێك دوای ئەوان پێیان ناگەنەوە، هەرچەندە ئەهلی زوهد و تەقوا و عیبادەتێکی زۆر بووبێتن.

بێگومان هاوەڵانیش کە بوونە سەردار و پێشەنگی ئەم ئوممەتە، کە ئوممەتی پێغەمبەری خوایە -صلی الله علیە وسلم-، چەند هۆکارێکی هەبوو:

یەکەم: بریتیی بوو لە مەقامی سوحبەت کە هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوایە -صلی الله علیە وسلم- هیچ کەس ناگاتە ئەو مەقامە، ئیللا مەقامی ئیتتیباع نەبێت، موتابەعەی پێغەمبەری خوا و -صلی الله علیە وسلم- مەقامی ئیقیتداء بە هاوەڵانەوە، کە بێگومان ئەوەش مەقامێکی بەرزە لە دوای مەقامی هاوەڵان.

دووەم: توندێتیان بوو بەرامبەر بە دووژمنانی اللَّهُ تعالی ، اللَّهُ تعالی خۆی لە وەسفی هاوەڵاندا دەفەرمووێت: (وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)[٢٧٣]. واتە: زۆر توند و بە شیددەت بوون بەرامبەر کافران و، سۆز و ڕەحمیان هەبوو لە نێوان خۆیاندا.

هەربۆیە لە کۆنەوە دووژمنان کار لەسەر تێکدانی هەردوو مەقامی شیددەت و موحیببەت ئەکەن و، هەوڵی دارنینی دەدەن لە دڵی ڕۆڵەکانی ئوممەتدا، تاوەکو جیلێك دروست نەبێت وەکوو هاوەڵ ئاسا جارێکی تر ببنەوە سەرداری زەوی و ئوممەت، بۆیە دەبینین بە هەموو شێوەیەك هەوڵ ئەدەن موسڵمانان پەرتەوازە بکەن و، لەناو دڵی موسڵماناندا شیددەت بەرامبەر کافران و موحیببەت بەرامبەر بە موسلمانان هەڵبکەنن، چونکە ئەوان یەقینیان هەیە ئەگەر جیلێك دروست بێتەوە وێنەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- کە توونەد بن بەرامبەر بە کافران و، بە ڕەحم بن بەرامبەر بە موسڵمانان، جارێکی تر بە هۆیەوە شکۆی ئیسلام دەگەڕێتەوە، بۆیە لە کۆنەوە دوژمنانی ئیسلام کار لەسەر ئەم دوو مەقامە دەکەن.

ئەمەش عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەتە دەربارەی هاوەڵان، کە هیچ کەسێك نییە لە تابیعین و تابیعی تابیعینیش پلەیان بگاتەوە بە هاوەڵان تاوەکوو ڕۆژی قیامەت، هەرچەند تەقوا و عیبادەت و زوهدیان زۆر بێت، چونکە مەقامی سوحبەت کۆتایی هاتووە و بڕاوەتەوە.

---

[٢٧٣]- سورة الفتح: ٢٩.

بیست و یەکەم:

" وَالصَّوَابَ نَعْتَقِدُ وَنَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ مِنْ خَلْقِهِ: {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ}. الشُّورى:١١".

---

ڕاڤەکەی:

لە کۆدەنگی بیروباوەڕی سەلەف ئەوەیە، کە بیروباوەڕ چەسپاوە لەسەر ئەوەی کە پەروەردگار لەسەر عەرشی خۆیەتی و، جیایە لە دروستکراوەکانی و، تێکەڵیان نابێت، (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ). واتە: ئەو زاتە بەهیچ شێوەیەك لە دروستکراوەکانی ناچێت، لە هەمان کاتدا خاوەنی سیفەتی بەرزی خۆیەتی کە دەبیستێت و دەبینێت.

وەهەروەها خاوەنی تەواوی ئەو سیفەتە بەرزانەیە کە دوایەتییە پاڵ خۆی، وە بەڵگەی قورئان و فەرموودە و ئاساری سەلەفی لەسەرە.

کەواتە بێگومان پەروەردگارمان تێکەڵی مەخلووقاتی نابێت، وەکوو حولوولییەکان کە بیروباوەڕیان وایە الله تعالى تێکەڵی مەخلووقات دەبێت، بەڵکوو ئەهلی سوننە باوەڕیان وایە کە الله تعالى لەسەر عەرشی خۆی دانیشتووە و، لەسەر عەرشەکەیەتی و، بە هیچ شێوەیەك تێکەڵی مەخلووق نابێت، وە لەنێوان ئەو و مەخلووقەکانیدا وەکو پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه

وسلم- فەرموویەتی: "حیجابێك هەیە لە نوور، ئەگەر ئەو حیجابە لاببات، سوبوحاتی وەجهی پەروەردگار تەواوی مەخلووقات دەسوتێنێ".

بە هیچ شێوەیەك مەخلووقەكان لە دونیادا (ﷲ تعالی)یان نەبینیوە و، ﷲ تعالی نابینن، ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا نەبێت، كە بێگومان ﷲ تعالی لەو ڕۆژەدا بە چاوەكانی سەر دەبینرێت.

## بیست و دووەم:

" وَلَا نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى الْأَئِمَّةِ وَلَا نُقَاتِلُ فِي الْفِتْنَةِ، وَنَسْمَعُ وَنُطِيعُ لِمَنْ وَلَّى اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمْرَنَا ".

---

راڤەکەی:

لە بیروباوەڕی سەلەف ئەوەیە کە شۆڕش و دەرچوون دژی خەلیفەی موسڵمانان ناکرێت، وە کوشتار و شەڕ ناکرێت لەکاتی ئاژەوە و فیتنەکاندا، وە گوێبیست و گوێڕایەڵی ئەو کەسە دەبین کە پەروەردگار ئەیکاتە ئیمام و پێشەوای دین و دونیامان و، کاروبارمانی دەکەوێتە سەر شان.

تەبعەن "وەلی ئەمر" وشەیەکی شەرعییە پێویستە بۆ پێناس و مەرجەکانی بگەڕێینەوە بۆ شەرع، نەوەك تەنها بە زمانی عەرەبی لێکی بدەینەوە، بەوەی هەرکەسێك کاربەدەست بوو، بەرگ و ناو و حوکمی وەلی ئەمری شەرعی پێ بدرێت!!

پوختەی مەرج و پێناسەی وەلی ئەمری شەرعی، کە کۆمەڵێك مەرجی هەیە، لەوانە:

الإسلام: پێویستە ئەو کەسە هەڵگری ئیسلام بێت و، خۆی داڕنیبێت لە تەواوی ڕێباز و دینەکانی تر، وە هەڵگری هیچ جۆرە کوفر و شیرکێك نەبێت، ئینجا بەو کەسە دەوترێت وەلی ئەمر.

العقل: دەبێت کەسێکی ژیر و عاقڵ بێت و، خاوەنی عەقڵێکی گەورەی فراوان بێت.

الذكور: پێویستە ئەو کەسە پیاو بێت و ژن نەبێت، چونکە ژنان ناکرێنە وەلی ئەمر.

العدالة: پێویستە کەسێکی دادپەروەر بێت و، ئەهلی زوڵم و ستەم نەبێت.

العلم: دەبێت خاوەنی زانستی شەرعی بێت و، شارەزایی تەواوی لە سیاسەت و حوکمڕانیدا هەبێت.

الكفاءة: پێویستە کەسێکی شایستە و گونجاو بێت بۆ ئەو مەقامە.

البلوغ: دەبێت تەمەنی بلوغی تێپەڕاند بێت.

الحرية: دەبێت کەسێکی ئازاد بێت و کۆیلە نەبێت، وە کۆیلە و داردەستی هیچ کافرێك نەبێت.

القرشية: دەبێت ڕەچەڵەکی قوڕەیشی بێت کە فەرموودەی پێغەمبەری خوای -صلى الله عليه وسلم- لەسەرە، کە ئیمام ئەحمەد و جگە لەو ڕیوایەتیانکردووە لە پێغەمبەری خواوە -صلى الله عليه وسلم- کە دەفەرمووێ: **"الأئمةُ من قُريشٍ"**. واتە: پۆستی خەلیفە بۆ قوڕەیشە و دەبێت لە قوڕەیش بن.

کاتێک موسڵمانان خاوەنی خەلیفە و گەورەی خۆیان بوون، خاوەنی ئەو مەرجانە بوون، بە تایبەت مەرجی یەکەم کە مەرجی ئیسلام و موسڵمانێتی و خاڵی بوونیانە لە تەواوی کوفر و شیرکەکان!!

بیست و سێیەم:

" وَنَرَى الصَّلَاةَ وَالْحَجَّ وَالْجِهَادَ مَعَ الْأَئِمَّةِ، وَدَفْعَ صَدَقَاتِ الْمَوَاشِي إِلَيْهِمْ ".

---

ڕاڤەکەی:

بیروباوەڕمان وایە نوێژکردن لە پشت ئیمامەکان و حەج و جیهادکردن لەگەڵیان، وە پێدانی زەکاتی مەڕوماڵاتەکان بەوان پێویستە. تا ئەوانیش بەسەر موسڵماناندا دابەشی بکەن.

بەڵام بەداخەوە بمانەوێت و نەمانەوێت موسڵمانان ئێستا بێ وەلی ئەمر و بێ شوانن، سەردەم سەردەمی حوکمی طاغووتەکانە!!!

ئەنەس -ڕەزا و ڕەحمەتی (الله تعالى)ی لێ بێت- دەفەرمووێ: **"إنها ستكون ملوك، ثم الجبابرة، ثم الطواغيت"**[٢٧٤]. واتە: لەدوای خەلافەتی ڕاشیدین پاشاکان حوکم دەکەن، پاشان ستەمکارەکان و دەسەڵاتە زۆرە ملێکان، پاشان تاغووتەکان حوکم دەکەن.

لە ڕیوایەتێکی تردا بە سەنەدێکی سەحیح هاتووە کە فەرموویەتی: **"إنها نبوة ورحمة، ثم خلافة ورحمة، ثم ملك عضوض، ثم جبرية، ثم طواغيت"**[٢٧٥].

---

[٢٧٤]- المراسيل، لابن أبي حاتم، ج١/ص٨٢.

[٢٧٥]- ڕەواه الدارقطني.

واتە: دروست بوونی خەلافەت لەسەردەمی پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- پێغەمبەرایەتی و ڕەحمەت بوو، پاشان دەبێتە جێنشینی و ڕەحمەت، پاشان پاشایەتی خۆسەپێن، پاشان ستەمکارەکان حوکم دەکەن، پاشان تاغووتەکان.

بێگومان فەرموودەکان و ئاسارەکان پێمان دەڵێن: ئەم سەردەمە سەردەمی هەڵگیرانی خەلافەتە، سەردەمی هەڵگیرانی شکۆی ئیسلامە، ئەو سەردەمەی تێیدا دەژین، نەمان و کەمبوونی وەلی ئەمری شەرعییە، واقیع شایەدە کە چەندین ساڵە موسڵمانان بێ شوانن، بەڵام بێگومان وەعد و موژدەی پێغەمبەرە -صلی الله علیه وسلم- کە جارێکی تر ئیسلام باڵادەست دەبێتەوە و، شکۆی خەلافەتی ئیسلامی لەسەر مەنهەجی پێغەمبەرایەتی دەگەڕێتەوە.

بۆیە بەئاگابن بانگخوازە دونیاپەرست و گومڕاکان، بەرگی ئیمام و وەلی ئەمر نەکەن بە بەری شوێنکەوتوانی ڕێبازەکانی لیبڕالییەت و عەلمانییەت و ئیشتیڕاکییەت و دیموکراسییەت، بەڵکوو وەلی ئەمر زاراوەیەکی شەرعییە، دەبێت شەرع بۆمان پێناسە بکات، نەك تەنها بە زمانی عەرەبی بێنەوە لامان و، پێمان بڵێن هەرکەسێك ئەگەر دەسەڵاتی بەدەستەوەبوو، ئیتر ئەو کەسە وەلی ئەمری شەرعییە و، هەرچی فەرموودەکانی سەمع و تاعەت هەیە بخرێتە خزمەتیان.

بۆیە بە حەقیقەت یەکێك لەو دەرگایانەی کە گرووپە گومڕاکان بەهۆیەوە گومڕابوون، زاراوە شەرعییەکانیان بە زمانی عەرەبی لێکداوەتەوە، بۆنموونە

مورجیئەکان کاتێك گومڕابون لە مەسەلەی ئیماندا، هاتن ئیمانیان تەنها بە لوغە لێکدایەوە، کە بریتییە لە ئیقرار و تەسدیق، ئەوان نەگەڕانەوە بۆ شەریعەتی ﷲ تعالی کە بزانن ئیمان چییە و پێناسەکەی چییە، بۆیە ئەگەر ئێمە تەنها بە لوغە بکەوینە ناو زاراوە شەرعییەکانەوە ئەوە بێگومان گومڕادەبین وەکو گومڕابوونی مورجیئەکان و تەواوی ئەو گرووپانەی تر کە گومڕابوونە لە کۆن و لە ئێستادا.

یەکێکی تر لەو گومڕاییانەی کە وجودی هەیە، دەبینین خەڵکانێك دێن زاراوەکان لە لوغە وەردەگرن نەك لە شەرع وەریبگرن، ئەویش مەسەلەی وەلی ئەمرە، لە شەریعەتی ئێمەدا دەبێت ئەو مەرجانەی باسکرا وجودی هەبێت تێیدا، دەبێت جیاوازی بکەین لەنێوان "وەلی ئەمری لوغەوی" لەگەل "وەلی ئەمری شەرعی"، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئەهلی سوننە تاغووتەکان بە وەلی ئەمر نازانن.

بەڵام بابەتی لابردنیان پەیوەستە بە قودرەتی موسڵمانانەوە، ئەگەر قودڕەت نەبوو، سەبر و ئارامگرتن مەنهەجی ئەهلی سەلەفە، تاوەکو ﷲ تعالی دەروویەك دەکاتەوە، دەبینین لە سەردەمی سەلەفدا خەڵکانێك هەبوون بە ئاشکرا کوفریان ئەکرد، بەڵام سەلەف بەشێکیان لەسەر ئەوەبوون کە خروج نەکەن لەسەریان، لەبەر ئەوەی موسڵمانان قودرەتیان نەبوو.

کەواتە مەسەلەی بە وەلی ئەمر نەزانینی تاغووتەکان، مانای ڕەواج دان نییە بە شۆرش، چونکە ئەمە پەیوەستە بە قودڕەت و دەسەڵاتەوە.

ئیمانمان بە تەواوی ئەو فەرموودە و ئاسارانە هەیە دەربارەی واجبێتی گوێڕایەڵی بوونی خەلیفە و کاربەدەستە موسڵمانەکان، ئەگەر خاوەنی ستەم و ناعەدالەتیش بوون، تا کاتێك کە کوفری ئاشکرایان لێ دەردەچێت، پێچەوانەی خەواریجەکان و، هەڵگرانی فیکری ئەوان کە باوەڕیان بە فەرموودەکانی سەمع و تاعەت نییە و، سوکایەتی پێ دەکەن، بەڵکو گاڵتەیان بەو فەرموودە و ئاسارانە دێت کە لە سەلەفەوە هاتوون و، باس لە سەمع و تاعەت دەکەن بۆ ولاتی ئومور، ئەمەش مەنهەجی خەواریجەکانە، بەهەمان شێوەش مەنهەجی موڕجیئەکان و جەهمییەکان کە دێن فەرموودەی سەمع و تاعە دەخەنە خزمەتی تاغووتەکانەوە، لەکاتێکدا ئەم فەرموودانەی کە باسکراوە و، ئەو ئاسارانەی کە هاتووە بێگومان مەبەستی پێ تاغووتەکان نییە، تا بخرێتە خزمەتی ئەوانەوە و سەمع و تاعە بۆ ئەوان ئەنجام بدرێت.

بیروباوەڕمان وایە کە فەرموودەکانی سەمع و تاعەت ناخەینە خزمەت تاغووتەکانی سەردەم، کە پەکخەرانی شەریعەتی (ﷲ تعالی)ن، وە بەرگی وەلی ئەمر ناکەین بە بەڵایاندا، وەکو موڕجیئەکان و جەهمییەکان لەم سەردەمەدا دەیکەن.

بۆیە دەبێت ئەهلی سوننە بناسین کێن، وە بزانین شوێنکەوتوانی سەلەف بە حەق کامانەن، بێگومان ئەهلی سوننە لە نێوان غولووی خەواریجەکان و شلڕەویی موڕجیئەکاندایە.

بیست و چوارەم:

" وَنُؤْمِنُ بِمَا جَاءَتْ بِهِ الْآثَارُ الصَّحِيحَةُ، بِأَنَّهُ يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ مِنَ الْمُوَحِّدِينَ بِالشَّفَاعَةِ ".

---

ڕاڤەکەی:

لە بیروباوەڕی ئەهلی سونن‌ە و جەماعە و کۆدەنگی سەلەفی ئوممەت ئەوەیە، کە باوەڕمان بە تەواوی ئەو ئاسارە ڕاستانە هەیە کە خەڵکانێك لە ڕۆژی قیامەت لە موسڵمانان دەردەهێنرێن لە دۆزەخ بە هۆی شەفاعەتەوە، ئەو خەڵکانەش کە دەردەهێنرێن ئەهلی تەوحید و ئیسلامن.

ئیمان بە شەفاعەت بۆ ئەهلی تاوان لە ئەهلی تەوحید و ئیسلام کۆدەنگی سەلەفە، پێچەوانەی خەواریجەکان و موعتەزیلەکان کە ئیمانیان بە شەفاعەت نییە، پێیان وایە هەر کەس خرایە دۆزەخ، هاتنەدەرەوەی نییە، وە بە پێچەوانەی گۆڕپەرست و ڕافیزەکانەوە کە وێنەی گاورەکان شانیان داوەتە سەر شەفاعەت، هەر چەندە هەڵگری کوفر و شیرکیش بن، پێیان وایە وەلی و ئیمامەکانیان شەفاعەتیان بۆ دەکەن، بۆیە لە دونیاشدا داوای شەفاعەت لە مردووەکانیان ئەکەن.

بێگومان ئەهلی سونن‌ە و جەماعە لەو نێوەندەدان، ئیمانمان بە شەفاعەت هەیە بۆ ئەهلی کەبائیر، بۆ ئەوانەی کە موسڵمان بوون و ئەهلی نوێژ بوون،

بەڵام فریای تەوبە و گەڕانەوە نەکەوتن لە تاوانە گەورەکانیان، بەو هۆیەشەوە موستەحەقی ئەوەن کە بخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، بێگومان ئەوانە شەفاعەت دەیانگرێتەوە، جا یان ئەوەیە بەهۆی ئەم شەفاعەتەوە الله تعالی نایانخاتە ناو دۆزەخەوە کە موستەحەقی دۆزەخن، یان ئەخرێنە ناو دۆزەخ و بەهۆی شەفاعەتەوە دەرئەهێنرێن، مادام ئەهلی ئیمان و ئەهلی نوێژ بوو بێتن.

بیست و پێنجەم:

" وَنَقُولُ: إِنَّا مُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَكَرِهَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ أَنْ يَقُولَ: أَنَا مُؤْمِنٌ حَقًّا عِنْدَ اللَّهِ وَمُسْتَكْمِلُ الْإِيمَانِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُ الْأَوْزَاعِيِّ أَيْضًا.".

---

ڕاڤەکەی:

کاتێك کە ئیمان وابەستە و قەیدکرا بە بابەتێکەوە، ئیمان وعەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە وایە کە ئیستیسنای تێدا بەکار نایەت، بۆنموونە دەوترێت: (بێگومان ئیماندارم بە ﷲ) یان (ئیماندارم بە قیامەت) وە (ئیماندارم بە پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم-).

بەڵام دروست نییە بوترێت: (من ئیماندارم بە حەقیقەت لای ﷲ تعالی یان ئیمانم تەواوە)، وێنەی ئەم قسانە، بێگومان ئیمامی شافیعی و ئەوزاعی و سوفیانی سەوری بە باشیان نەزانیوە.

بابەتی ئیستیسناء لە ئیمانی ڕەهادا کۆدەنگییە، بە ڕەهایی واتە بڵێت من ئیماندارم بەبێ ئەوەی بڵێت (إن شاءالله)، ئەمە موخالەفەی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، چونکە بێگومان ﷲ بە خۆی ئاگادارە بە حەقیقەتی ئیمانی کەسەکان، وە داخستنی دەرگای تەزکییەی نەفسە. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ئیمان

بە موتڵەقی هات و نەبەسترێتەوە بەهیچ شتێکەوە، ئەسڵ وایە ئەهلی سوننە و جەماعە دەڵێن: بڵێن ئیماندارم إن شاءالله.

بەڵام کاتێك ئەم ئیمانە موقەییەد ئەکرێت بابەتێك لە بابەتەکانی بیروباوەڕەوە، لێرەدا ئیستیسناء بەکارنایەت، ناڵێیت (إن شاءالله)، چونکە تۆ بە یەقینی دەبێت ئیمانت بەو بابەت و شتە هەبێت.

## بیست و شەشەم:

## " وَعَلَامَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ الْوَقِيعَةُ فِي أَهْلِ الْأَثَرِ ".

---

راڤەكەی:

نیشانەی بیدعەچییەكان و لاڕێبوان لە مەنهەجی پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- قسەوتن و توانج و لەقەب دروستكردنە بۆ شوێنكەوتوانی ئەسەر.

ئەهلی بەتاڵ كاتێك كە ئەژنۆ شكاو دەبن بەرامبەر بە ڕەددانەوەی حەق، وە ئامادەی وەرگرتنی حەق نابن و، لەسەر بەتاڵەكەی خۆیان بەردەوام دەبن، ناچار ئەبن لە بەرامبەر خەڵك ناو و ناتۆرە و توانج و قسەی ناشیرین بگرنە بەر بەرامبەر بە شوێنكەوتوانی حەق.

بە توانج و ناو وناتۆرەكان دەتوانرێت ئەهلی بەتاڵ بناسرێنرێت، چونكە زۆرجار ئەهلی بەتاڵ لەو دەرگایەوە توانج لە ئەهلی حەق ئەدەن، چونكە خۆیان لەسەر بەتاڵن، بۆنموونە دەفەرمووێت:

## بیست و حەوتەم:

## " وَعَلَامَةُ الْجَهْمِيَّةِ أَنْ يُسَمُّوا أَهْلَ السُّنَّةِ مُشَبِّهَةً وَنَابِتَةً ".

---

ڕاڤەکەی:

نیشانەی جەهمییەکان ئەوەیە کە بە ئەهلی سوننە دەڵێن: تەشبیەکاران یان دەم ڕوت و گەنج و کەم تەمەنەکان.

جەهمییەکان و ئەهلی کەلام و فەلسەفەچییەکان، چونکە خۆیان ئیمانیان بە تەواوی ناو و سیفاتەکانی پەروەردگار نییە و، تەعتیل و لەکارخستن مەنهەجیانە وەك جەهمیەکانی سەرەتا، وە پاشان تەحریف و واتا گۆڕینی سیفەتەکان مەنهەجیان بوو، وەك جەهمییەکانی دواین و سەردەم کە ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکانن، کە هەر سیفاتێك بە عەقڵی ئەوان واتای تەشبیە بدات، یان لە ناوی سیفەتەکەدا مەخلووق موشتەڕەك بێت، ئەوان دەستبەجێ تەحریفی دەکەن، بە بیانووی ئەوەی ئیسپاتکردنی، تەشبیە کردنی خالیقە بەمەخلووق! بێئاگا و خۆ غافڵاندن لەوەی کە ئیشتیڕاکی ناو، دەلیلی تەشبیهی ئەو دوو شتە نییە، وەك چۆن ناکرێت سیفەتی وجودی الله تعالی و، زانین و زانستی الله تعالی و، بینین و، بیستن و، قسەکردن ڕەت بکەینەوە بە بیانووی ئەوەی کە مەخلووقیش خاوەنی ئەو سیفەتانەن، بە هەمان شێوەش بۆمان نییە تەعتیل و ئینکاری و تەحریفی سیفەتەکانی تری پەروەردگار بکەین، وەك: پێکەنین و،

تورەبوون و، دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا و، دەست و، پەنجە و، قاچ و، چاو و، سینگ و، تەواوی سیفەتەکانی تری کە بەڵگەکانی قورئان وسوننەت و ئاساری سەلەفی لەسەرە، کە پەروەردگار ئیسپاتی کردووە بۆخۆی، وە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- ئیسپاتی کردووە بۆ خوا، وە سەلەفی ئەم ئوممەتەش ئیسپاتیان کردووە.

کاتێك کە ئەهلی سوننە ئیمانیان بە هەموو سیفەتەکان هەیە وەك خۆی و، مانای دەکەن وەك خۆی، بەبێ ئەوەی بچینە ناو چۆنییەتەکەی و حەقیقەتەکەی، دەستبەجێ جەهمییەکان بە تەواوی گرووپەکانیانەوە، دەست بە تۆمەتبارکردنی ئەهلی حەق ئەکەن بە موجەسسیمە و موشەببیهە، بەتایبەت لەم سەردەمەدا دەستبەجێ تۆمەتی "وەهابییەت" ئەدەنە پاڵ ئەو کەسانەی کە ئیمانیان بە ناو و سیفەتەکانی الله تعالی هەیە.

## بیست و هەشتەم:

## " وَعَلَامَةُ الْقَدَرِيَّةِ أَنْ يُسَمُّوا أَهْلَ السُّنَّةِ مُجَبِّرَةً ".

---

ڕاڤەکەی:

نیشانەی قەدەرییەکان ئەوەیە کە بە ئەهلی سوننە دەڵێن: ئەهلی جەبر (زۆرە ملێیی).

چونکە ئەهلی سوننە ئیمانمان وایە کە تەواوی کردەوەکانمان بە چاك و خراپەوە ﷲ تعالی خۆی خاوەنییەتی، بەڵام بەندەکان بکەر و ئەنجامدەریانین، پێچەوانەی قەدەرییەکان کە پێیان وایە بەندەکان خۆیان دروستکەری کردەوەکانی خۆیانن، ﷲ تعالی خالیقی کردەوەکان نییە.

غولات و ڕۆچووەکانی قەدەر پێیان وایە کە ﷲ تعالی زانستی پێشوەختەی بە کردەوەی بەندەکان نییە کە دەیکەن! ئەڵێن کە بەندەکان کردەوەکان دەکەن، ئینجا دەزانێت چی ئەنجام ئەدرێت، وە پێیان وایە کە نەنووسراوە!

لەکاتێکدا جەبرییەکان ئەوانەن ئینکاری مەشیئەت و ویست و ئیختیاری بەندەکان دەکەن بۆ کاروکردەوەکانیان، پێیان وایە بەندەکان هیچیان بە دەست نییە و، ئەوەشی کە دەیکەن ﷲ تعالی پێیان دەکات، کە بێگومان ئەمەش عەقیدەی ئەهلی سوننە نییە.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەهلی سوننە ئیسپاتی ئەوە دەکەن کە تەواوی کاروکردەوەکان بە خۆشمانەوە ﷲ خالقێتی، بۆیە قەدەرییەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن (موجبیرە)، بەپێچەوانەوەش جەبرییەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن قەدەرییە، لەبەر ئەوەی ئیمانمان بە ویست و ئیختیاری بەندەکان هەیە، وە ﷲ تعالی بە زۆر هیچ کاروکردەوەیەکمان پێ ئەنجام نادات، چونکە ئێمە ئیختیارمان هەیە لە هەڵبژاردنی کوفر و ئیمان، وە چاکە و خراپە، بەڵام تەواوی کاروکردەوەکانمان ﷲ تعالی خۆی خالقێتی، ئێمە تەنها بکەرین، وە ﷲ تعالی عیلمی بە تەواوی کاروکردەوەکانمان هەیە و، نووسیویەتی.

## بیست و نۆیەم:

## " وَعَلَامَةُ الزَّنَادِقَةِ أَنْ يُسَمُّوا أَهْلَ الْأَثَرِ حَشْوِيَّةً. وَيُرِيدُونَ إِبْطَالَ الْآثَارِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ".

---

راڤەکەی:

نیشانەی مونافیقەکان و زیندیقەکان ئەوەیە کە بە ئەهلی سوننە دەڵێن: گێل و گەوج، دەیانەوێ ئاسار و بەجێماوی پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- ڕەت بکەنەوە، لەکاتێکدا کە ئەهلی سوننە بە ئەسەر دینداریتی دەکەن، نەك بە عەقڵکاری و شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووی خۆیان.

بێگومان ئەوە نیشانەی مونافیقەکانە، کاتێك کە دەبینن ئەهلی سوننە بە دەلیل و شوێنکەوتنی ئەسەر دینداریتی دەکەن و، ئاساری سەلەف لایان گەورەیە و پێگەی هەیە، بۆیە ئەهلی نیفاق بە ئەهلی سوننە دەڵێن گێل و گەوج و نەفام و نەزان!

نیشانەی خەواریجەکانیش ئەوەیە کە دەبینین بە تاوانی گەورەی غەیری کوفر و شیرك موسڵمانان بە کافر دەزانن و، ئیمانیان بە شەفاعەت نییە، دەبینین خەواریجەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن مورجیئە، چونکە باوەڕیان وایە کە

دەرگاری چونەدەر لە ئیسلام، کوفر و شیرك و نوێژ نەکردنە، نەك تاوانی گەورە، وە باوەڕمان بە شەفاعەت هەیە بۆ تاوانبارانی ناو دۆزەخ.

نیشانەی جەهمی و مورجیئەکانیش ئەوەیە کە بە ئەهلی سونە دەڵێن: خەواریج و تەکفیری، چونکە ئەهلی سونە وەك ئەوان تەعتیلی تەکفیریان نەکردووە و، تەکفیر قێزەون نییە لایان، بەڵکو پێمان وایە هەرکەسێك هەڵگری کوفر و شیرکی ئاشکرا بێت، بێگومان کەسێکی کافرە، وەك موعتەزیلەکان و جەرجیسییەکان عوزر بە جەهل ناهێنرێتەوە بۆ هەڵگرانی کوفر و شیرکی ئاشکرا.

لەم سەردەمەدا ئەهلی سوننە و هەڵگرانی حەق بێگومان دەبێت زۆر زۆر وریا بن لە مەسەلەی ناووناتۆرەکان، بێگومان لە ناووناتۆرەکاندا بەرامبەرەکانمان دەناسینەوە لە ئەهلی بەتاڵ، کە بزانین کێن ئەوانەی ئەهلی بەتاڵن و، کێن ئەهلی سوننە، بۆیە دەبێت هەموو کات لەوە تێگەیشتبێتین کە ڕێگەی حەق بریتییە لە: شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا و -صلی الله علیه وسلم- هاوەڵانی و ئاساری سەلەف.

لەکۆتاییدا ئیمام دەفەرمووێت:

" وَفَّقَنَا اللَّهُ وَكُلَّ مُؤْمِنٍ لِمَا يُحِبُّ وَيَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ، وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَسَلَّمَ ".

---

ڕاڤەکەی:

پەروەردگار یارمەتی دەری ئێمە و هەموو ئیماندارێك بێت، بۆ هەموو ئەوەی کە پەروەردگار پێی خۆشە و پێی ڕازییە، وە سەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم-.

# پێرستی بابەتەکان